تورد ڤالسترۆم

# کێوەکان تاقە دۆستی ئێمەن

وەرگێڕانی لە سوێدییەوە:
حاتەمی مەنبەری

تورد ڤالسترۆم

# کێوەکان تاقە دۆستی ئێمەن

وەرگێڕانی لە سوێدییەوە:

حاتەمی مەنبەری



دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس

هەولێر - هەرێمی کوردستانی عێراق

دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس
شەقامی گوڵان - هەولێر
هەرێمی کوردستانی عێراق
هەگبەی ئەلیکترۆنی aras@araspress.com
وارگەی ئینتەرنێت www.araspublishers.com
دەزگای ئاراس لە ٢٨ تشرین (٢) ١٩٩٨ هاتووەتە دامەزران

تورد ڤالسترۆم
کێومکان تاقە دۆستی ئێمەن
وەرگێڕانی لە سویدییەوە: حاتەمی مەنبەری
کتێبی ئاراس ژمارە: ١٣٨٥
چاپی یەکەم ٢٠١٣
تیراژ: ٦٠٠ دانە
چاپخانەی ئاراس - هەولێر
ژمارەی سپاردن لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ١٠٦ - ٢٠١٣
نەخشاندنی ناوەوە و رازاندنەوەی بەرگ: ئاراس ئەکرەم
هەڵەگری و رێنووسی یەکگرتوو: بەدران ئەحمەد حەبیب

ژینک:
ژمارەی پێوانەیی ناودەوڵەتیی کتێب
ISBN: 978-91-979170-3-2

## ناوەڕۆک

## چەند سەرنجێک لەسەر ئەم کتێبە و وەرگێڕانی

نووسەری ئەم کتێبە "تورد والسترۆم" یەکێک لە ناسراوترین ڕۆژنامەوانانی سوێدە، کە بەشێکی زۆری تەمەنی، لە دەیەی حەفتا و هەشتادا بۆ ناسینی خەباتی گەلانی ژێردەست تەرخان کردووە. کتێبی "کێوەکان" تەنیا یەکێک لە بیست کتێبی تا ئێستە نووسراوی ناوبراوە، کە بە شێوەیەکی بابەتییانە و وەک مرۆڤێکی خاوەن ویژدان بە ناخی ئازارەکانی کورددا روو چووە و دەرد و ئێشەکانی خستووەتە پێش چاوی خەڵکی وڵاتەکەی.

مرۆڤ بە خوێندنەوەی ئەم کتێبە بۆی دەردەکەوێ، کە نەتەوەیەک بە گەورە و بچووکیەوە کەوتووەتە بەر هێرشی دڕندەیەکی بێ بەزەیی و بە پێش چاوی هەموو دەوڵەتانی دنیاوە خەریکە قەڵاچۆ دەکرێ. بەڵام ئەم نەتەوە لەوپەڕی ستەم و زوڵم لێکراویشدا لایەنە جوان و مرۆڤانەکانی خۆی ون ناکات و لە بێدەرەتانییەکی بێ سنووریشدا سەدان کەسی زانا و هەڵکەوتە، بە توانست و هۆشی سەردەمییانەوە پێشانی دنیا دەدا، کە ئەگەر دەرفەت و هەلێک بدرێ بۆ ئاوەدانکردنەوە و پێشخستنی وڵاتی خۆیان هیچیان لە گەلانی تر کەمتر نییە. ئەوەی بە وردی ئەم کتێبە بخوێنێتەوە و ناوی ئەو گشت دوکتۆر، ئەندازیار، ئەفسەر و قوتابییە کوردەی، کە والسترۆم لەم سەردانە یەک مانگەدا لەناو شۆڕشی کوردستاندا بینیونی و قسەی لەگەڵدا کردوون دەزانێ کە ئێمە تەنانەت لە پێناسەکردنی ناوەڕۆکی راستەقینەی شۆڕشەکانیشماندا نەک تەنیا دوژمنانمان بگرە بۆ خۆشمان زوڵممان لە خۆمان کردووە!

من لە پێوەندی لەگەڵ وەرگێڕانی ئەم کتێبەدا ئەم چەند سەرنجەی

خوارەوە بە پێویست دەزانم:

١ - زیاتر لە سێ دەیە و نیـو بەســەر بڵاوبوونەوەی کـتـێـبی بەنرخ و پڕ ناوەڕۆکی نووسەری سوێدی "تورد والسترۆم"دا تێ دەپەڕێ. ڕەنگە کەمترین کورد هەبێ ناوی سـەردێری ئەم کتێبە (کێوەکان تاقە دۆستی ئێمەن)ی نەبیستبێ. بەڵام جێگەی داخە کە ئەم کتێبە (تا ئەو جێگەیە من بزانم) تا ئێستەش بۆ سەر زمانی کوردی وەرنەگێڕدراوە. گەلانی تر نەک هەر ئەو کتێبانەی ڕاستەوخۆ پێوەندیی بە خۆیانەوە هەیە، بگرە هەر کتێبێک باسی وڵاتانی دەوروبەریشیان بکات گورج و بێ دواکەوتن وەردەگێڕنە سەر زمانی خۆیان و بڵاوی دەکەنەوە تا خەڵکیان ئاگەداری ناوەڕۆکیان بن. بەڵام مخابن ئێمە لەم بارەشەوە گەلێک لە پاشین و سەرەڕای بوونی دەرفەت و توانیش هێشتا گرینگی و بایەخی ئەم کارانە نازانین. ئێستەش کە من ئەم کارەم کردووە دەتوانم بەوە دڵم خۆش بێت، کە دەڵێن "زەرەر لە نیوەشدا بەری بگیرێ هەر قازانجە".

٢ - لە کاتی نووسینی ئەم کتێبەوە تا ئێستە گەلێک گۆڕانی قووڵ و بەرچاو بەسەر دۆخی کوردستان و ناوچەکەدا هاتوون، بەڵام کێشە سەرەکییەکە، واتا کاروانی خەباتی ئێمە بۆ ڕزگاری هەر وا لە ڕێگەیە و هێشتا نەگەیشتووەتە هەوارگەی سەرکەوتن. بۆیە ئێستەش بەشێک لە داستان و گێڕانەوەی ناو ئەم کتێبە تازەن و ئێستەش وەک ئەو ڕۆژە سەختانە شاخ و دۆڵەکانی کوردستان دەبنە ئامانجی هێرشی دوژمنانی کورد و ڕاست وەک ئەو سەردەمە دنیا بێدەنگ و دەوڵەتانی سەردەست بۆ بەرژەوەندیی ئابووری، لە بری لایەنی هەق و مافەکانی مرۆڤ پشتی داگیرکەرانی دڵڕەشی کوردکوژ دەگرن.

٣ - کاتی خۆی ئەم کتێبە وەک ڕیپۆرتاج ئامادە کراوە بۆیە لە هەندێک بارانەوە وشک و گێڕانەوەی ساکاری ڕووداوە تاڵەکانە. بۆ من گەلێک دژوار

بوو لە وەرگێڕانیدا هەندێک تام و چێژی پێ بدەم و لەو وشکی و ساکارییە دەری بێنم، چونکە ئەمانەتداری لە پاراستنی ناوەڕۆکدا لای من گرینگتر بوو.

هەر بۆیە لەو شوێنەی نووسەر قسەی خەڵک و بە تایبەتی قسەی بەرپرسانی کورد، یان وتەی دیپلۆماتی وڵاتان دەگێڕێتەوە من راست "وشە بە وشەم" وەرگێڕاوە و لەو شوێنەش کە باسی شوێن و جێگەکان، یان بەرەی شەڕ دەکات تێکڕای رستەکە یان پەرەگرافەکەم وەرگێڕاوە و لێرەش ئەوپەڕی هەوڵم داوە لە مەبەستی ئەو نەچمە دەرەوە.

٤ – ئێستە بە دەیان هەزار کورد لە سوێد دەژین هەزارانیان زمانی سوێدی لە ئاستی ئەکادیمیکدا دەزانن و دەبوو کەسانی لەو جۆرە بە جێگەی من ئەرک و کاری وەرگێڕانی ئەم کتێبە (ئەویش زۆر پێش ئێستە) بگرنە ئەستۆ، من وێڕای رەخنە و گلەییم لەو خۆشەویستانە، بەوپەڕی خۆشحاڵی و دڵفرەوانییەوە گوێ لە رەخنە و گازندەی هەر کامەیان لە چۆنیەتیی وەرگێڕانی ئەم کتێبە دەگرم و سوپاسیان دەکەم، کە لە روانگەی خۆیان ئاگەدارم کەنەوە.

٢١ی سێپتەمبەری ٢٠١١

حاتەم مەنبەری

## پێشەکی

کاتێک کە من دەست بە نووسینی ئەم بابەتە دەکەم ئێوارەی شەمە، کۆتاییەکانی مانگی ئۆکتۆبەری ساڵی هەزار و نۆسەد و حەفتا و چوارە. خەریکە تاریک دادێ و من دەتوانم لە پەنجەرەی ماڵەکەمەوە ببینم کە ئاسمان لە پشت هەورێکی رەش و چڵکندا سوور هەڵگەڕاوە. هاوسەر و کچەکەم تازە لە پیاسەیەک لەگەڵ سەگەکەماندا گەڕاونەتەوە و باس دەکەن دەریا، کە من لە پەنجەرەکەوە ناتوانم بیبینم لەژێر ئەو ئاسمانە سوورەوە بە تەواوی شین دەنوێنێ، ئەوان دەڵێن تا ئێستە خۆرئاوابوونی وا جوان و سیحراوییان لە هیچ شوێنێکدا نەدیوە.

دوو رۆژە من لە کوردستان گەڕاومەتەوە. کاتێک کە من لەوێ بووم بڕیارم دا ئەو کتێبەی گەرەکمە بینووسم دەبێت لە پشت ئەم مێزەوە دەست پێ بکات و هەر لێرەش تەواو بێت. من بە خۆمم وت، ئەم کتێبە بۆ ئەو کەسانە نانووسم، کە ئاگاداری دۆخەکەن یان پێیان وایە ئاگادارن و تێگەیشتنیان لەم بارەوە وەدەست خستووە. من نەمگەرەکە تێکەڵی باس و خواسی ئەوان بم. تێکەڵبوونی ئەم باسانە هیچ قازانجێکی نییە.

من تەنیا دەمەوێ هەوڵ بدەم ئەم چیرۆکە بگێڕمەوە. راست چۆن بوو وەک خۆی و من گەرەکمە لە خاڵی دەستپێک، لە پشتی مێزی نووسینەکەمەوە دەست پێ بکەم. دەمەوێ ئەو پێنج دەفتەری ریپۆرتاجە بنێمە بەردەمم و دوایە لە دەستپێکەوە دەست پێ بکەمەوە. رۆژ لە دوای رۆژ، سەعات دوای سەعات، راست وەک خۆی.

## تۆ ناتوانی لە شتێک بگەی ئەگەر
## بە چاوی خۆت نەیبینی

یەکی ئابی ١٩٧٤ دەستەیەکی عێراقی سەردانی ستۆکهۆلمیان کرد و پرێس کۆنفرانسێکیان ساز کرد، کە لە گەورەترین رۆژنامەکاندا جێگە و بایەخی پێ درا. عێراقییەکان بانگەشەیان دەکرد، کە شتێک بە ناوی شەڕ لە نێوان عێراق و کورددا بوونی نییە. ئەوەی روو دەدا هێندێک تێکەڵچوونی خراپن لە نێوان دەوڵەت و تاقمێکی بچووکی کورددا. دەستەکە خۆی وەک نوێنەری "بەرەی نیشتمانیی پێشکەوتنخوازی عێراق" پێناسە دەکرد و یەکێک لە ئەندامەکانیشی "عوبەیدیلا بارزانی" کوڕی گەورەی رێبەری کوردان مستەفا بارزانییە، کە چەند ساڵ پێش ئێستە، پێوەندیی خۆی لەگەڵ باوکیدا پچڕاند و ئێستە وەزیرە لە دەوڵەتی عێراقدا.

بە وتەی عوبەیدیلا باوکی ئەو پشتی لە خەڵکی خۆی کردووە و ئێستە خزمەتی ئیمپریالیزم، سەهیۆنیزم و کۆنەپەرستان دەکات. بە وتەی ئەندامانی ئەم شاندە، بارزانی تەمەنی ٧٤ ساڵە و هێزەکانی بە تەواوی لە خەڵکی خۆیان دابڕاون و تەنیا مەسەلەکە لەسەر کات راوەستاوە تا بەرخۆدانەکەیان بە تەواوی کۆتایی پێ بێ.

هاوکات هەواڵێکی تر لە تارانەوە دەگات، کە دیسان بە هۆی پێشوەچوونی هێزەکانی سوپای عێراق لەسەر سنوور و داگیرکردنی بڕیارگەی ناوەندی بارزانی، نزیک بە هەشتا هەزار کەس لە خەڵکی سڤیل کورد ئاوارە بوون و چوونەتە ناو خاکی ئێران. ئەم هەواڵانە دەری دەخەن، کە شەڕێک لە ئارادایە و ئەم نوێنەرانەی عێراق بە قەستی حاشای لێ

دەکـەن. بەڵام دەتوانێ ئەوە ڕاست بێت کـە ئەم شـەڕە روو لە کـۆتایی و تەواوبوونە.

من وتاری ڕۆژنامـەوانێکی سـوێدی کە کـارناسـی ڕۆژهەڵاتی ناوینیشـە دەخوێنمەوە، کە بە وردی کێشەی کورد شی دەکاتەوە، ناوبراو دەنووسێ:

بۆ جاری شەشەم لە ساڵی ١٩٦١ەوە هێزە پۆشتە و پەرداخەکانی عێراق بە گژ شـەڕوانانی شـاخنشـینی کـورددا دەچن، ئەوانەی بە پێشـمـەرگە بەناوبانگن و لە لایەن سـەرەک هۆزی بە تەمـەن و ناوداری کـورد مـسـتەفـا بارزانییەوە ڕێبەری دەکرێن. دەوڵەتی بەعسی عـێراق (ڕێبەرییەکی زیاتر پێشکەوتوو، کە عـێراق لە مـاوەی مـێژووی خوێناویی خـۆیدا هـەیبـووە) پێشنیـازی جـۆرێک ئۆتۆنۆمـیی ڕۆشنبـیری، سـیاسـی - شـتێک کـە کورد هـەردەم وەک هـۆی سـەرهـەڵدانەکـانیـان باسـیـان کـردووە - بە بـارزانی و حـزبەکـەی دا، بەڵام بارزانی ڕازی نەبوو. ئەو زیاتر لەوەی کـە شـیـاو بوو داوای دەکرد. بۆیە سەرلەنوێ شـەڕەکە دەسـتی پێ کردەوە. لە ڕاسـتیدا ئەم شەڕە لە بنەڕەتدا لەسەر نەوتە، پاشان لەسەر دەسەڵات لە عێراق و ترازووی هێز لە گشت ناوچەی کەنداوی عەرەبی (یان فارسی)دا.

دواتر من چاوم بە کۆنە دیپلۆماتێکی خانەنشینکراوی سوێدی کەوت، کە لە زۆربەی پایەتەخـتـەکـانی ڕۆژهـەڵاتی ناویندا خـزمـەتی کـردووە و خـاوەن ئەزمـوونێکی فـرەوانە. چەند پرسـیـارێکم لەبارەی کوردەوە ئاراسـتـەی ئەم دیپلۆماتە کۆنە کرد و ئەویش لەم بارەوە دەڵێ:

شتێکی تایبـەتی لەم بارەوە نازانێ - بۆ ئەو ئەوان (کورد - و.) خـەڵکێکی شاخنشـینی سەیر و ئەفسووناوین، کە لە جێگە دووردەسـتە سنوورییەکان، لە نێوان ئێران، عێراق، سـووریا، تورکیا و سـۆڤیـەتدا دەژین. ژمـارەیان ١٢ ملیۆنە بەڵام لە نێوان پێنج دەوڵەتدا بڵاو بوونەتەوە. بە قسـەی ئەم دیپلۆماتە سـوێدییـە بەشی زۆری کـورد ڕەوەند و کۆچەرن و شـێـوەی ژیـانیـان لە هـی خەڵکی سەردەمی سەدەکانی ناوەڕاست دەچێ.

ناوبراو دەڵێ، کە ئەو دەتوانێ لە داوا و خواستی کورد بۆ ئۆتۆنۆمی و سەربەخۆیی بگات، بەڵام ئەمە کێشەیەکە بە هیچ شێوەیەک چارەسەر نابێت. ئێستە تەنیا کوردی عێراقن کە شەڕ بۆ مافەکانیان دەکەن بەڵام چۆن دەبێت ئەگەر ئەوان بگەنە ئۆتۆنۆمی؟ تورکیا، ئێران، سووریا یان سۆڤیەت قەت ساز نین سەربەخۆیی بدەنە کەمایەتیی کوردی خۆیان. لە راستیدا هیوایەک بۆ خەباتی کورد بە وتەی ئەم دیپلۆماتە کۆنە بەدی ناکرێ.

ئەو پێی وایە، کە مرۆڤ بە هاسانی دەتوانێ سۆز بۆ کورد نیشان بدات و بڵێ ئەوانیش وەک هەموو کەمایەتییەکی تری دنیا مافی خۆیانە سەربەخۆ بن و دەوڵەتی خۆیان هەبێ. بەڵام ئەگەر مرۆڤ ریالیست بێت بۆی دەردەکەوێ کە داخوازییەکانیان دوور لە عەقڵ و مەنتیقن.

من لەو دیپلۆماتە بە ئەزموونە دەپرسم ئاخۆ دەکرێ مرۆڤی کورد لەگەڵ خەڵکانی تری هاوشێوەی ئەوان لە شوێنێکی تری گۆی زەویدا بەراورد بکات؟

– بەڵێ. لاپەکان (لاپ یان سامەکان خەڵکێکن لە باکوری سکاندیناڤیا دەژین و لە نێوان وڵاتانی سوێد، نەرویج، فینلاند و رووسیادا دابەش کراون و ژیانیان ئێستەش وەک سەدان ساڵی پێشتر، بێ شار و ماڵی سەردەمییانە، دوور لە خوێندنگە، جادە، دەرمان و دوکتۆر، بە (بەخێوکردنی جۆرێک ئاژەڵی نزیک لە گا لەناو بەفردا دەچێتە سەر – وەرگێڕ)، پیاو دەتوانێ ئەوان لەگەڵ لاپەکاندا بەراورد بکات. ئەوانیش کۆچەر و خەڵکی شاخین و لە نێوان چەند وڵاتیشدا دابەش بوون.

هەرچەند پلان و بەرنامەی ئەم سەفەرەم داڕشتووە، لە دوا ساتەکاندا حازرم هەڵی وەشێنمەوە – مەبەست لەم سەفەرە ئەوە بوو من باسی کوردستانێک بکەم کە لە ئاشتیدا دەژی. ئێستە بە تەواوی شەڕە لەوێ. لە راستیدا من تاقەتی خۆخستنە ناو سەرئێشە و کارەساتم نییە، من کە

دۆخێکی وا باشم لێرە هەیە لە پێناو چیدا خۆم تووشی کێشە بکەم؟ ئاخر من دەبوو سنووری توانستی خۆشم بناسم - خۆ قەت لەم بارودۆخە ئاڵۆزەدا من ناتوانم راستیم بۆ دەرکەوێ.

من دەبوو ئەم کارە بۆ کارناسانی سیاسەتی دەرەوە و هەواڵنێران بەجێ بێڵم، کە دەتوانن دنیا دوور لە هەست و سۆز و ریالیستانە ببینن. راستی، من بۆ خۆم خەریکی کێشەی کورد بکەم؟ بەلام بەو حاڵەش:

ئاخۆ کورد گەرەکیانە من برۆم. دۆستە کوردەکەم وتوویە:

تۆ ناتوانی لە شتێک بگەیت تا بە چاوی خۆت نەیبینی. ئاخر ئەوان بەشێک لەو شتانەیان خوێندووەتەوە، کە من پێشتر نووسیومن و دەیانەوێ من بۆ سوێدییان باس بکەم کە لە کوردستاندا چی روو دەدات. ترسنۆکانەیە لانی کەم هەوڵێک نەدەم. ئەمە وەک جۆرێک ناپاکی لەوانە.

من رۆیشتم بۆ مێترۆپۆلی ولاتێکی ئەورووپایی بۆ ئەوە دۆستێکی کوردم ببینم - ئەمە هەنگاوی یەکەمە. من لەو شارە مەزنەدا ئوقرەم لێ برا و ترس دای گرتم، بەلام پێویست بوو من دۆستە کوردەکەم ببینم چونکە ئەو کلیلی رێگەی کوردستانە بۆ من.

دۆستەکەم بە باشی سوێدی قسە دەکات و سوێد وەک ولاتی دووەمی خۆی دەبینێ چونکە لەگەڵ ژنێکی سوێدیدا هاوژینە. ئەو لە کوردستانی عێراقدا لە دایک بووە، بەلام بۆ خوێندن چووەتە تورکیا، لەوێ بە هۆی چالاکیی سیاسییەوە خراوەتە بەندیخانە و دوای دوو ساڵ توانیویە هەڵبێ و خۆی بگەیەنێتە سوێد. لە سوێد مافی پەنابەریی وەرگرتووە و هەشت ساڵ لەوێ ماوەتەوە.

ئەو دەڵێ کاتێک هاتم بۆ سوێد وەک ئەوە وا بوو بگەرێمەوە بۆ کوردستان، بە بروای من کورد و سوێدی زۆر لێک دەچن:

- لە چی بارێکەوە لێک دەچن؟

– دژواره بڵێم چۆن. تەنیا دەزانم کاتێک هاتمە سوێد وەک ئەوە وا بوو بگەڕێمەوە ماڵ لای خۆمان، من پێم وایە سوێدی و کورد وەک یەک بیر دەکەنەوە.

من پێی دەڵێم کە دەستەیەکی عێراقی لە سوێد بوون، کوڕی گەورەی مستەفا بارزانیشیان لەگەڵدا بوو.

– دەزانم. بەڵام ئەو کوڕەی بارزانی ئێستە بە تەواوی بێ نرخە. لە کوردستان ئەو هیچ حیسابێکی بۆ ناکرێ. تەنانەت خەڵکی ناویشی ناهێنن. دەزانی:

لای ئێمە راگرتنی یەکەتیی بنەماڵە زۆر گرینگترە تا لای ئێوە. ئەمە شتێکی زۆر خراپە کوڕێک بەو شێوەیە پشت لە بنەماڵەی خۆی بکات. من دەتوانم باسی ئەو کوڕەی بارزانی بۆ تۆ بکەم. ئەو تاقە کەسێکە لەناو دە کوڕی تری بارزانیدا گرفتی بۆ باوکی ساز کردبێ. دەوڵەتی عێراق بۆ ئەوە ئەو لە دەست هاووڵاتییانی بپارێزێ پۆستێکی لەو دەستەیەی هاتبوونە جەزایەر بۆ دیاری کرد. لەو کاتەوە لەوێیە و ئێستەش هەڵی دەگرن و دەیهێنن پڕوپاگەندەی پێوە بکەن. بارزانی زۆر لەو کوڕەی دڵبریندارە. تۆ نابێت ناوی ئەو بێنی کاتێک چوویەوە کوردستان.

دۆستەکەم چەند نامەی ڕێنوێنی، ناونیشانێک و ژمارە تەلەفۆنێکی لە تاران بە من دا. ڕێگەی کوردستانی ئازاد لە ئێرانەوە تێپەڕ دەبێت. من شەوم بە سواری میترۆی شار بۆ "پیکادیلی سیرکووس" و لەناو ئاپۆڕەی خەڵک و ئۆتۆمۆبێلاندا بە شەکەتی بردە سەر. بەیانییەکەی لە ڕێگەی هێڵی ئاسمانی "ئێران ئێر"ەوە بەرەو تاران فڕیم. لە نیشتنەوەیەکی نیوەی ڕێگەدا فڕۆکەکە پڕ بوو. لە سەندەڵیی تەنیشتمەوە پزیشکێکی فارس دانیشتبوو، کە دەیتوانی ئەڵمانی بئاخێوێ. ئەو شەش ساڵە لەبەر خزمەتی سەربازی نەیوێراوە بگەڕێتەوە ئێران بۆ سەردانی باوک و دایکی. ژنێکی ئەڵمانی و

دوو منداڵی هاوبەشیان هەیە، کە وێنەکانیان پێشانی من دەدات و زۆر خۆشحاڵ دێتە بەرچاو. من لەبارەی کوردەوە لەم پزیشکە ئێرانییە پرسیار دەکەم:

– من خۆشم گەرەکن. ئەوان بۆ مافێکی ڕەوا خەبات دەکەن.

سەیری قووڵایی ئاسمانی شین دەکەم، کێوێک لە هەور لە سەریەک کەڵەکە بووە و تۆزێک پاشتر ئاسمان ڕووناکتر دیارە. ئێمە ڕوو بە خۆر دەفڕین، کات بە توندی تێ دەپەڕێ و ئەو دەمەی لە تاران دەنیشینەوە بووەتە شەوێکی درەنگ.

من لەبەر ئەوە یەکەم جارە دێمە ئەم بەشەی دنیا و ناویشم لەناو لیستی ڕەشی دەوڵەتی ئێراندا نییە، بێ گرفت و چەڵەمە لە کۆنترۆڵی پاسپۆرت تێپەڕ بووم. چوومە ناو شار و بە دوای پەیداکردنی هۆتێلێکدا گەڕام، بەڵام هۆتێلەکان هەموو پڕن و بە ئاسانی جێگە دەست ناکەوێ. سەرەنجام لە سەربانی هۆتێلێکەوە تەختێکی خاڵیم دەست کەوت و ڕاست لە ژێر ئاسماندا خەوتم. مانگی چواردەیە و گرم و هۆڕی ترافیکی دەوروبەر دێتە گوێم. بەیانی بە هاڕەی فڕۆکەیەک، کە ڕاست بەسەر سەرمانەوە تێ پەڕی وەخەبەر هاتم.

من ئاگەدارم کە ماوەیەکی زۆر ناتوانم لەناو ئەم گرم و هۆڕی خەڵکەدا بمێنمەوە و دەزانم درێژترین بەشی ڕێگەم بۆ کوردستان لەبەر ماوە. بۆیە باشترە تا دوودڵی و بیر و تاسەی ماڵ بڕستیان لێ نەبڕیوم دەبێت لەم هۆتێلی سیحربازانەدا بچمە دەرەوە. لەناو قووڵایی مێژووی وڵاتانی ئەوروپایدا کەسانی تێکشکاوی سەرلێشێواوم بینیوە، لەو کەسانەی لە شاری گەورەدا دەچنە ژێر زەوی و لە تاریکیدا بە دوای پەناگەیەکدا دەگەڕێن تا شەوی تێدا ببەنە سەر. لە تاران من گەلێک لە هەڤاڵانی ئەوانم بینین.

شـاری گـەورە وەک مـەیدانی شـەڕ وایە. مـەیدانـی شـەڕێکی چەپەڵ، کـە بڕانەوەی بۆ نییە. تەلەفۆنم کرد بۆ ئەو ژمارەیەی دۆستەکەم پێی دابووم و لە هاتنی خۆم ئاگەدارم کردن. ئەوان داوایان کرد من لە هۆتێلەکەدا بمێنمەوە، دەیانزانـی من لە کـام هۆتێلدام - نـە هیلتـۆن یان شـێـراتۆن - ئەوان داوای ژمارەی دیوەکەمیان دەکرد.

- دیوم نییـە تا ژمارەی هـەبێ، من لەسـەر بان خەوتووم. دوای دوو سـەعات ئەوان گەیشتنە لای من.

- ئێمە لە کوردستانەوە هـاتووین.

یەکێکیـان پزیشکە و دەڵێ دوانیوەڕۆ گەرەکیە بگەڕێتەوە بۆ کوردستـان. کۆمـەڵێک کەلوپەلی نەشـتەرکـاری و هێندێک داو و دەرمـانـی لە ئێران کڕیوە لەگەڵ خـۆیدا دەیانبـاتـەوە. بە قسـەی مێـواندارە کوردەکـانم من ئەگـەر خـۆم بمەوێ دەتوانم لەگەڵ ئەودا بڕۆم. لە خۆشـیی ئەم هـەلەدا و ئەوەی کە دەتوانم وا هـاسـان و زوو تاران بەجێ بهێلم شـاگەشکە بـووم. بەڵام بە چەند هۆ کـە من بەباشـی تێیان نەگەیشتم سەفەرەکە هێندێک دوا کەوت.

من گـواسـتـمـەوە بـۆ ئەو هۆتێلەی دوکـتـۆری لێ بوو و هـەمـوو پاشنیوەڕۆم لەوێ بـردە سـەر. هۆتـێلێکی گـەورەتـر و وا دەهـاتە بـەرچاو، کـە جـێـگەی کۆبوونەوەی کوردی عێراق بێت. رەنگە لەبەر ئەوەش بێت، کە دوکتۆر لێرەیە و هەموو کۆ بوونەتەوە تا مـاڵاواییی لێ بکەن.

دوکـتـۆر نـاوی "رەمـزی تـاکـیـیـە" و یـەکـێکە لەوانەی کـە دوای دەست پێکردنەوەی شـەڕ لـە مـانگی مـارسـدا تێکەڵی شـۆڕش بووە. ئەو کـارە پڕ سـوودەکـەی خـۆی لە شـاری نـاسرییـەی باکوری بەسرە بەجـێ هێشـتـووە و رێگەی باکوری (عێراقی) گرتووەتە بەر بۆ ئەوەی خـۆی بگەیەنێتە چەکدارە شۆڕشگێڕەکان، دوکتۆر رەمزی لەم بارەیەوە دەڵێ:

- باوکم و خوشـک و براکانم لە بەغدان، مـن نازانم چییان بەسـەر هاتووە.

من ماشێنه مێرسیدیسەکە و گشت داراییەکەم لەوێ بەجێ هێشت، دیاره من خووم به ژیانێکی خۆش و دەوڵەمەندانه کردبوو. بەڵام له ناخەوه هیچم نەبوو هیوای ژیانم بداتێ. ئێستـه هەست دەکەم ئەم هیوایەم هەیه و پەشیمان له هاتن بۆ ناو شۆڕش نیم.

له هۆتێل "لۆبین" چاوم به دوو کوڕی کورد کەوت و باسی کوردستانم لێ پرسین، ئەوان له وەڵامدا دەڵێن:

– له کوردستاندا شەڕێکی گران بەردەوامه. له بەرەیەکدا دوو حەفتەیه شەڕەکه درێژەی هەیه. هەواڵدەرێکی تەلەڤزیۆنی ئەمەریکا به پارچه تۆپێک بریندار بوو له کاتێکدا فیلمی له شەڕەکه هەڵدەگرت. جگه له چۆمان، که بنکەی ناوەندی ئێمەی لێیه، هەموو شوێنەکانی تر ڕۆژانه بۆمباردمان دەکرێن، بۆیه ئێمه هەموو چەکی دژه هەوایی خۆمان له چۆمان دامەزراندووه.

کاتێک لەم کوڕانه دەپرسم که ئەوان دواڕۆژی ئەم دۆخه چۆن دەبینن له وەڵامدا دەڵێن:

– پیاو تێکەڵی شۆڕشێک نابێ ئەگەر نەزانێ ئەو شۆڕشه سەر دەکەوێ.

بەڵام له تۆنی قسەی ئەو کوڕانەدا هەست به جۆرێک خۆشبینیی منداڵانه دەکەم و جۆرێک دێته بەرچاو، که ئەوان "وەڵامی گشت پرسیارێکیان پێیه".
دیاره ئەوان به زەحمەت بڕوا به وتەکانی خۆیان دەکەن و ئەمەش به لەخۆڕازیبوونیانەوه دیاره. له خۆم دەپرسم ئەمانه بۆ له تارانن؟ بۆ ناڕۆنه بەرەکانی شەڕ ئەگەر وا پتەو و قایم بڕوایان به سەرکەوتنی شۆڕشەکەیان هەیه؟

ژمارەی ئەو کوردانەی له تاراندا دەژین زۆر نییه، وا دێته بەرچاو که کوردی عێراق تەنیا گرووپێکی بچووکی دوورەپەرێز بن. هەڵبەت دوو ملیۆن کورد له ئێران دەژین و زۆربەیان فارسی قسه دەکەن(؟) بەڵام کوردی عێراق له بنەڕەتدا زمانی ئەم وڵاته تێ ناگەن و خۆیان به بێگانه دەزانن، ڕاست

وەک چۆن من خۆم لە ئێران هەستی پێ دەکەم.

ئێمە رۆژی دواتر بە ئۆتۆمۆبێلێکی لاندرۆڤەر، کە کەرەسە و دەرمانەکانی دوکتۆری لێ بار کرابوو، تارانمان بەجێ هێشت. من و دوکتۆر رەمزی لە پێشەوە لە لای شۆفێرەکە، کە نە کوردی نە عەرەبی و نە ئینگلیزیی دەزانی، جێگەی خۆمان کردەوە. دوکتۆر رەمزی سەر و پا شکیاگ لەو حاڵی دەبوو چونکە وشەی هاوبەش لە نێوان کوردی و فارسیدا هەن و وەک ئێژن دوو زمانی دەستەخوشکی یەکترین. دوکتۆر رەمزی دەیوت ئێمە ئەم ترۆمبێلەمان بۆ گواستنەوەی ئەو کەلوپەلانە بەکرێ گرتووە، کە من دوو مانگە بۆ پەیداکردن و کڕینیان لە تارانم. ئەو ئێژێ من پسپۆری گوێچکە، قورگ و لووتم و زۆربەی ئەو شتانەش کڕیومن بۆ ئەو بەشەیە. هەرچەند پێویستییەکانی ئێمە گەلێک لەوانە زیاترن بۆ ئەو دۆخەی ئێستەمان. دوکتۆر رەمزی دەڵێ ئەو زۆر شادمانە منی لەم سەفەرەدا لەگەڵدام، هیچ نەبێ وەک هاودەمێکم بۆ ئەو.

ئێمە بە ئۆتۆبانێکدا تێ پەڕین، کە لەناو شارەکانی کەرەج و هەمەداندا دەرباز دەبێ. شۆفێرەکەمان تا ماشینەکەی دەیکێشێ گاز دەدات بەڵام زۆرجار ناچارە بۆ بەنزین گرتن لابدات. لاندرۆڤەرەکە وەک ئاو بەنزین دەخوا و من حیسابی لای خۆمانم دەکرد و وام دەزانی بەنزین زۆر گرانە بەڵام دواتر بۆم دەرکەوت بەنزین لەم وڵاتەدا کالایەکی هەرزانە و تەنانەت هەرزانتر لە ئاویشە. لە درێژەی رێگەماندا، لە لای باکور، لە دوورەوە کۆمەڵە شاخێکمان لێ دەردەکەون و گوایا لێوارە دڵنشینەکانی دەریای خەزەر لە پشتەوەی ئەو کێوانەوەن.(؟)[1]

---

١. رەنگە نووسەر بە باشی شارەزای جوگرافیای ئێران نەبووبێت و لەم بارەوە بە هەڵەدا چووبێ، دەنا مەودایەکی زۆر لە نێوان دەریای خەزەر و جادەی تاران – کرماشاندا هەیە. (وەرگێر).

گەیشتینە شاری کرماشان. دوکتۆر دەبێژێ ئێرە شارێکی کوردییە، بەڵام لە دەروازەی ئەم شارەشدا وەک هەر شارێکی تری ئێران پەیکەری شای ئێران دامەزراوە و پیاو ناتوانێ خۆی لە بینینی ببوێرێ. پەیکەرەکان لە دوورەوە زۆر زەبەلاح و ناقۆلا دێنە بەرچاو بەڵام، کە لێیان نێزیک بییەوە ئاسایی دیارن. هێندێک جار شا لەم پەیکەرانەدا سواری ئەسپێک و لە شێوەی سەرلەشکرێکی مەیدانی شەڕ دێتە پێش چاو. هەرچەند من بڕیارم داوە لەم سەفەرەدا زۆر بایەخ بە بارودۆخی سیاسیی ناو ئێران نەدەم بەڵام دەموچاوی شا لەم وێنە و پەیکەرانەدا، کە دەیەوێ وەک "براگەورە و باوکی میللەت" خۆی نیشان بدات دەماری ورد کردووم، هەروەها پەیکەر و وێنەکانی باوکی شا لە گشت شارێک و لە هەر چێشتخانە، چایخانە و تەنانەت ماڵانیشدا دەبینرێن. لەبەر خۆمەوە دەڵێم:

ئەگەر رۆژێک بێت و ئەم رێژیمە بڕووخێ خەڵکی ئێران ئیشێکی زۆریان لە بەرە تا گشت ئەم پەیکەر و وێنانە وردوخاش کەن و بیانسووتێنن. دوکتۆر رەمزی زۆر بە پارێزەوە باسی شا دەکات، کاتێک لێی دەپرسم نێوانی شا و کورد چۆنە دەڵێ:

– فارسەکان باش لەگەڵ کورددا دەجووڵێنەوە، شا باشە بۆ کورد.

ئێمە لە راستیدا نازانین شۆفێرەکەمان چەند ئینگلیزی تێ دەگات و چۆن گوێداری باس و قسەکانمان دەبێت.

شەو لە کرماشان دەبەینە سەر، دوکتۆر رەمزی منی بردە ماڵە کوردێک، ماڵی خزمێکی کە لەمێژە نەیبینیوە. ئەمانە سەر بە گرووپێکی کوردن پێیان دەڵێن "فەیلی". فەیلییەکان سەرەتا و لە بنەڕەتدا لە ئێرانەوە کۆچیان کردووە بۆ عێراق بەڵام دوو ساڵ پێش ئێستا، سەرەڕای ئەوە چەندین وەچەیان لەوێ ژیاون، دیسان لە عێراق دەرکرانەوە بۆ ئێران. خزمەکانی رەمزی لە بەغدا دەژیان و لە سەریەک باریان باش بوو. هەموو بنەماڵەکە تێکڕا دەرکران، ژن

و پیاو، شەش کوڕ و دوو کچ. لە بەغداوە کاتی دەرکران بۆیان هەبوو تا دەتوانن شتومەک لەگەڵ خۆیاندا بێنن، بەڵام لەسەر سنوور هەموو شتەکانیان لێ وەرگرتنەوە و تەنیا بیست "دیناریان" پێ هێشتنەوە. پاش ماوەیەکی کورت باوکی بنەماڵە مرد و ئێستە کوڕی گەورەی ماڵ سەرپەرشتیی بنەماڵەی لە ئەستۆدایە. دوکتۆر رەمزی دەڵێ:

- ئەمە رووداوێکی زۆر ئاساییە لە عێراقی ئێستە - دەوڵەتێک لە عێراق نییە، هێندێک دز و جەردەن لێک کۆبوونەتەوە. من ئەسڵەن نەمدەزانی ئەم خزمانەم چییان بەسەر هاتووە، بۆیە حەزم کرد سەردانیان بکەم تا لە زمانی خۆیانەوە بەسەرهاتەکەیان ببیسم و بزانم ئێستە ژیانیان چۆنە. دەردەکەوێ حاڵیان خراپ و هەژارانەیە بەڵام کاتێک من دەمەوێ یارمەتییان بدەم حازر نین هیچ شتێکم لێ وەرگرن.

ئەم بنەماڵەیە بە خواردنێکی کوردی میوانیمان دەکەن و ئەمەش یەکەمین خواردنی کوردیی منە. لەسەر زەوی دادەنیشین و خەریکی خواردن دەبین، لە حاڵێکدا ئەوان دەست بە باسی شەڕ و ناوچەکە دەکەن، من قسە لەگەڵ "قەیس"، کوڕێکی ١٨ ساڵە دەکەم، کە زۆر پێی خۆشە مەشقی ئینگلیزییەکەی قوتابخانەی لەگەڵ مندا بکات. قەیس دەڵێ:

- من بیری بەغدام کردووە، من لەوێ هەستم بە ماڵی خۆم دەکرد و گشت هاوڕێیەکانی منداڵیشم لەوێ بوون.

کاتێک قەیس هات بۆ ئێران نەیدەتوانی وشەیەک فارسی قسە بکات. ئەو پێی وا بوو عێراق وڵات و بەغدا شاری ئەوە. قەیس ئەو کات نەیدەتوانی و ئێستەش ناتوانێ تێ بگات بۆچی ئێوارەیەک پۆلیس هاتن، رژان بەسەریاندا و وتیان:

ئێوە پێوەندییەکتان بەم شوێنەوە نییە، ئێوە دەبێت بگەڕێنەوە بۆ ئێران. تەنیا لەبەر ئەوە، کە باب و باپیرانی ئەو رۆژگارێکی دوور لە ئێرانەوە

کۆچیان بۆ عێراق کردووە؟ دوکتۆر رەمزی لەم بارەوە دەڵێ:

- ئەو کـوردانەی وەک ئەم بنـەمـاڵە و راست بەم شـێـوەیە فـرێ دراونەتە دەرەوەی عێراق نزیک بە ١٠٠,٠٠٠ کەسن.

قـەیس پێی خۆشـە هەمـوو شـتێک لەبارەی سوێدەوە بزانێ. - من باسی کوڕ و کچـەکەی خـۆمی بۆ دەکەم - کـاتێک دەبیسێ کوڕەکەی منیش حـەزی لە مۆسیقای پاپە و من کەسـانی وەک "مارک بولان" و "داوید باوی" دەناسم، کەیفی گەلێک خۆش دەبێ.

من پێم وایە ئەمە تایبەتمەندیی ئەم سەردەمـەی ئێسـتـەیە ئێـمـەی تێدا دەژین، کە من لێرە لە کرماشان، "پێرشیا"، دانیشتووم و خەریکم گرێدانێک لە نێـوان منداڵەکـانی خـۆم و گـەنجێکی سـەر و رووخـۆشـدا سـاز دەکـەم، لاوێکی کـورد کە کـارەسـات هیچ کـاریان لێ نەکـردووە و کـاتێکیش دەبینێ دەرگەیەکی جیهانیی بە روودا دەکرێتەوە، دەگاتە ئەوپەڕی خۆشحاڵی.

کاتێک ئێمە هەڵدەستین بڕۆین قەیس تا سـەر شەقامـەکە لەگەڵمان دێت و روو لە من دەڵێ:

- زوو بگەڕێوە. کـاتێک لە کـوردسـتـان گـەڕایەوە بێرەدا وەرەوە و سـەرم لێ بدەوە.

سـەرلەبەیانیی رۆژی دوایی، پێش روونـاکـبـوونی هەوا وەڕێ دەکـەوین و لەسـەر رێگە، لە گوندێک بە ناوی "کـامیـەر" (کامیاران؟) بۆ خـواردنی بەیانی لادەدەین. لەم ئاوەدانییەدا رێستـووڕانێکی زۆر کۆن و دواکەوتوو هەیە، چەند مـێـز و سـەندەڵی بە گـۆشـەی دیـوارەکـانەوە نووسـاون - پیـاوان بێـدەنگ دانیشـتوون چای دەخـۆنەوە و لەو نانە نـاسکە نەرمـە کوردییـە لەت دەکـەن - بەڵام ئێمە هێلکەورۆنێکی خۆشمان بەر دەکەوێت تا بە چایەکەوە بیخۆین.

لە کاتێکدا سـەرقاڵی نانـخواردن بووین، کتوپڕ بینیمان دەمـەقاڵێیەک لەناو رێستووڕانەکەدا دەستی پێ کرد. پیاوێکی قـەڵەو لە دەمی دەرگە، کە پارەی

خواردنەکانیشی لە خەڵک وەردەگرت و وا دیار بوو خاوەنی ریستوورانەکەیە، هەستا و گوێچکەی ئەو پیاوە چکۆلەی، کە هێلکەورۆنەکەی بۆ ئێمە دانا گرت و بە توندی کێشای. پیاوە قەڵەوەکە وا توورە دەهاتە پێش چاو، کە نیازی بوو سەری ئەو کورە هەزارە هەڵکەنێ. هیچ شتێک لەوە خراوتر نییە، ببینی کەسێک لێ بدرێ و تۆش بێ دەسەڵات شاهیدی گریانی بیت. بە تایبەتی ئەگەر ئەو کەسە پیاوێکی گەورە بێت. من حاڵی نەبووم کێشەکە لەسەر چییە و دوکتۆر رەمزیش هیچ ناڵێ، بەلام من هەست دەکەم ئەویش وەک من بە بینینی ئەم دیمەنە ئازار دەبینێ بۆیە بە نارەحەتییەوە دەڵێ:

- ئەمە کاری کوردانە ئیتر.

دوای تۆزێک بۆم دەردەکەوێ ئەو کەسە بەر لێدان کەوت و دەگریا نەک پیاوێکی ٣٠ ساڵە وەک من پێم وا بوو، بگرە گەنجێکە رەنگە بە زەحمەت تەمەنی بگاتە ١٨ ساڵ، بەلام ئەرکی گران و ژیانی دژوار بوونەتە هۆی ئەوە وا بە تەمەن بێتە بەرچاو. ئێمە بێدەنگ خەریکی خواردنی هێلکەورۆنی خۆمان دەبین، دوکتۆر رەمزی و شۆفێرەکەمان هەوڵ دەدەن نارەحەتیی خۆیان بشارنەوە و کاتی رۆیشتن دوکتۆر رەمزی دەچێتە لای پیاوە قەڵەوەکە، هێندێک قسان پێکەوە دەکەن و دواتر دەستیان لەناو دەستی یەکتر دەنێ و ئاشتیان دەکاتەوە.

ئێستە کە من ئەم یاداشتانە دەنووسمەوە، هەرچییەک دەگەرێم دەبینم ئەمە تەنیا ناکۆکی و کێشەیەک بوو من لە کوردستاندا بینیم و لە هیچ جێگەیەکی تر، تەنانەت لە بەرەکانی شەریشدا نەمبینی کەسێک بە دەنگی بەرز لەگەڵ کەسێکی تردا قسە بکات و جگە لە دۆستایەتی و هەڤاڵەتیی نێوان مرۆڤ هیچی ترم بیر نایەتەوە.

تەنیا لێرە، لە گوندی کامیەر لە کوردستانی ئێران - ئێرەش کوردستانە و

ئەمـــانـەش کــوردن - بۆیە دوکـــتـــۆر وا نارەحـــەت بـوو بەڵام هـەوڵی دەدا نارەحەتییەکەی لە من بشارێتەوە و روو لە من دەڵێ:

- کەریەتی، ئاخر پیـاوی ژیر بەم شێـوەیە هەڵسوکـەوت لەگەڵ یەکـتـردا ناکات.

من هەست دەکـەم دوکتـۆر رەمزی خۆشـحـاڵە هاتووەتە کوردسـتـان، ئەو پێشتـر کوردسـتـانی ئێرانی نەبینیوە، بۆیە پێی خـۆشـە ئەم سـەردانە تا دەتوانێ درێژ بکاتەوە و وێڕای بینینی خزمەکانی، ئەم بەشەی کوردستانیش ببینێ. ئەگـەر بەم شێـوەیە نەبا دەبو بە شـەو و رۆژێک ئێـمە بگەیشتـاینە ئامانج. دوکتۆر لە کرماشان موسەجیلە و هێندێک شریتی گۆرانیی عەرەبی کڕین. دوای هێندێک گوێدانە شـریتـەکـان گـومـانمان لە شـۆفـێرەکـەمـان هەڵگرت و کـاتێک ئـەو بە نیـازی بەنزین تێکردن لە ئۆتۆمـۆبێلەکە چووە دەر، دوکتۆر رەمزی وتی:

- ئەو دەڵێ عـەرەبی تێ ناگـات، بـەڵام کـاتێک من شـریتـەکـان لێ دەدەم لە ناوچاوێرا تێ دەگـەم حـاڵی دەبێت. ئەو درۆ دەکات، دوور نیـیە ئینگلیـزیش بزانێ و رەنـگە خـەفـیـەی "سـاواک "یش بێت. شـیـمـانە زۆرە وا بێت بەڵام جەهەندەم، خۆ ئێمە شتێکمان نەوتووە تا لێی بترسین.

ئێـمـە بە دەشـتـێکی وشکدا تێ دەپـەڕین و تەپۆڵکە و بەرزاییـیـەکـان لەبەر تیشکی خۆر، سووتاو و سـوور هەڵگەڕاون. دوکـتۆر رەمزی دەڵێ لە بەهـار و مـانگەکـانی نیسـان و ئایاردا ئێـرە سـەراسـەر سـەوزەڵانی و ناوچـەیەکی دڵنشینە.

لە سـەقز بۆ چاخـواردنەوە لادەدەین، بە ناو" بوکار"دا (بێگومـان مەبەسـتی بۆکـانە - وەرگـێـڕ) رەت دەبین کـە لە لێـواری رێگەکـەدا قـاڵی و شـتی ئەنتیـکەیان داناون بۆ فرۆشتن. لە گـۆشـەی جـادەکـەوە چاومـان بـە هێندێک وشتر دەکەوێ و لە مەهابادیش نان دەخۆین. لە لای باکورەوە گۆلی گەورەی

ورمێ دەبینین ورشەورش لە دوورەوە دەدرەوشێتەوە.

لە مەهابادیشدا پەیکەرێکی گەورەی شا راست لە دەروازەی شاردایە. ئێرەش شارێکی بچووکی کشوماتە وەک شارەکانی تر. بەڵام دوکتۆر رەمزی هەست دەکات لێرە دەتوانێ پڕ بە سییەکانی هەناسە هەڵبکێشی. بە مەبەستی پیاسە بە شەقامێکدا رۆیشتین، لە ریستوورانێکدا لامان دا و بینیمان بولبولێکی بچووکی زیندانیکراو، لە قەفەسێکدا بێ ئەوەی گوێ بداتە ئەوە کە ئەو رۆژێک مەلێکی ئازاد و توانای فڕینی بووە، بێ پسانەوە خەریکی خوێندنە، دوکتۆر رەمزی بە نەرمی و بە بێدەنگی وتی:

– حەز ناکەم شۆفێرەکە تێ بگات بەڵام من دەتوانم لەسەر مەهاباد زۆر شتت بۆ باس کەم. ئەگەر کوردستان لەش یان جەستەیەک بێت، ئەوە بێگومان مەهاباد دڵەکەیەتی. دوایە لە من دەپرسێ چۆن لەبارەی کوردەوە بیر دەکەمەوە؟

بەڵام من چۆن هەر لە ئێستەوە وەڵامی ئەم پرسیارە بدەمەوە.

– ئەوان زۆر بێدەنگ و کز دیارن.

دوکتۆر رەمزی وەڵامی من دەداتەوە:

– راست دەکەی، هۆیەکەشی ئەوەیە ئەوان گرفت و کێشەیان زۆرە، بۆیە شاد و خۆشحاڵ نین.

– ئەوان وەک نامۆ و بێگانەیەک سەیری من ناکەن.

– راستە. ئەوەش هۆیەکەی ئەوەیە دەزانن تۆ کێیت. ئەوان دەزانن تۆ رۆژنامەوانی و بۆ خۆت دەزانی دەبێ چی بکەیت. ئەوان خۆشیان لە رۆژنامەوانانی بیانی دێت.

دوکتۆر رەمزی هەوڵ دەدات جێگە و مانای مەهاباد لە لای کورد بۆ من روون کاتەوە و دەڵێ:

– به هاسانی هەست بەوە دەکرێ لێ تێگەیشتنێکی بێدەنگ لە نێوان کوردی ئێران و عێراقدا هەیە. شەڕی ئێستە پێوەندیی بە چارەنووسی کوردی عێراقەوە هەیە، بەڵام لێرە، لەم دیوی سنوورە، لە ئێرانی پۆشتە و پەرداخی شادا کورد بە هیواوە چاو لە خەباتی خوشک و برا کوردەکانیان دەکەن و پشتگرییان دەکەن. بە تایبەتی لێرە، لە مەهاباد، کە ناوەندی ناوچەی کوردستانە و دەبێت ڕۆژێک ببێتە پایەتەختی کوردستان وەک چۆن ڕۆژێک پایەتەختی کۆماری کوردستان بوو.

لە ئابی ١٩٤١ ئێران کەوتە بەر پەلاماری هێزە رووسی و بەریتانیاییەکان. ناوچە کوردییەکان کەوتنە نێوان ئەم هێزانە، بۆ ماوەیەکی کورت کۆتایی بە ستەمی تاران هات، هەستی نەتەوەیی کورد ژیایەوە و بە پەلە شێوەی گرت. ڕۆژی ٢٢ ی کانوونی دووەمی ١٩٤٦ لێرە لە مەهاباد، راست لەو شوێنەی ئێستە پەیکەری شای لێ راست کراوەتەوە کۆمارێکی کوردی راگەیەنرا.

ڕێبەری کۆمار کەسێکی شەریف و باش بوو بە ناوی قازی محەمەد بەڵام پاراستنی کۆمار لە ئەستۆی مەلا مستەفا بارزانیدا بوو، کە لەگەڵ دە هەزار لە هاووڵاتیانی و دوو هەزار پێشمەرگەی شەڕکەری باوەڕپێکراو سنووری عێراقیان بەزاندبوو و هاتبوونە مەهاباد.

کۆماری مەهاباد لە لایەن رووسەکانەوە پشتگریی لێ دەکرا، بەڵام دەوڵەتێکی کۆمۆنیستی نەبوو. تەمەنی ئەم کۆمارە بە زەحمەت ساڵێکی پڕ کردەوە، بەڵام لەو ماوە کورتەدا بیرۆکەی نەتەوە و دەوڵەتێکی بۆ کورد جێ هێشت، دەوڵەتێک کە کورد هەردەم خەباتیان بۆ کردووە و هیچ کات وازیان لە هەوڵدان بۆ دامەزرانی نەهێناوە.

مەهاباد، وەک من تێی گەیشتووم شارێکی پیرۆزی کوردییە، "مەهاباد" مانای هێندە گەورەیە نابێت تەنیا وەک ناوێک و شارێک سەیری بکەیت.

بگره وەک ڕەمزێک بۆ گشت ئاواتەکانی گەلی کورد بۆ ڕزگاری ببینرێ.

ئێستە بێدەنگی لە مەهاباددا سەردەستە، بەلام ئەم بێدەنگییە پڕە لە هیوا بە دوارۆژ.

دوکتۆر ڕەمزی ناونیشانی بنەماڵە ئاوارەیەکی تری خەلکی بەغدای لایە. ئێمە ڕۆیشتین بۆ شارێکی تر و لەم شارە بچکۆلەیەدا کە ناوی "لافلی"یە(؟) بە دوای ئەو ماڵەدا گەڕاین. چارەنووسی ئەوانیش وەک ئەوانی ترە: لە بەغدا وەدەرنران، ڕێگەی باکوریان پێشان دان و وتیان بڕۆن بۆ لای کوڕەکەتان. کوڕەکەیان تێکەڵی شۆڕش بووبوو و سزای بەشداری لە شۆڕشیش دەرکردنە.

باوکی ٦٧ ساڵەی ئەو کوڕە، پێشمەرگەیە، دانیشتووە و خەریکە گیروگرفتەکانی خۆیمان بۆ دەگێڕێتەوە:

ئێمە هاتین بۆ کوردستان، وەک سواڵکەر لەم شوێن بۆ ئەو شوێن بە دوای کوڕەکەمدا گەڕاین و کە بینیشمانەوە و لێم پرسی کە بۆ ئەم ڕۆژەت خستە بەرم؟ لە وەلامدا وتی:

جا من ئەگەر نەشهاتمایە بۆ ناو شۆڕش زوو یان درەنگ هەڵیان دەواسیم، پێت وایە ئەو کاتە باشتر دەبوو؟

دوایە ئەم پیاوە بە هاوسەر و چوار منداڵی بچووکەوە ڕێگەی ئێران دەگرێتە پێش و ئێستە لەم شارۆکەیە ماڵێکی بچووکی بەکرێ گرتووە و بە قسەی دوکتۆر ڕەمزی پێویستی بە یارمەتی نییە.

- خۆی کەسێکی دەوڵەمەند بوو لە بەغدا. ڕاستە بەشێک لە شتەکانیان لێ سەندووە بەلام هەمیشە بۆ کەسی خاوەن سەروەت بوارێک هەیە.

من کەمێک لەم گشت لادان و سەردانانەی دوکتۆر ڕەمزی بێزار بووم بەلام دەشزانم چەندە گرینگە بۆ ئەو و خزمەکانی یەکتر ببینن، هەواڵی

یەکتر بپرسن و پێوەندییەکانیان نوێ بکەنەوە تا وەک سازکردنی پردێک ئەم لێکپچڕانە ناچارییە کەم کەنەوە.

سەرەنجام بەرەو سنوور ڕێگە دەگرینە بەر و شۆفێرەکەمان بۆ ئاخرین جار لە پیرانشاردا بەنزین تێ دەکا و دوای ئەمە تەنیا چەند کیلۆمەتری ماوە. لە ڕێگە تووشی پەلێکی سوپای ئێران دەبین بەلامانداتێ دەپەڕن. لە ڕۆژاواوە کێوەکان بەرز و بەرزتر دەنوێنن. دوکتۆر ڕەمزی دەڵێ بەرزترین شاخ، ئەوەی کە بە حاڵ لەناو تەمومژەکەدا دیارە ئەوە کوردستانی عێراقە. جڵەی گاگەل، مەڕ و بزن و قەل و مریشک دێنە سەر ڕێگەمان و لە لای ڕێگەوە و لە دۆڵێکدا کۆمەڵە چادرێک دەبینین، بەلام چادرەکان وا دیارە جۆرێک حەشارگەن و لەژێریانەوە تۆپ و ژمارەیەک تانکی سوپای ئێران شاراونەتەوە. بە جادەیەکی گلێندا دەڕۆینە سەر تا دەگەینە سەر یاڵێک، کە لەوێوە ناوچەکە و هاتوچووی خەڵک جوانتر دێتە بەرچاو. پاش هێندێک یاڵ و دۆڵ، بێ ئەوە من هەست پێ بکەم دەگەینە جێگەیەک بنکەی کۆنترۆڵی سوپای ئێرانە و ڕامان دەگرن.

هەزاران کەسی ئاوارە – زۆربەیان ژن و منداڵ – لەودیوی خاڵی بنکەکەوە ڕاوەستاون. ژمارەیەکی کەمیان چادریان هەیە بەلام ئەوانی تر بە شێوەی کاتی بە پەتوو جێگەیەکیان ساز کردووە بۆ خۆیان. ڕێگە گرمەی دێت لە پیاو و هەموویان چەک و ڕەختیان پێیە.

من پێشتر لەسەر ئەم سەفەرە درێژەم نووسیوە و دەکرا ئەمجارە لە باسی ئەم بەشە گەڕێم. بەلام لەبەر ئەوە قەولم داوە ئەم کتێبە لەسەر مێزی نووسینەکەمەوە دەست پێ بکات و هەر لێرەش تەواو بێت، ناچارم دیسان بینووسمەوە. من نامەوێ هیچ شتێکی سەفەرەکەم لەم کتێبەدا جێ بێڵم و هیچ شتێکیش زیاد کەم لەوەی بینیومە، بۆیە دەمەوێ ئێوەش گشت ئەو شتانە ببینن، کە من لە ماوەی سەفەرەکەمدا بینیومن.

به شێوەیەکی سروشتی من وێنەی تایبەتی خۆم لە کوردستان لە ناخی خۆمدا هەبوو. ئەو وێنەیە تێکەڵاوێک بوو لەو شتانەی من بیستبوومن و لێرە و لەوێ لە ژیانمدا خوێندبوومنەوە. بەڵام لەو کاتەی لاندرۆڤەرەکە، لە پشت بەربەستەی بنکە سنوورییەکەوە راوەستا، ئەو وێنەیە پاک بوو، بێلایەن بوو و ئیدی شتێک نازانم، هیچ بۆچوون و چاوەڕوانییەکیشم لەم بارەوە نییە.

من تەنیا هەست دەکەم کە بە توندی دنیا لە پشت ئەو بەربەستە و لەم سنوورە ساکارەدا بەکۆتا دێت و شتێکی بە تەواوی جیاوازتر و نەناسراو لەوێ، لە پشتەوەی ئەو میلەوەیە. بەڵام هاوکات واش دێتە بەرچاو، کە ئەو میلە سنوورییە، دوو دنیا لێک جیا دەکاتەوە. هەردەم لەپێش دەرگەکەم، لێرە لە سوێدیش هەبووە و من نەمتوانیوە هەست بە بوونی بکەم.

دوکتۆر رەمزی شتێک بە پیاوەکانی بنکەکە دەڵێ، کابرا میلەکە بەرز دەکاتەوە، ئێمە تێپەڕ دەبین و بە پەلە بەدوای ئێمەدا دای دەخاتەوە. دوای ئەم شوێنە ئێمە دەربازی کوردستانی عێراق دەبین.

## گوێت لێیانە چۆن گۆرانی دەڵێن؟

لە دەم سنوورەوە جادەیەک بە دۆڵێکدا دەڕواتە خوار و هەرچییەک دەڕواتە پێشتر تەنگ و باریکتر دەبێتەوە. ڕێگەکە پێی دەوترێ "جادەی هامیلتۆن" و پێشتر، کاتێک ئینگلیز لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا سەردەست بوون، سازیان کرد. دیارە ئەمە جادەیەکی سەربازی و تایبەت بوو بۆ ئەوەی هێز و توانستی سەربازی، لە کاتی شەڕدا لە عێراقەوە بۆ ئێران وەگوێزرێ. ئێستە وەک تاقە ڕێگەی پێوەندیی کوردستانی عێراق لەگەڵ دنیای دەرەوە بەکار دێ، کە لە سەرێکەوە چەک و تفاق بۆ شەڕوانانی کوردی پێدا دێ و لە سەرەکەی تریەوە ئاوارە و لێقەوماوانی هەڵاتووی دەستی شەڕ.

هیچ نەخشەیەکی بە کەڵک نییە بتوانرێ وەک ڕێ نیشاندەر لەم ناوچەیەدا کەڵکی لێ وەربگری جگە لە تەنیا نەخشەیەکی تووریستیی عێراق، کە هیچ وردەکارییەکی تێدا نییە، بۆیە هێندێک وزەت دەبات تا من بە باشی سەر لە جیۆگرافیای ئەم هەرێمە دەردێنم و دەزانم ئەم کوردستانی ئازادە تەنێ هەرێمێکی باریک و درێژ لە لای باکوورە. بەڵام شوێنێکی سەخت و هەڵەموت، بە کۆمەڵێک شاخی بەرز و دۆڵی قووڵ دەورەی گیراوە و کورد لە پشت ئەم شاخە سەخت و دۆڵە قووڵانەوە سەنگەریان گرتووە و ڕوو لە هێزی هێرشبەری دەوڵەت بۆ پاراستنی خۆیان، دامەزراون.

بە درێژایی جادەی هامیلتۆن کۆمەڵێک ئاوەدانی و گوند هەن و لێرە شۆڕش و شەڕ بەڕێوە دەچێ و ڕێبەرایەتی دەکرێ. چەند ساڵ پێش ئێستە بنکەی سەرەکیی بارزانی لە ڕانیە بوو، دواتر گوێزرایەوە بۆ شارۆکەی گەڵاڵە لە چەند کیلۆمەتری جادەی هامیلتۆن لە نزیک پردی گرینگی گەڵاڵە.

بەڵام ناوی ئێستەی "پایەتەختی" هەرێمی کوردستان، چۆمانە.

ئەم شوێنەش لە راستیدا گوندێکی گەورە و بڵاوە لە دۆڵێکی تەنگەبەردا، کە بە لای باشووری رۆژاوا تا سنووری ئێران درێژ دەبێتەوە و دەگاتە لووتکەی زنجیرە شاخەکان. لە سنوورەوە تا چۆمان هەر سەعاتە رێگەیەکە بە ترۆمبێل. مرۆڤ سەرەتا دێتە حاجی ئۆمەران، ژمارەیەکماڵی قوڕین رەت دەکات، بە رێگەیەکی سەخت و مەترسیداردا تێ دەپەڕێ کە کامیۆن، لاندرۆڤەر و گەلێک ئۆتۆمۆبێلی شەخسیی نەگونج بۆ ئەم رێگەیە بە چاو دەبینێ.

لە گشت جێگەیەکی ئەم رێگەیەدا سەرباز، کە لای کورد پێیان دەوترێ "پێشمەرگە" دەبینرێن. خەڵکی هیچ ناوێکی تر بۆ ئەوان بەکار نابات و مانای پێشمەرگەش مەیلەو دەبێتە ئەوە "کەسێک کە ئامادەیە گیانی خۆی بەخت بکا، یان ئامادەیە ڕووبەڕووی مردن بێتەوە". دیارە من لەم سەفەرەدا هەوڵ دەدەم زۆر زیاتر لەسەر پێشمەرگە بنووسم چونکە ئەوان بڕبڕەی پشتی ئەم شۆڕشەن. پیاو دەتوانێ ئەوان لە گشت شوێنێک لە کوردستاندا ببینێ، بەڵام لە راستیدا من هەوەڵین جارە دەیانبینم و بە وردی سەرنجیان دەدەم. بە جامەدانی و بەم شەرواڵە پان و پۆڕانەیانەوە کە زیاتر وەک تەلیس دەچن.

دواتر من ناوی گشت جلوبەرگی ئەم پێشمەرگانە فێر دەبم، ئەوەی لە سەریانە پێی دەڵێن کڵاو، هی دەوری کڵاوەکە جامەدانی، ئەوەی لەژێرەوە لەبەری دەکەن پێی دەڵێن شەپک (کراس)، ئەوەی وەک تەلیس وایە شەڵوار و ئەوەی لە ناوقەدیان دەیبەسن پێی دەڵێن شوتک (پشتوێن) کە زۆر درێژە و کاری جۆرەوجۆری پێ دەکەن. پشتوێن زک گەرم رادەگرێ، وەک دەستماڵ کاری پێ دەکرێ و لە هەمووان گرینگتر کاتی نووستن دەموچاوی پێشمەرگە لە سەرما و هێندێک جاریش هێرشی مێشوولان دەپارێزێ.

من قەت نابینم ئەوان بە ڕیز بڕۆن یان وەک سەرباز مەشق ئەنجام بدەن. بەڵام هیچ کات ئەوان بێ چەک نابینم، بۆ هەر کوێیەک بچن یان هەر کارێک ئەنجام بدەن چەک لە دەست و هەردەم سازن. زۆربەی نێزیک بە تەواوی پیاوەکانی ئەم خەڵکە چەکدارن و جگە لە پیرەپیاوان و مێرمنداڵان (کوڕ) کەسی بێ چەک نابینرێ و جاری واشە کوڕی ١٤ ساڵە دەبینی دەمانچەی پێیە و سنوورێکیش بۆ ئەوە، کە پیر بێت و لەبەر پیری نەتکەنە پێشمەرگە بوونی نییە - بارزانی خۆی ٧٤ ساڵە.

روانگەی ئەم شەڕوانە چیاییانە لەسەر ژیان و مردن دەبێتە یەکەم کاریگەری بەسەر منەوە. هەرکە ئەو میلە سنوورییەم تێ پەڕاند ئەوانم بینین...، لە حاجی ئۆمەران، لە "دوربان" لە چۆمان. من پێشتر هیچ کات هێندەم چەک نەبینیوە، سوپایەک وەک ئەمانە بێباک، پیاوانی بڕوابەخۆ، من دەزانم. . . من دەزانم لەم وڵاتەدا شەڕێکی بەتەواوی مانا و بێ بەزەییانە بەڕێوە دەچێت و هەموو ئەم پێشمەرگانە بێ هیچ شک و گومانێک لە رەوابوونی ئامانجیان، سازن گیانی خۆیان بەخت بکەن بۆ پاراستنی خەڵکی خۆیان.

تەنیا سەرنجێکی کورت لەم پیاوانە من لەم بارەوە قایل دەکات و من دەزانم کورد هێندە لە شەڕدا ژیاون، ئەم دیاردەیە بووەتە بەشێک لە ژیانی رۆژانەیان و خۆیان لەگەڵ دۆخەکەدا رێک خستووە. بۆیە بێ گلە و گازندە تێکڕا ڕووبەڕووی هەموو پێشهاتێک دەبنەوە.

دوکتۆر رەمزی من دەباتە هۆتێلێک لە "دوربان" و داوام لێ دەکات راوەستم تا ئەو ئاگەدارم دەکاتەوە. بۆ خۆی خەریکی لاندرۆڤەرەکە و دانانی ئەسپابەکانی دەبێت.

من چاوەڕوانی هۆتێلێکی لەم جۆرە لە دوربان و لەناو شەڕی کوردستان نەبووم. ئەمە هۆتێلێکی توریستیی مۆدێرنە، کە دەوڵەتی عێراق لە وەختی

ئاشتیدا سازی کردووە بەڵام ئێستە لەژێر دەستی شۆڕشدایە. من بەرپرسی هۆتێلەکەم بینی. ناوی "یۆنادم بنیامینە" و ٤٤ ساڵییە. لەبەر ئەوە من حەز دەکەم هەرچێک زووتر دەست بەکار و ئەرکەکانم بکەم وتووێژێک لەگەڵ ئەم کەسەدا ساز دەکەم. ئێمە لە کاتێکدا خەریکە تاریک دابێت لە دەرەوەی هۆتێلەکە دادەنیشین، لە دیوی لای شاخەکەوە پاشماوەی فڕۆکەیەکی تێکشکاو دەبینرێ و بینجامین دەڵێ ئەوە لە شەڕی پێشوودا کەوتە خوار نەک لەم شەڕەی ئێستە.

بنیامین دەڵێ ئەو خەڵکی شاری پڕ لە نەوتی کەرکووکە، کاتێک لە مانگی ئاداردا شەڕ دەستی پێ کردەوە ئەو هەڵات بۆ چۆمان و ئامادەیی خۆی بۆ خزمەتکردنی شۆڕش ڕاگەیاند و ئەوانیش کردیانە بەرپرسی ئەم هۆتێلە، کە ئێستە تاقولۆق پێشمەرگە نەبێت مێوانی تووریستی بۆ نایەت. ئەو ژنەکەی و پێنج منداڵی لە کەرکووک بەجێ هێشتوون و شەش مانگە هیچ ئاگایەکی لێیان نییە، بۆیە زۆر نیگەران و نارەحەتە.

لە گەرمەی قسەدا پێشمەرگەیەک و پیاوێکی بچکۆلەی بێ چەک دێن و دەڵێن:

– ئێمە چاوەڕوانی تۆ بووین، پێمان وا بوو دوێنێ دەگەی. تۆ نابێ لێرە بیت، تۆ دەبێت لەگەڵ ئێمەدا بێیت بۆ چۆمان. ئێمە لەوێ مێوانخانەیەکمان هەیە ناوی قەسرول – سەلامە "ماڵی ئاشتی" و گشت ڕۆژنامەوانان لەوێ دەمێننەوە.

ئەو ماوەیە لە کوردستانم، قەسرول – سەلام (ماڵی ئاشتی) دەبێتە بنکە و شوێنی مانەوەم. هۆی ئەوەی کە بەم هۆتێلە (کە لە ڕاستیدا نەک قەسر و هۆتێلێکی مۆدێرن بگرە زیاتر لە مێوانخانەیەکی ئاسایی دەچێ) دەوترێ ماڵی ئاشتی ئەوەیە، کە ڕێککەوتنی ئاشتی ساڵی ١٩٧٠ لێرەدا مۆر کرا. ڕێککەوتنێک، کە سێ ساڵ دواتر تێک چوو. تەختێک و لامپێکم پێ دەدەن و

داوام لێ دەکەن شەوانە، کاتێک لامپەکە دادەگرسێنم پەردە دادەدەمەوە چونکە قەرارە شەوانە لامپ و ڕووناکی دەرنەکەوێ. کاتێک بە تەواوی تاریک دادێ دەوروبەر وا بێ دەنگە من هاژەی ئاوی تاڤگەی دۆڵەکەی خوارەوە و جریوەی مەلان بە دارەکانەوە بە هاسانی دێتە گوێم.

من و میشل، یەکێک لەو کەسانەی هاتە شوێنم تا بمهێنن بۆ ئەم هۆتێلە، لە تەنیشت مێزێکی گەورەوە دادەنیشین و دەست دەکەین بە فراوین خواردن. چێشتەکە گۆشت و تەماتەیە. میشل دەست دەکات بە باسی خۆی و شەڕێک کە لە گۆڕێدایە:

– من بەرپرسی بەشی توریزمی مووسڵ بووم. ئێستە لێرە وەرگێڕی زمانی فرەنسایم لە بەشی زانیاریدا. میشل ئینگلیزیش دەزانێ بەڵام فرەنساییەکەی باشترە. ئەو لە بنەڕەتدا فرەنساییە. – ئەگەر ئەو جلە پێشمەرگانەی نەبن من ناتوانم لە فرەنساییەکی رەسەن جیای بکەمەوە. میشل درێژەی دەدات و دەڵێ:

گرفتی ئێمە ئەوەیە رێژیم فڕۆکە و تانکی هەیە و ئێمە شتی لەو شێوەیەمان نییە. بەڵام ئێمە شتێکمان هەیە خەباتی بۆ بکەین، کوردستانێکی سەربەست، کە زۆر لە لامان پڕ بایەخترە. پێشمەرگەی ئێمە ئازا و لە شکان نەهاتوون، ئەگەر لەگەڵ هێزی ئاسایی -پیادە-ی رێژیم بەرەوڕوو دەبن یەکیان بەرانبەرە لەگەڵ سەد سەربازی عێراقدا. بەڵام شەڕ لەگەڵ تانکدا دژوارە و بە زەحمەت دەچێتە پێش.

میشل دەڵێ:

– چەند رۆژ پێش ئێستە دەستەیەک پێشمەرگە هێرشیان کردە سەر بنکەیەکی سەربازیی رێژیم و سێسەد سەربازی دەوڵەتیان کوشت و پەنجا ئۆتۆمۆبێل و تانکیشیان تێک شکاندن.

وردە وردە خەریکە باران دەست پێ بکات و زستانیش بەڕێوەیە، بە

زستان تا دوو مەتر بەفر لێرە دەبارێ و ئەو کات سوپای عێراق لە جێگەی خۆیدا دەچەقێ و بواری جوولانی نابێت. بەلام هێزەکانی ئێمە وا نین. ئەوان بە شاخ و ئاو و هەواکەی فێرن و باشتر لەگەڵیدا راهاتوون.

لە قوولاییی دۆڵەکەوە کاروانێک کامیۆن و ماشێن دەبینم هەموو لامپەکانیان هەڵکردووە و دەنگی گۆرانیش دێتە گوێم، میشل دەڵێ:

پێشمەرگە بۆ بەرەی شەڕ دەڕۆن. گوێت لێیانە چۆن گۆرانی دەڵێن.

من رادیۆیەک لە میشل بە قەرز وەردەگرم و لە کاتێکدا هەمووان رۆیشتن بخەون، سەعات ١٠ی شەو گوێ دەدەمە بەشی ئینگلیزیی دەنگی کوردستان. هەموو بەرنامەکە باسی بەرەی شەڕ، پەیامی رەمز، هێرشی هەوایی، شەڕ لە بەرەکانی رەواندز، بێتواتە، کۆیسنجاق و ئاکرێیە.

پێچی رادیۆیەکە با دەدەم و دەچمە سەر دەنگی ئەمەریکا، گوێ دەدەمە دوایین خەبەر و دەبیستم دیسان باسی کاردانەوەیە بۆ لێبووردنی سەرۆک "فۆرد" لە "نیکسۆن" کێشەی وەتەرگەیت، کە هەلایەکی گەورەی نایەوە و پێچی رادیۆیەکە بادەدەمەوە بۆ سەر رادیۆی کوردستان و دیسان گوێ دەدەمە هەواڵەکانی بەرەی شەڕ:

پەیامنێرمان لە بەتالیۆنی سێیەوە لە قەرەداغ رادەگەیەنێ، کە دوێنێ پاش نیوەڕۆ، دەستەیەک لە پێشمەرگە هێرشیان کردە سەر بارەگاکانی رژێم لە کێوی سەگرمە و زیان و زەرەرێکی زۆریان بە دوژمن گەیاند، دواتر لە ماوەی رۆژدا دەستەیەکی تری پێشمەرگە هێرشیان کردە سەر دوژمن لە قەلا سوورە، لەم شەڕەدا پێشمەرگە چەکی جۆرەوجۆریان بەکار هێنا و زیانی گەورەیان گەیاندە دوژمن... لقی سێی کەرکووکی پارتی دیموکراتی کوردستان رای گەیاند، کە ئەوان ئاگەدار کراون رۆژی ٢٥ی... رژێمی دیکتاتۆریی بەعس ١٥ پێشمەرگەی لە مووسڵ لەدار داوە. پێویستە بگوترێ کە ٣ کەس لەم هەڵواسراوانە سەر بە نەتەوەی عەرمبن... هێزی شێخان رای

گەیاند شەش بنەماڵەی تری کورد ناچار کراون مووسڵ بەجێ بێڵن و دوێنێ ڕۆژی ٨ی... گەیشتنە بنکەی هێز. هەروەها عەینی ڕۆژ ٩ بنەماڵەی تر لە کەرکووک دەرکران... هێزی بێتواتە رای گەیاند هێزێکی زۆری دوژمن نیوەشەوی ٧ی ئەم مانگە هێرشیان کردە سەر بنکەکانی ئێمە لە گوندی بەردانگە. ئەم هێرشە لە لایەن پێشمەرگەکانی بەتالیۆنی یەکەوە پاش چەند سەعات شەڕی سەخت پێشی پێ گیرا و دوژمن ناچار کرا دوای زیانێکی زۆر پاشەکشێ بکاتەوە بۆ شوێنەکانی پێشووی.

## باسی لەیلایان بۆ کردووی؟

بەیانیی ڕۆژی دوایی داوام کرد بمبەنەوە سەر سنوور، پێیانم وت من دەبێ ڕیپۆرتاجەکەم لەوێوە دەست پێ بکەم. - دوێنێ ئێمە زۆر بە پەلە لەوێوە تێ پەڕین بەڵام من لە گشت لایەک ئاوارەم بینین لە چادر و کۆخی ساکاردا دەژیان:

من دیمەنێکی ناڕوونی ئەو خەڵکەم لەپێش چاوانە، دەمەوێ بگەڕێمەوە و بە تەواوی لێی دڵنیا بم. ئەو دیمەنە دڵتەزێنەی خەڵکی دەربەدەر و ئاوارە، کە لە ئینجیلدا باسی دەکرێ. دەبێت سەردەمی مووساش هەر وا بووبێت، نزیکەی هەموو کاتێک لەم بەشەی دنیادا هەر وا بووە، لێرە هەمیشە مرۆڤەکان ئاوارە بوون، هەردەم ناچار کراونماڵەکانی خۆیان بەجێ بهێڵن و ڕوو لە چارەنووسێکی نادیار، ڕێگە بگرنە پێش.

ئەحمەد، یەکێک لەو قوتابییە گەنجانەی "وەزارەتی" ڕۆشنبیری لەگەڵمدا دێت بۆ سنوور. ئەو تەمەنی ٢٣ ساڵە و خۆرتێکی زۆر تێ گەیشتووە. هەرکە خوێندنەکەی لە زانستگەی بەغدا تەواو بوو بەرەو کوردستان کەوتە ڕێ، زۆربەی هاوڕێ و دۆستەکانی وی لە کوردستانن و بۆ خۆشی تەنیا دوو حەفتەیە تێکەڵی شۆڕش بووە. ئەحمەد دەڵێ:

- ئێستە زیاتر لە نەوەد لە سەدی قوتابییە کوردەکانی بەغدا لێرەن. ئێمەش هەوڵ دەدەین بەشی خۆمان یارمەتیی برازوکە بدەین، ئێمە لە دژی چەتە و باندەکانی دەوڵەتی عێراق خەبات دەکەین. ئەرێ بە ڕاست تۆ لەم ماوەیەدا لێرەمیت باسی لەیلایان بۆ کردوویت؟ ئەو کچێکی ٢١ ساڵە بوو، لە مانگی نیسانی ئەمساڵدا لە بەغدا گیرا و دارکاری کرا و هەڵواسرا. ئەو

کچە کوردێک بوو دەوڵەتی عێراق لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر هەڤاڵی تری مندا کوشتییان.

بە دەم قسەکردنەوە، من و ئەحمەد گەیشتینە سنوور. ئاوارەکان لە لای سنوور ماونەتەوە، ئێستە ژمارەیان نزیک ٣٠٠٠ هەزار کەسە کە بە شێوەی مامناوەنجی هەر بنەماڵەیەک شەش - حەوت و ماڵی واش هەیە تا دوازدە منداڵی هەیە. ئەمانە لەو گوندانەوە دێن کە لە لایەن سوپای عێراقەوە بۆمباران و پاشان داگیر دەکرێن، ئێستەش لێرەن تا دەرگەی سنووریان لێ بکرێتەوە و بچنە ناو خاکی ئێران بۆ ناو کامپی پەنابەران. مەیلەو سەرجەمی ئەم خەڵکە ژن و منداڵن، پیاوەکانیان گشت لە بەرەی شەڕدان. یەکێک لە بەرپرسانی پێشمەرگە دەڵێ:

- ئێمە هەموو ئەوانەی دەگەنە ئێرە ناونووس دەکەین و هەموو ڕۆژێکیش دەستەیەکی تازە دەگەن. لەپێشدا دەبێت کاربەدەستانی ئێرانی بڕیار بدەن کەی ئەمانە دەتوانن دەرباز بن، دەبێت لەپێشدا چادرەکانیان بۆ ساز بکرێن. هێندێک لەم خەڵکە سێ مانگە بەم دۆخە خراپەوە لێرە چاوەڕوانن تا بزانن کەی دەتوانن لەم سنوورە دەرباز ببن. ئێمە لێرە دوکتۆرێک و نەخۆشخانەیەکی بچووکمان هەیە و هەوڵ دەدەین خواردنیش بۆ ئەم خەڵکە دابین بکەین، بەڵام فەرمیەک لەم ئاپۆڕەیە تەنانەت چادریشی نییە تێیدا بخەوێ و ڕۆژانە منداڵی ساوا لەبەر سەرما و سۆڵە لەپێش چاوی ئێمە و باوک و دایکیاندا دەمرن.

ئەم لێقەوماوانە لێرەش لە ترسی فڕۆکە شەڕکەرەکانی عێراق چاڵیان هەڵکەندووە (کونە تەیارە)، تا خۆیانی تێدا حەشار بدەن و بەر بۆمبای تەیارە نەکەون. لە تەنیشت ئەم حەشارگەیانەشەوە چاڵێکیان هەڵکەندووە و بە گڵی سوور (تەندوور) سافیان کردووە تا لەو نانە ناسکە کوردییەی لێ ساز کەن و من، کە هەوڵ دەدەم سەری قسە لەگەڵ دەستەی ئەو ژنانە،

بکەمەوە کە هێندێک منداڵیشیان بەدەورەوەیە و لە لای ئەو ئاگرانە دانیشتوون و خەریکی نانکردنن.

ئەحمەد خەریکی وەرگێڕانی قسەکانی هەردووک لامانە و زوو بۆم دەردەکەوێ بەسەرهاتی هەموویان وەک یەکە، شەڕ و بۆمباران ئەوانی ئاوارە کردووە، ئێستەش لێرە گیرساونەتەوە بەو هیوایە، دەرگەی سنووریان لێ بکرێتەوە و لەژێر ئاگری فڕۆکەی عێراقدا رزگاریان بێت:

– ئێمە لە گوندی باتاسەوە لە نزیک شەقڵاوەدا دێین. هەوەڵین جار فڕۆکە هاتنە سەرمان پێش سێ مانگ بوو، چەندین جاری تریش هاتنەوە و ٢٠ – ٣٠ کەسیان لێ کوشتین و زیاتر لە دوو مانگیشە لێرە چاوەڕوانین.

– ئێمە لە گوندێکی نزیک هەولێرەوە دێین، سێ مانگە لێرەین، منداڵەکەمان لێرە لەدایک بووە. ئەوەی ئێمە بزانین تا ئێستە دوو منداڵ لێرە مردوون.

– پیاوەکەی من لە بەرەی شەڕە، من ئێستە ٣ منداڵم هەیە، دووان لە منداڵەکانم لێرە مردوون.

من دەتوانم ماوەیەکی درێژ لەگەڵ ئەم خەڵکەدا ئەم باسە درێژە بدەم بەڵام ئەحمەد بۆی زەحمەتە لەم هەموو تاوانە بگات و ئەوانیش بۆیان سەختە باسی هەموو ئازارەکانیان بکەن. منداڵەکانیان هەڵدەگرن و هەوڵ دەدەن روو بە کامێراکەی من بە بزەوە دەرکەون.

لەپێش کەپرێکدا، کە بە دوو بەتانی ساز کراوە پیاوێکی پیر دانیشتووە و خەریکە چەقۆیەک بە بەردێکدا دێنێ و تیژی دەکاتەوە. ئەویش لە ئاواییەکی بۆمبارانکراوەوە دێت. ئەو دەڵێ ژنەکەی کە ئەویش زۆر بەتەمەن بوو لەوێ کوژراوە و منداڵێکیشیان لە دوا نەماوە. من دەپرسم مامە ئەگەر ئێستە گەنج بوایەی ئەتۆش پێشمەرگە بووی؟

– بێگومان. هەڵبەت منیش پێشمەرگە بووم و لەو شوێنەش بووم کە چەکە

دژە فڕۆکەکانی لێیە تا یەکێک لەو فڕۆکانە بخەمە خوارەوە. بە پێکەنینەوە چەقوە کۆنەکەی بە دەستەوە دەگرێ و ڕوو لە ئاسمان بە نیشانەی هەڕەشە بەرزی دەکاتەوە.

منداڵ بە ناو چادر و کەپرەکاندا دێن و دەچن و بۆ خۆیان خەریکی گەمەن. هێندێکیان کۆمەڵێک ئامرازی یارییان بۆ خۆیان لە کوتە ئاسنان ساز کردوون پێیانەوە سەرگەرمن. بایەکی سارد لە باکورەوە هەڵی کردووە و بە پێی ئەزمـوون زۆریش ناخایەنێ وەرزی بەفـر و بارانیش دەست پێ بکەن. لە یەکێک لە بەرپرسەکان دەپرسم باری ئەمانە - لە وەها دۆخێکدا، چی بەسەر دێ؟

بەرپرسی کەمپەکە پێش ئەوەی بێتە ناو شۆڕش ئەفسەری پۆلیس بووە دەڵێ:

- ئەوان دەبێت پێش ئەوەی دۆخەکە بگاتە ئەو جێگەیە لێرە بڕۆن. ئێمە هەوڵ دەدەین هەرچییەک زووتر کێشـەی کرانەوەی سنووریان لە لای ئێرانییەکانەوە بۆ چارەسەر کەین و لەوە زیاتر لە دەستی ئێمە نایەت. بۆ خۆت دەزانی هەر ڕۆژە دەستـەیەکی ئاوارەی نوێ دەگەن و هەر ئێستـە دۆخەکە مەترسیدارە، جا ئەگەر بێتو بگاتە زستان، بێ شک هەموو لێرە لە سەرما و لە برسانە دەمرن.

من لەبەر خۆمەوە دەڵێم ئەمە لە گشت شەڕێکدا هەر وایە، زیاتر ژن و منداڵان زیانمەند دەبن. پیاوەکان لە بەرەی شەڕدا هێندە ئازار نابینن. بەڵام کاتێک لەگەڵ ئەم خەڵکەدا قسە دەکەم دەبینم کەسیان بۆڵە و گلەییەکی لە دۆخەکە نییە. بە پێچەوانەوە ئەم شەڕە وەک مەرجی مانەوەی خۆیان دەبینن و هەرچییەک تاوانی دەوڵەت زۆرتر دەبێ بڕوای ئەوانیش وەک شـاخ و کێوەکانیان مەحکەم و پتەوتر دەبێت. ئەوەی کە دەوڵەت گوندەکانی ئەوانی بۆمباران و وێران کردووە، شەوانە پۆلیس هاتوون و ئەوانی لە ماڵەکانیان

وەدەر ناوە، تۆپخانەی دەوڵەت ماڵ و حاڵی تێک داون، هەموو ئەوانە تەنیا وەی ئەوانی بەرزتر و رقی لە دەسەڵات و دەوڵەت زیاتر کردوون. ئەمانە کاتێک ناوی دەوڵەت دێنن رقێکی تایبەت لە تۆنی دەنگیاندا هەست پێ دەکرێ، فڕۆکەکانی دەوڵەت گوندەکانی وێران کردن، سەربازی دەوڵەت ئەوانی دەربەدەر کرد، پۆلیسی دەوڵەت ئەوانی راو نا و... بەم شێوەیە دەوڵەت و تاوان لای ئەمانە بوونەتە یەک.

هێندێک لە منداڵەکان کاڵ و چاوشینن، ژنەکان سەر و شکڵیان جوان و رێکوپێکە. ژنێکی جوان، کە دایکی سێ منداڵە سەرنجم رادەکێشێ. بە خۆم دەڵێم ئەگەر من ئەم ژنە، لە سوێد بە جلوبەرگی خۆمانەوە ببینم قەت ناتوانم بڵێم ئەمە ژنێکی بێگانەیە. ئەو زۆر جوانە و بۆ من دژوارە، کە ڕابردوو و دۆخی ئێستەی بێنمە پێش چاو - ئەوەی کە ئەو قەت نەیتوانیوە فێری خوێندن و نووسین بێت، ژیانێکی بە پێوانەکانی ئێمە (بەڵام تەنیا بە پێوانەکانی ئێمە)، دواکەوتووانە دەباتە سەر. بۆ من دژوارە لە ژیانێک کە ئەو بردوویەتیە سەر تێ بگەم، کەچی سەر و سیما و رەنگی قژ و چاوەکانی، کە جیاوازییان لەگەڵ ژنێکی ئەوروپاییدا نییە و وەک خۆشی کەسێکی ژێر دێتە بەرچاو، بە هیچ شێوەیەک پێکەوە ناگونجێن. من لە ناخی خۆمدا هێندێک لەو بیرکردنەوەی خۆم هەست بە شەرم دەکەم. بەو حاڵەش کاتێک وەرگێڕەکەم ئەحمەد لێم دەپرسی، کە بیر لە چی دەکەمەوە بۆی دەدرکێنم و ئەحمەد لە وەڵامدا ئێژێ:

- زۆر سروشتییە، ئێمە ئارییایین، راست وەکو تۆ. ئێمە عەرەب نین، ئێمە ئارییایین و بە زمانێکی هیندۆ ئەوروپایی قسە دەکەین.

ئەو لە کاتی دەربڕینی ئەم وتەیەدا هەست بە باری نێگەتیڤ و بیرۆکەی رەگەزپەرستی لە وشەی "ئاری"دا ناکات، تەنیا خۆشحاڵە، کە لەم بارەوە ئیمکانی بۆ رەخسا تا ئەم زانیارییە بداتە من، کە بۆ ئەو چەندە گرینگە من

بزانم ئەو عەرەب نییە. رەنگە ئەو پێی وابێ ئەم زانیارییە بە شێوەیەک سۆزی من - بۆ کورد - زیاد بکات. وە یان رەنگە منیش، بێ ئەوەی بە خۆم بزانم لەو چوارچێوەیەدا هەڵسوکەوت بکەم.

لە گەڕانەوەمدا ئەحمەد من دەبات بۆ شوێنێک لە حاجی نۆمەران، لەوێ کۆمەڵێک هونەرمەندی کورد، لەسەر پارچەیەکی گەورەوە خەریکی کێشانی وێنەن. لە وێنەکاندا هێندێک پێشمەرگەی چەک لە شان و کۆمەڵێک گوندی وێرانکراوی ژێر بۆمبا دەبینرێن، لەگەڵ وێنەکانیشدا دروشمی شۆڕشگێڕانە نووسراون.

لە یەکێک لە تابلۆکاندا لەیلا - ئەو کچەی لە بەغدا هەڵواسرا، دەبینم. بە تەواوی سەرنجم رادەکێشێ. دیمەنی یەکەم وێنەیەکی ناڕوونی ژنێک پێشان دەدات، کە سەربەرزانە بەرەو سێدارە هەنگاو دەنێ و لە دووەمین دیمەندا پەتی سێدارە لە مل، بە هەڵواسراوی دەبینرێ.

پاش نیوەڕۆکەی داوا دەکەم دوکتۆر مەحموود، یەکێک لە ئەندامانی مەکتەبی سیاسی ببینم. ناوبراو پزیشک و بەرپرسی "بەش"ی تەندروستییە. هاوکات یەکێکە لە رێبەرانی شۆڕش و لە سەرەتاوە تا ئێستە لەگەڵدا بووە.

شوێنی دیداری من لەگەڵ دوکتۆر عوسماندا کونەبەردێکە، کە بە شێوەیەک داپۆشراوە من تا بە تەواوی نزیک نەبمەوە و کەسێک دەرگەیەکم پێشان دەدات هەست بەوە نەکەم ئەمە جێگەی مانەوەی کەسێکە. مەحموود پیاوێکی ئارام و وردبینە. بیری ورد و هۆشی تیژی دەبنە هۆی ئەوە سەرەڕای ماندوویی، بریسکەی چاوی بێت. ئەو بە باشی و رەوان ئینگلیزی قسە دەکات، وشەکانی زۆر بە سەرنجەوە هەڵدەبژێرێ و بچووکترین گومان لە وتەکانیدا نیشان نادات. یەکەم پرسیارم بەم شێوەیە دەست پێ دەکەم:

من تەنیا شەو و رۆژێکە لێرەم، بەڵام هەر لە ئێستەوە تێ گەیشتووم، کە کوردستانی عێراق راست وەک وڵاتێکی سەربەخۆ کار دەکات. چۆنە ئێوە

تەنیا باسی ئۆتۆنۆمی دەکەن؟ راستی مەسەلەکە وا نییە کە ئێوە پێتان خۆشتر بێ خاوەنی دەوڵەتی سەربەخۆی خۆتان بن؟

– من لە دنیا نەتەوەیەک شک نابەم ئاواتی سەربەخۆیی نەبێت، بەلام پارتی دیموکراتی کوردستان پارتییەکی عێراقییە. ئامانجی ئێمە ئۆتۆنۆمی لە چوارچێوەی عێراقدایە. ئەمە هەڵەیە ئینکاری ئەوە بکەین، کە هەموو کورد سەربەخۆییان ناوێ، بە پێچەوانەوە. بەلام ئەمە تەنیا بۆچوونی کەسانیی منە و بۆچوونی پارتی ئەوەیە داوای شتی ناسبەجێ نەکەین. ئێمە هیچ پێوەندییەکی سیاسیمان لەگەڵ ئێران و تورکیادا نییە، ئێمە تەنیا لەناو عێراقدا کار دەکەین.

بەلام ئەمە چۆن ئەبێت؟ چۆن دەتوانن بگەنە ئەم ئامانجە؟

– دوو جێگرەوە هەیە، یان لە ڕێگەی ئاشتییەوە، کە مانای ئەوەیە ئێمە بە شێوەیەکی یاسایی دەبینە خاوەنی ئۆتۆنۆمی لە چوارچێوەی عێراقدا، یان جیابوونەوەیەک کە بە شێوەی "دیفاکتۆ" مەیلەو وەک ئێستە هەیە. دیارە ئەلتەرناتیڤی دووەم لە یەکەمیان زۆر مەترسیدارترە بۆ گشت عێراق. ئەگەر ئەوان لە بەغدا ژێر بن دەبووا تێ بگەن، کە چارەسەری سیاسی تەنیا یەکەتیی عێراق بەهێز دەکات، ئەوکات کورد رازی دەبوون و نەتەوەی عێراقیش بەهێزتر.

بەلام چی رووی دا؟ بۆچی شەڕ دیسان هەڵگیرسایەوە؟

– وتووێژ گەیشتبوونە ئاستێکی لاواز، باشتر وا بوو دیسان درێژەیان پێ بدرێ بەڵکو رێککەوتنێک بە دەست بێ، بەلام دەوڵەتی عێراق ریالیست نییە. بەجێی ئەوە کردەوەی سەربازییان دەست پێ کردەوە. هەر لە مانگی کانوونی یەکەوە بریاری دەست پێکردنەوەی شەڕیان دابوو و لە کۆتاییەکانیشدا دانیشتنەکان لە لایەن دەوڵەتەوە ئەسڵەن جیدی نەبوون. ئەوان زیان و گورزەکانی پێشتری شەڕیان لە بیر کردبوو و پێیان وا بوو بە

هێرشی سەربازی ئێمە لەناو دەبەن. بەڵام ئەوان لەم ڕێگەیەدا سەرکەوتوو نابن. ژمارەیەکی کەم کورد هەن هاوکاریی ئەوان بکەن و ئێستە لە هەر کاتێکی تر زیاتر لە لایەن خەڵکی کوردەوە دابڕ کراون.

بەڵام نەوت، ڕۆڵی نەوت چییە لەم کێشەیەدا؟

– نەوت بە جۆرێک ڕۆڵی هەیە. یەکێک لە دەلیلە هەرە گرینگەکانی ئەم شەڕە نەوتە. ئێمە پێشنیازمان کردووە دەوڵەتی ناوەندی کاری دەرهێنان و فرۆشتنی نەوتی لە ئەستۆ بێت، بەڵام لەبەر ئەوە نەوتەکە لەناو خاکی کورددایە ئێمە لامان وایە دەبێت نەوتی گشت خەڵکی عێراق بێت نەک وەک ئەوە ئێستە دەوڵەت داهاتی نەوت بۆ شەڕێک تەرخان دەکات کە وڵاتەکە وێران و خاپوور دەبێ. دروشمی ئەوان ئەوەیە "نەوتی عەرەب بۆ عەرەب" بە بڕوای ئێمە ئەمە خۆی جۆرە هاندان و ڕاچڵەکاندنێکە دژی خەڵکی کورد.

شەڕەکە چۆن دەڕواتە پێشەوە؟

– ناوچەی وا هەیە کۆنترۆڵی بە تەواوی لە دەست ئێمەدایە، ناوچەی واش هەن ئێمە تێیاندا شەڕی پارتیزانی دەکەین. ئەوان چەکی گران، کە لە رووسیاوە پێیان دەگات لە دژی ئێمە بەکار دێنن. بەو حاڵەش زیانی گەورە بەر ئەوان دەکەوێت. ئێمە لەم ماوەیەدا هێندێک ناوچەمان لە دەست داون، بەڵام ڕوونە کە دۆخەکە لە قازانجی ئەواندا ناڕواتە پێش. فاکتەرێک لەم بارەوە ئەوەیە، کە ئەو ناوچانەی دەکەونە چنگ ئەوان بە تەواوی چۆڵن و خەڵکی تێدا نامێنێ. دوای داگیرکران خەڵکەکەی تێکڕا هەڵدێن بۆ لای ئێمە. ناوچەی بێ خەڵک هیچ مانایەکی نییە، هەروەها ئەمەش دەردەخات، کە چۆن خەڵکی کورد لەوان دوور کەوتووەتەوە. ئێمە گەلێک گرفتمان لەسەر ڕێگەدان، ئەمە ڕاستییەکە، بەڵام خەریکین کێشەکان چارەسەر کەین. ئاوارەکان گەورەترین گرفتی ئێستەی ئێمەن. ئەوانە دەبێت شوێنێکیان بۆ ژیان لە زستاندا بۆ دابین بکرێ، ئەوان ماڵ و حاڵیان لێ تێک چووە و ناچار

کراون روو لە ئێران بکەن. ئێمە پێویستمان بە یارمەتیی مرۆیی هەیە و بە داخەوە دنیا لە حاست داواکاریی ئێمەدا کەڕە.

چوارسەد هەزار کەس ناچار کراون ماڵ و حاڵیان بەجێ بێڵن و ڕێگەی ئاوارەیی بگرنە پێش. ئێران هاوکاریی ئێمە دەکات و ئەوانیش، واتا ئێرانی قازانج و بەرژەوەندیی خۆیان لەمەدا هەیە، ئێمە پشتیوانیی ئەوانمان هەیە.
د. عوسمان درێژەی دەدات و دەبێژێ:

مەترسیی لەبەینچوونی ئێمە زۆر لاوازە، زستان لە ڕێیە و لە وەرزی بەفردا تانکەکانی ئەوان، کە چەکێکی کاریگەری ئەمڕۆی ئەوانە، ناتوانن وەک پێویست بجووڵێنەوە.

تۆ دەبێت بزانی کە هەڵواسین لە عێراقی ئێستەدا وەک ئاوخواردنەوە وایە. ڕێژیمێکی وا ناتوانێ بۆ ماوەیەکی زۆر بژی، درەنگ یان زوو سەروژێر دەبێت و دەڕووخێ.

من پاش دیداری دوکتۆر عوسمان، بۆ لای تەحسین بەگ میری ئێزیدییان وەڕێ دەکەوم. من پێشتر قەت ناوی ئێزیدییانم نەبیستووە. ئێستە، کاتێک لێرە خەریکی نووسینی ئەم کتێبەم لە فەرهەنگێکدا بە دوای وشەی ئێزیدیدا دەگەڕێم و دەبینم نووسراوە:

ئێزیدی عەشیرەتێکی کوردن لە عێراق لە لای مووسڵ، هێندێکیان لە کێوەکانی کوردستان، باکوری ڕۆژاوای مووسڵ و هێندێکیشیان لە شاخەکانی سنجاردا نیشتەجێن. ئاینەکەیان تێکەڵاوێکە لە مەسیحییەت، جوولەکە و موسڵمان و هێندێک ئاینی کۆنی ناوچەکە... ئێزیدییەکان، کە زیاتر بە شەیتانپەرست ناودێر دەکرێن هەر لەمێژەوە کەوتوونەتە بەر هێرشی زاڵم و زۆردارانی ناوچەکە و، بە شێوەی جۆرەوجۆر ڕاوەدوو نراون. هەژماریان لە گەلێک کۆمەڵکوژیی جۆرەوجۆر لە ساڵەکانی ١٧٠٠ و ١٨٠٠دا کەم بووەتەوە.

تەحسین بەگ میری ئەوانە. بەو جۆرەی من تێ گەیشتووم مانای میر وەک شازادەیە و تەحسین بەگیش لەناو ئێزیدییەکاندا ئەو پلە و پایەیەی هەیە، کە پاپ لەناو کاتۆلیکاندا هەیەتی. میر تەحسین دوای ئەوە پێوەندیی کرد بە شۆڕشەوە لێرە، لە چۆمان دەژی و من لەو شوێنەی، کە بە شێوەی کاتی بۆی ساز کراوە دەیبینم. لەو دەمەی من رۆیشتم ئەو رازا بوو و ناچار مام تاوێک راوەستم تا لە خەو هەستا. سەرحاڵ و مێزەرێکی شل و وڵ لە دەوری سەری، راست وەک "پاپ"ێکی رەسەن دێتە بەرچاو. زۆر نەجیبە و ئینگلیزییەکی جوان قسە دەکات. لەبەر ئەوە من ناچار بووم راوەستم تا ئەو دێت، داوای لێبووردنم لێ دەکات. چام لەپێش دادەنێ و ئامادەیی خۆی بۆ وەڵامدانەوەی پرسیارەکانم پێشان دەدات. میر دەڵێ:

- نزیک بە (١٠٠,٠٠٠) ئێزیدی لە عێراق دەژین، لە رووسیا سەد و سی هەزار، لە تورکیا پەنجا هەزار و لە سووریا چل هەزار. کەوا بوو ژمارەی ئێزیدییەکان زیاتر لە (٣٠٠,٠٠٠) سێسەد هەزارە.

ئەو میرایەتیی لە باوکیەوە بۆ بە میرات ماوەتەوە. بە وتەی میر دوو - سێ هەزار ساڵە ئەم ئاینە هەیە و لەو کاتیشەوە میرایەتی وەک میرات بۆ کەسەکان بەجێ ماوە.

- دینی ئێمە دینێکی کەونارایە، بەڵام ببوورە، بۆم نییە زۆرترت بۆ باس بکەم. ئەمە نهێنییەکی گشتیی ئێمەیە. سروشتییە ئێمە بڕوامان بە خوا هەیە، بەڵام زیاتر بۆم نییە باس بکەم.

- ئەوەی کە رێبەری ئاینی ئێزیدییەکان بیت، بۆ تۆ چی مانایەک دەدات؟

- من کۆمەڵێک ئەرکم لەسەر شانە وەک ئەوە کە چاودێریی جێبەجێبوونی یاسا ئاینییەکانی خۆمان بکەم. ئەگەر کەسێک سنووری یاساکانی بەزاند ئەرکی منە حوکمی بەسەردا بدەم. بۆ نموونە پێوەندیی زایەندی لە ژیاندا، یان کەسێک حاشا لە بوونی خوا بکات. شتی لەم چەشنە بە لادانی گەورە

دێنە ژمار. تەحسین بەگ درێژەی دەدات:

ئێزیدی چەند هۆزی جیاوازن و ژیانێکی ساکار دەبەنە سەر. پێشتر بە زۆری کۆچەر بوون بەڵام ئێستە نیشتەجێن و لە شار و گوندناندا دەژین. نەریتی چەندژنی ئاساییە لەناو ئێمەدا و دینەکەمان سنوورێکی بۆ ژمارەی ژن دانەناوە، بەڵام زۆربەی پیاو بە سێ ژن رازی دەبن. دیارە ئەمە زۆرە و من خۆم ئەگەر کاتی گەنجی ژیرانە بیرم بکردایەتەوە بە تەنیا یەک ژن رازی دەبووم.

کاتێک من لێی دەپرسم ئەو چەند منداڵی هەن دەڵێ:

– پێم وایە دە... ، یان دوازدە.

میر بە وتەی خۆی وەک شوێنەکانی تر زەکاتی تایبەتی "کڵێسا" لە خەڵک وەرناگرێ، بگرە موریدەکانی دڵخواز یارمەتیی دەدەن:

– من هەموو شتێک بۆ خۆم هەڵناگرم، زۆربەی دەرواتە بۆ پەرستگەی خۆمان. من بەشی ئەوەندەم هەیە خۆم بەڕێوە ببەم.

میری ئێزیدییان ساڵی ١٩٦٩ تێکەڵی شۆڕش بووە:

– من بڕوام بە بناخەکانی ئەم شۆڕشە هەیە. بەڵام ئەمە هیچ پێوەندیی بە ئاینەوە نییە. من کوردم، هەموو ئێزیدییەکان کوردن. بۆیە من تێکەڵی ئەم شۆڕشە بووم چونکە شۆڕشێکی کوردییە.

هەموو ئێزیدییەکانی عێراق لەگەڵ شۆڕشدان؟

– نا، بەڵام ئەمە تەنیا پێوەندیی بەوەوە هەیە هێشتا ئەو پێویستییە نەهاتووە هەموو چەک هەڵگرن. من هێشتا داوای وام لێ نەکردوون، بەڵام بێت و من ئەو داوایە بکەم نەوەد و پێنج لە سەدیان ئامادەن بەشدار بن. لەم ڕۆژانەدا بیست ئێزیدی لە مووسڵ لە لایەن دەوڵەتەوە هەڵواسران.

لە زۆر لاوە هەوڵی فریودانی میری ئێزیدییان دراوە:

– دەوڵەت هەوڵی داوە من بۆ لای خۆی راکێشێ. زێڕ و پارەی زۆریان بۆ پێشنیاز کردووم بەڵام من پرەنسیپەکانی خۆم بە پارە نافرۆشم. من شتێکم لەگەڵ بەعسییاندا نییە. من نامەوێ وەک ناپاکێک بژیم. من جەنەراڵ بارزانی وەک رێبەر و خەباتکارێکی مەزن دەبینم. ئەو هەموو ژیانی فیدای گەلی خۆی کردووە. ئەو مرۆڤێکی پاک و خاوەن بڕوایە.

میر لە درێژەدا دەڵێ:

– من پارەکە لە ستۆکهۆڵم بووم، لەو سەفەرەدا دەورێکی ئەورووپام دایەوە و دوو شەو لە ستۆکهۆڵم مایەوە. لە هۆتێلێک مایەوە ناوەکەی چی بوو... ئاها گراند هۆتێل.

مانگایەک بە پێشماندا تێپەڕ دەبێ و میر بێ ئەوەی گرینگیی پێ بدات درێژە دەداتە باسەکەی:

ئێمە لەم شەڕەدا سەر دەکەوین چونکە ئێمە بۆ مافێکی رەوا خەبات دەکەین، هەموو نەتەوەکانی دنیا خاوەنی مافەکانی خۆیانن، بۆ دەبێت نەتەوەی کورد لەو مافانە بێبەش بێ؟

میری ئێزیدییان بە شێوەیەکی سەیر تێکەڵاوە لە کۆن و نوێ، دواکەوتوویی و شتی مۆدێرن. رێبەری رۆحی ئاینێکی پڕ لە رەمزی هەزاران ساڵەیە، کە پەیڕەوانی پێک هاتوون لە چەند عەشیرەتی هەژار ژیانیان بە کشتوکاڵی بچووک و شوانی لە کێوەکانی کوردستاندا بەڕێوە دەچێ. بەڵام خۆی مەیلەو لە سیاسەت شارەزایە و بڕوایەکی پۆڵاینیشی بە پشتیوانیی ئەم شۆڕشە هەیە و دوور نییە شارەزاییشی لە ساڵۆنەکانی "گراند هۆتێل" لە ستۆکهۆڵم کەمتر نەبێ لەم ماڵە ساکارەی خۆی لێرە لە چۆمان.

ئێوارە دوای نانخواردن، لەگەڵ ئەحمەد، سەعدوڵلا، خوران (سۆران؟ وەرگێڕ) و هەندێکی تر لەو کوڕە گەنجانە، کە وەک وەرگێڕ لێرە خزمەت دەکەن، لە دیوەکەی خۆم دانیشتووم. دیوەکە مەیلەو تاریکە، لە کوردستان

جگە لەو جێگەیەی رادیۆ و نەخۆشخانەی لێیە کارەبایەک لە گۆڕێدا نییە. چراقوتوویەک لە دیوەکەیە، کە رووناکییەکەی راست لە میچەکە دەدات و تۆزێک رووناکی دەداتە دیوەکەی ئێمەش. روو دەکەمە کورەکان و دەڵێم دەمەوێ زۆرتر لەبارەی لەیلاوە بزانم. ئەحمەد دەڵێ:

– چیت دەوێ بزانی؟

هەموو شتێک، دەمەوێ هەموو شتێک بزانم. هەموو ئەم کوڕانە لە نزیکەوە لەیلا دەناسن، بۆیە پێکەوە هاوکاریی دەکەن تا ئەوەی دەیزانن بۆ من باسی بکەن:

– ئەو لە کۆلێجی زانستگەی بەغدا بەشی سۆسیۆلۆجی دەیخوێند. لەگەڵ بنەماڵەکەی، کە ماڵێکی مامناوەندی بوون دەژیا. لەیلا لە خانەقین لەدایک بوو بەڵام بەشی زۆری تەمەنی لە بەغدا بردە سەر، کاتی شەهیدبوون ٢١ساڵی بوو. باڵای بەرز و باریک، قژی زۆر کاڵ، چاوی رەش بوون. جوان بوو بەڵام هێندەش نا، کە سەرنجی خەڵک بۆ لای خۆی راکێشێ. ئەندامێکی زۆر چالاکی یەکەتیی قوتابیانی کوردستان بوو. سەرپەرشتیی ئەو دەورە و کۆرسانەی دەکرد، کە لەسەر کولتووری کوردی بەڕێوە دەچوون و لە زۆر شوێنان قسەی بۆ خەڵک دەکرد. قەت نەدەترسا، دەیزانی کە بەم کارانەی خۆی کاربەدەستانی دەوڵەت تووڕە دەکات، بەڵام قەت ترسی نەدەناسی.

سەرەنجام شەوێک لە لایەن پۆلیسەوە گیرا، دوای نیوەشەو بوو و لە سەریەک پێنج قوتابیی گەنج گیران. هەوەڵ دوو کوڕ لە هۆتێلێک لە بەغدا گیران، ئازاد سلێمان و رەشاد سەبری. شەوی دوایی لەیلا و سێیانەکەی تر گیران. ئەوان هەمیشە پێکەوە بوون و پێکەوە کاری سیاسییان دەکرد. ئامانجی ئەوان کوردستان و یەکگرتنی کورد بوو. ئەوان قەت کارێکی خراپیان ئەنجام نەدابوو بەڵام دوای گیران تۆمەتی خراوکارییان لێ درا و بێ موحاکەمە حوکمی هەڵواسینیان بەسەردا سەپا.

یانەیەک لە بەغدا هەیە ناوی مەنسوورە. لە رواڵەتدا شوێنی کۆبوونەوەی چینە باڵادەستەکان و رێبەرانی حزبی بەعسە، بەڵام هەمووان دەزانن، کە لە پشت ئەو شوێنەوە زیندانێکی تاریکە، کە نارازییانی تێدا دارکاریی بێ بەزەییانە دەکرێن. تا ئێستە هەزاران کەس لەوێ لەژێر دارکاریدا مردوون. خەڵکی ناوی ئەو جێگەیەیان ناوە "کۆشکی کۆتایی". ئەو شەش کوردە گیراوە لە شوێنێکی نهێنی بۆ ماوەیەک راگیران بەڵام دوای وشاری زۆر دەوڵەت ناچار بوو ئەوان بێنێتە سەر تەلەفزیۆن، وەک خراپکار و تاوانبار پێشانیان بدات و پاڵەپەستیان خستە سەر لەیلا نامەی پەشیمانی بنووسێ بەڵام ئەو نەچووە ژێر باری زوڵمی ئەوان و بەو شێوەیە لەیلا بوو بە یەکەم ژن لە عێراق لە سێدارە بدرێ.

دیارە لەگەڵ ئەودا، کوڕێکیش بە ناوی جەواد لە سێدارە درا. بە پێچەوانەی ئەوانی تر جەواد قوتابی نەبوو، کوڕە کرێکارێکی ساکار بوو. ئەو و لەیلا ئەویندارى یەک و هەردەم پێکەوە بوون. سێ دانەی تر لە کوڕەکان دوای دارکاری و ئازار هەڵواسران و ئەم رووداوەش مێژووی ١٣ی مانگی ئایاری ١٩٧٤ بوو.

قەولیان بە بنەماڵەکانیان دابوو پێش هەڵواسین و بۆ دواجار بتوانن کوڕەکانیان ببینن بەڵام کاتێک بنەماڵەکان گەیشتن تەنیا تەرمی بێ گیان و دارکاریکراوی رۆڵەکانیان لەوێ بوو.

کەوا بوو ئەو پێنج قوربانییە برێتی بوون لە لەیلا و دەزگیرانەکەی جەواد، ئازاد، کە بەرپرسی قوتابیانی کورد بوو، نەریمان، کوڕێکی ئارام و جوانچاک و حەسەن کە هاوڕێی نەریمان بوو.

ئەحمەد دەڵێ:

– ئازاد باشترین دۆستی من بوو.

کەسی شەشەم، رەشاد سەبری هەڵنەواسرا، سەرەڕای ئەوە ئەویش وەک

پێنجەکەی تر بەشداریی چالاکییەکان بوو بەڵام رژێم پاش ماوەیەک ئازادیان کرد و بەم کارەش گەرەکیان بوو بێژن گوایا دادگە و موحاکەمەیەک لە گۆڕێدا بووە و ئەو بێ گوناه دەرچووە.

هەر ئەو شەوە لەیلا گیرا ۳۰ قوتابی هەڵاتن و خۆیان گەیاندە شۆڕش. ئەحمەد لەم بارەوە دەڵێ:

- زۆر دۆخێکی پڕ مەترسی بوو، پێش گیرانی لەیلا دەستیان پێ کرد، گەنجێک بە ناوی محەمەد رەشید بە شێوەیەکی گوماناوی کوژرا، تەرمەکەی لەسەر شەقام دیترایەوە. ئێمە تەرمەکەمان بردە نەخۆشخانەیەک بەڵام دواتر لە نیشاندانی تەرمەکە بە ئێمە و بنەماڵەکەی خۆیان پاراست. ئێمە دڵنیا بووین، کە کاری بەعسییەکانە بۆیە دوای ئەوە زۆر ترساین و نەماندەوێرا دیوەکانی خۆمان بەجێ بهێڵین.

لە دە رۆژاندا ١٤٠ کەسیان لە بەغدا گوللەباران کردن. ئێستە زۆربەی نزیک بە تەواوی قوتابییە کوردەکان هەڵاتوون و گەیشتوونەتە لای شۆڕش.

من ساتێکیش گومان لە راستیی داستانی ئەم کوڕە گەنجانە ناکەم، ئەوان ئارام و لەسەرەخۆ قسە دەکەن - ئەوان راستییەکی تاڵ و ترسناک ئاشکرا دەکەن. لە روانگەی ئەوانەوە دەوڵەت کۆمەڵێک چەتە و تاخمن و هیچی تر.

ئەوان گوێداریی بەشی عەرەبی رادیۆ کوردستان دەکەن:

- دیسان کوردێکی تر لە سێدارە دراوە، کوردێکی تر لەژێر دارکاریدا مردووە. هەموو رۆژێک وایە و ئەمە بووەتە شتێکی ئاسایی بۆ ئێمە.

نیوەشەو کاتێک من تەنیا چەند سەعات خەوتووم بە گرمەی هەور و چەخماخە وە خەبەر دێم، باران بەتوندی دەبارێ و من دەکەومە بیری ئەو خەڵکەی لەسەر سنوور گیریان خواردووە، بیری چادرە شڕەکانیان، منداڵە

هەژارەکانیان، کە لە گژەی با و تۆفی بەر سەرماوە بێ کەس و یاریدەرێک دەمرن.

چرا قوتووەکە هەڵدەکەم و تەلەگرامێک بۆ "لووتەر یەلپین" (بنکەی یارمەتیی لۆتێر) لە سوێد دەنووسم. - رەنگە لەبەر ئەوە ویژدانی خۆم کەڕ بکەم، رەنگە تەنیا بۆ ئەوە پەنجەرەیەک بۆ بێ توانایی خۆم بکەمەوە.

لە تەلەگرامەکەدا دەنووسم:

١٥٠٠٠٠ هەزار ئاوارەی شەڕ لێرەن، هەزاران کەس لەوان تەنانەت چادریشیان نییە بچنە ژێری. باران دەستی پێ کردووە و بەم زووانەش بەفر دەبارێ. ئێوە دەبێت کارێک بۆ ئەم خەڵکە ئەنجام بدەن.

بەیانی تەلەگرامەکە دەدەمە میشل و قەولی لێ وەردەگرم، کە بەرێی کات. قەرارە ئەویش بینێرێ بۆ ئێران و لەوێوە بەرێی بکەن بۆ شوێنی باسکراو.

## ئەو لە فڕۆکە دەترسێ

لە چۆماندا نەخۆشخانەیەک هەیە - ناوەندی تەندروستی بۆ گشت کوردستانی ئازاد - بۆ کەسی ناشارەزا دیتنەوەی نامومکینە. لەبەر ئەوە نەکەوێتە بەر هێرشی تەیارە دەبێت لە ئاسمانەوە نەبینرێ و مەیلەو لە زەویشەوە نەدیوە. ئەم جێگەیە پێش سێ مانگ، لە چۆلەوانییەک، لە دۆلێکی تەنگەبەر و لە نزیک دەربەندێکدا ساز کراوە. لە دەرەوەی دۆلەکە و لە لێوار ڕێگەوە تەنیا چەند مالی قوڕین هەن.

پێش دەست پێکردنەوەی شەڕ لە مانگی ئادار تەنیا دوو پزیشک لە سەراسەری کوردستاندا هەبوون. ئێستە ۹۵ دانەی لێیە. دوکتۆرەکان دوای بەرپابوونەوەی شەڕ بە لێشاو لە هەموو شوێنێکی عێراق و تەنانەت لە ولاتانی تریشەوە روویان لە کوردستان کرد. زۆربەی ئەم دوکتۆرانە لە ناوچە و نزیک بەرەکانی شەڕدا خەریکی خزمەتن، بەلام نەخۆشخانەی ناوەندیی چۆمان کۆمەلێک دوکتۆری باش و خاوەن بڕوانامەی جێ چاو و پسپۆڕی بە ئەزموونی لێیە، کە لەگەل دوکتۆرەکانی نەخۆشخانەکانی سوێد بەراورد دەکرێن.

هۆیەکەی تری ئەوە ئەم دەربەندە چۆلە بۆ شوێنی نەخۆشخانە هەلبژێردرا ئەوە بوو، کە ئاوی زولالی فرەوان و شوێنی هەلکەندنی مال لەناو بەردەکاندا هاسانتر بوو، کە مرۆڤ دەیتوانی حەشارگە و شوێنی پەنادانی برینداری لێ ساز بکات. سەرۆکی دوکتۆران خورشید دزەیی دەورێکی دەربەندەکە و نەخۆشخانەکەم لەگەلدا دەگەڕێ و بە وردی بۆم باس دەکات:

- ئێمە زیاتر لە ٤٠ تەختمان لێرە هەیە، لەوانە ١٥یان تایبەتی ژنانن.

پسپۆڕێکی نەخۆشیی دەروونی، دوکتۆرێک بۆ نەخۆشیی گشتی، دوکتۆرێکی منداڵان، یەکێکی تایبەتی ژنان، یەکێکی قوڕگ، لووت و گوێچکە، سێ پەرستار، دوو دەرماننناس، ئامبولانسێک و سێ دانە لاندرۆڤەرمان هەیە.

دوکتۆر دزەیی وا باسی نەخۆشخانەکەی دەکات وەک بڵێی قسە لە نەخۆشخانەیەکی زێدە مۆدێرن و لە دۆخێکی ئاسایی و دوور لە شەڕدا بکات، بەڵام بەشەکانی ئەم شوێنە تەنیا بە چادر و تەلیس لێک جیا دەکرێنەوە، کە قەرەوێڵەکان لە کن یەکدا ریز کراون. دوکتۆر دزەیی دەڵێ:

– دوێنێ گوندی وەرتێ بۆمباران کرا و ١١ کوژراو و ٢٠ بریندراوی لێ کەوتەوە. وەرتێ لە نزیک بەرەی شەڕە و نەخۆشخانەیەکی بچووکی لێیە، کە بەر کەوت و ژمارەیەک لە بریندارەکانی ئەوێش ئێستە لێرەن.

پێشمەرگەیەکی ١٨ ساڵە بە ناوی سەفیر مستەفا یەکێک لە بریندارەکانە. ئەو لە نەخۆشخانەکەی وەرتێ بە بریندراوی کەوتبوو و زۆری نەمابوو برینەکانی چاک ببنەوە و بگەڕێتەوە شوێنی خۆی کەچی دیسان بەر هێرشی فڕۆکە کەوتەوە و بۆ جارێکی تر بریندار کرایەوە. دەموچاوی پڕە لە پریشکە بۆمب بەڵام برینەکەی جێگەی مەترسی نییە، بە قسەی دوکتۆر دزەیی سەفیر شانسی هەبووە کوێر نەبووە.

برینی هیچ کام لە بریندارەکان وا نایەنە پێش چاو مەترسیدار بێت، زۆربەیان لەسەر تەختەکانیان دانیشتوون و حاڵیان باش دیارە. بەڵام کەسێکیان لەسەر دۆشەکەیەک درێژ بووەتەوە و برینێکی گرانی بەسەر سنگەوە دەبینرێ. ئەو یەکێک لە سەربازە عێراقییەکانە، کە بە بریندراوی بە دیل گیراوە و ئێستە لێرە یەکێک لە پەرستارە پیاوەکان خەریکی "تەداوی" کردنیەتی. کاتێک من دەپرسم، کە بۆم هەیە وێنەی لێ بگرم لە وەڵامدا دەڵێن زۆر ئاساییە و بۆ خۆشی زۆر رازییە، کە بەم شێوەیە رزگاری بووە لەناو ئاگری ئەم شەڕەدا، ئێرە باشترە بۆ ئەو تا بەرەی شەڕ.

لە بەشی ژناندا لە لای ژنێکی گەنج رادەوەستم و دوکتۆر برینەکەیم پێ نیشان دەدات. برینێکی ترسناکە و هەموو لای خواری پشتی لە بەردەگرێ، ئەو باش دەبێتەوە بەڵام کاتی دەوێ، دووریش نییە شوێنی برینەکەی هەر وا بە ناحەزی بمێنێتەوە.

ئەم ژنە ناوی سامیەیە و خەڵکی گوندی "بوچورنیدی" دەڤەری دەهۆکە. سامیە یەکێک لە قوربانییانی بۆمبارانێکە ٢ رۆژ پێش ئەنجام درا. تەنیا ژن و منداڵ لە دێیەکەدا بوون کاتێک فڕۆکەکان دەرکەوتن و لەو کاتەدا زۆربەی ژنەکان لەسەر کانی بوون. بۆمبەکە لە نزیک کانییەکە کەوتە ئەرد، ژنێک کوژرا و ژمارەیەکی زۆریش بریندار بوون. کاتێکی زۆری کێشا تا سامیە گەیشتە لای دوکتۆر چونکە گوندەکە دوورە و رێگەی هاتوچۆی سەختە.

سامیە بێدەنگ و دەموچاوی ترسی لێوە دیارە، من هەوڵ دەدەم بە یارمەتیی دوکتۆر قسەی لەگەڵدا بکەم:

- من لە فڕۆکە دەترسم، ئاواتم تەنیا ئەوەیە شەڕ تەواو بێت و ئەو کات من پێویست نەبێت لە فڕۆکە بترسم.

من لەم ماوەدا لە بەشی ژنانی ئەم جێگەیەدا وێنەیەک دێنمە بەرچاوم و هەوڵ دەدەم بە باشی بینووسمەوە. لە گۆشەیەکی ئەم نەخۆشخانەیەوە کوڕێک لەسەر تەختێک راکشاوە و تەمەنی رەنگە لە دەوروبەری ١٠ ساڵاندا بێت. هەموو شتێک ئەوە نیشان دەدات، کە لە مردن نزیک دەبێتەوە. نیگەران دێتە بەرچاو بەڵام چاوەکانی کراوەن. لە تەنیشت ئەم کوڕەوە کچێکی هاوتەمەنی خۆی راوەستاوە، دەستی لەناو دەستی ناوە و بە شێوەیەکی جیدی چاوی بڕیوەتە ناو چاوی و سەیری دەکات، ئەو لەم شوێنەدا هەست بەوە ناکات کە بیانییەک ئەوی خستووەتە ژێر چاودێری.

ئەمانە خوشک و برای یەکن و ئەم کچە شەو و رۆژ لێرەیە، خەمبار و دڵبریندار بەڵام ئارام و بەسەبر، ئامادەی یارمەتیدانە بە براکەی تا ئەو

ساتەی دەژی. من قەت پێشتر ئیشقی وا خاوێن، راستەقینە و جوانم لە ناخی هیچ خوشک و برایەکدا نەبینیوە. ماوەیەکی زۆر لەوێ رادەوەستم و سەیری ئەم خوشک و برایە دەکەم. من بە بینینی ئەم دیمەنە تووشی دڵەڕاوکێ، هەستی هاودەردی یان بێدەسەڵاتی نابم، بگرە جۆرێک شادی و خۆشحاڵی دام دەگرێ. ئاخر ئەمە دیمەنێکی راستەقینەی مرۆڤایەتیی ئێستەیە، ئەم دیمەنە دەبووا بە تەواوی ئاسایی بوایە. رۆژانە ژمارەیەکی زۆر منداڵ لەم دنیایەدا دەمرن. ئەم کوڕە قوربانیی شەڕ نییە، ئەو تووشی نەخۆشییەکی چارەهەڵنەگر بووە. ئێستە لەناو تەختی نەخۆشخانەیەکدا کەوتووە بەڵام تەختەکە لەژێر چادرێکدایە. رووناکی و تیشکی خۆر دێتە ناو چادرەکە و ئەو دەتوانێ دەنگی با و هاژەی ئاوی دەربەندەکە ببیسێ. کاتێک بمرێ لە نەخۆشخانەیەک، کە دیوارەکانی هەموو سپی و دەوروبەری ئاسن نین، ئەو لەناو کەس و ئاشنای خۆیدا، کە دەیانناسێ و لە لای خوشکەکەیدا دەمرێ. ئەم کچە تاقە وشەیەک نایەتە سەر زمانی و لەگەڵ کەسدا قسە ناکات، دوکتۆر خورشید دەڵێ:

– ئەرێ، ئەوە خوشکی ئەو کوڕەیە، ئەو هەموو کاتێک لە لایەتی. ئێمە ناتوانین کاتێک بۆ دیداری خزم و کەسی نەخۆشەکان دانێین، لێرە پێوەندیی بنەماڵە و کەسان زۆر بەهێزە و خەڵک گەرەکیە هەردەم لە لای نەخۆشی خۆیان بن، ئێمەش کێشەیەکی تایبەتی لەم بارەوە نابینین و لێیان دەگەڕێن هەر کات ویستیان بێن. دوکتۆر خورشید دەستێکی لەسەر توێڵی کوڕەکە نا و روو لە من وتی:

– ئێمە هیچ شتێکمان بۆ رزگاریی ئەم کوڕە لەدەست نایە، هیوایەک بۆ زیندوومانەوەی نەماوە.

بەڵام لانی کەم ئەوە هەیە کاتی مردن بە تەنیا نابێ. هەست پێ ناکرێ ترسی لە مردنیش هەبێ، بە تەواوی ئارام دێتە بەرچاو.

ئەوان دەیانەوێ نەخۆشخانەی تایبەتی "سیل"، کە لە لایەن خۆیانەوە دامەزراوە و هەر خۆشیان بەڕێوەی دەبەن، پێشانی من بدەن. ئەم نەخۆشخانەیە لە شوێنێکی تر و لەسەر لووتکەی شاخێکە و ساڵی ١٩٧٣ دامەزراوە. یەکێک لە پزیشکەکان لەم بارەیەوە ئێژێ:

- ئێمە پێشتر داوامان لە دەوڵەت کرد نەخۆشخانەیەکی بەم شێوەیە ساز بکات چونکە نەخۆشیی سیل لە کوردستاندا بڵاوە و خەڵکانێکی زۆر تووشی دەبن. بەڵام ڕێژیم ئارەزووێکی نیشان نەدا بۆیە ئێمە خۆمان دەست بەکار بووین، دواتر ڕێژیم، کە زانی ئێمە دەستمان پێ کردووە بۆ دامەزراندن و تا ١١ی ئاداری ئەم ساڵیش، کە شەڕ هەڵگیرسایەوە بۆ بەڕێچوونی یارمەتیی داراییی داین. دیارە ئەمە تەنیا نەخۆشخانەی لەو جۆرەیە لە سەرانسەری کوردستاندا و خەڵک لە گشت لایەکەوە دێن بۆ ئێرە.

سی تەختی زۆر خاوێن و ڕێکوپێک لە نەخۆشخانەکەدان بەڵام زۆربەی تەختەکان بەتاڵن و تەنیا شەش ژن و سێ پیاوی نەخۆش لێرەدان. یەکێک لە دوکتۆرەکان لەم بارەوە دەڵێ:

- هۆی ئەوەی ئەم تەختانە وا چۆڵن ئەوەیە خەڵک لە ترسی بۆمباران ناوێرن لێرە بمێننەوە، بەجێی ئەوە ڕۆژانە دێن، دەرمان دەکرێن و دەڕۆنەوە بۆ شوێنی خۆیان.

بەڵام چۆنە لەم هەوا خاوێنەشدا نەخۆشیی سیل ئاوا بڵاوە؟

- ئەمە پێوەندیی بە شێوەی ژیانی خەڵکەوە هەیە، خواردنی خەڵک هەژارانە و بێ ڤیتامینە. لە زستانیش ناچارن لە ماڵەکانیاندا بە کۆمەڵ بتەپنە پاڵ یەکتری تا خۆیان لە سەرماوسۆڵە بپارێزن. دیارە ئەگەر لەبەر کەمتەرخەمیی دەوڵەت نەبوایە لەمێژە ئەم نەخۆشییە ریشەکێش کرابوو.

هەرچەند ئێستە زۆر باشتر بووە، ئێمە هەوڵ دەدەین کۆنترۆڵی تەواومان بەسەر نەخۆشییەکەدا هەبێت. دیارە بەم توانستەی هەمانە ناتوانین بە

تەواوی ریشەکەنی کەین بەڵام دەتوانین دۆخەکە زۆر باشتر بکەین.

کچێکی گەنج لەناو یەکێک لە تەختەکاندایە، چاوی خەفەتیان لێ دەبارێ و وا هەست دەکەم لەمێژە بزەیەک نەهاتووەتە سەر لێوی. ئەو خەڵکی مووسڵە، کاتێک دەوڵەت زانی باوکی تێکەڵی شۆڕش بووە و بووەتە پێشمەرگە، لەگەڵ هەموو بنەماڵەکەیدا دایک و ٦ منداڵ، شاربەدەری کردن.

ئەمە چیرۆکێکە، کە من هەر ڕۆژە دەیبیسم و دەیبیسمەوە. ئەم کچە ناوی قیشا ئیسماعیل و تەمەنی ١٥ ساڵە، لەسەر تەختێکی خاوێن دانیشتووە و لە پەنجەرەکەوە سەیری دەرەوە دەکات، زۆر زۆر خەمبارە و پەژارە سەراپای داپۆشیوە "قیشا" پێی وایە سێ مانگە لێرەیە، وا هەست دەکات بەرەو چاکبوونەوە دەڕوات بەڵام هێشتا هێز و وزەی بەردەوامیدان بە ژیانی وەبەر نەهاتووەتەوە.

بەشی ڕاگەیاندن لە دۆڵێکی خوارەوە، لە نێوان چۆمان و حاجی ئۆمەراندا هەڵکەوتووە. هەر بەشە و تاقمە چادری خۆی هەیە و لە پاڵ چادرەکانیشدا چاڵ و کونی فرەوان هەن تا کاتی هێرشی فڕۆکە خۆیان بشارنەوە. لێرە بەشی زۆری رووناکبیران و کەسانی خوێندەوار، کە دوای ١١ی ئادار و دەست پێکرانەوەی شەڕ بە لێشاو هاتن بۆ کوردستان گیرساونەتەوە و رەهەندێکی تریان بەم بزووتنەوەیە زیاد کرد. ئیدی ئەم شۆڕشە شەڕی تاقەت پڕووکێنی کۆمەڵێک "دڕندەی کێوی" نییە، وەک گەلێک کەس پێیان وا بوو، بگرە خەباتێکی رزگاریخوازانەیە بە بەرنامە، ئامانج و ئیدیۆلۆجیی روون.

من لەناو ئەم چادرە سەوز و بۆرانەدا چاوم بە کۆمەڵێک پرۆفیسۆر و پیاوانی تری شەهادە بەرز کەوت، کە بێگومان هاوتایان لە دنیادا نییە. من دوکتۆر کەمال مەزهەر دەبینم، کە پسپۆری مێژووی کوردە.

ناوبراو ئێژێ:

– ئێمە نامانەوێ بانگەشەی ئەوە بکەین، کە کورد زیاتر لە خەڵکی تر بۆ رزگاریی خۆیان خوێنیان داوە، بەڵام شۆڕشی ئێمە نموونەیە و لە راستیدا نموونەیەکی باشیشە. شۆڕشی خەڵکی ئێمە نیشان دەدات، کە چۆن نەتەوەیەکی بچووک، بەرە دوای بەرە، کۆڵنەدەرانە بۆ مانەوە و ژیان خەباتی بێ پسانەوە دەکات. خەبات لە عێراق لە سەردەمی شەڕی یەکەمی جیهانەوە بەردەوامە. ماوەیەکی کورت نێوان ساڵەکانی ١٩٢٢ – ١٩٢٣ خەباتی ئێمە لە لایەن شێخ مەحموودەوە رێبەری دەکرا. ئەوان رۆژنامە، سوپا و تەنانەت پوول (طابع)ی تایبەتی خۆیان هەبوو. لە کوردستانی ئێران ساڵی ١٩٤٦ لە مەهاباد کۆماری کوردستان جاڕ درا. کوردی تورکیا سێ جار سەرهەڵدانیان کردووە ١٩٢٥، ١٩٣٠ و ١٩٣٨ ژمارەی کورد لەوێ لە بەشەکانی تری کوردستان زۆرترە. دەوروبەری ٧ ملیۆن کەس دەبن. بەڵام ئەوان هیچ جۆرە مافێکیان نییە و بە توندی سەرکوت کراون. ئێستە تەنیا کوردی عێراقن خەبات دەکەن بەڵام خەباتی ئێمە بۆ هەموو کوردە.

ئەی بارزانی، جێگەی ئەو لەم خەباتەدا چییە؟

– بێگومان و بێ ئەوەی بمەوێ قسەی بێ بناخە بکەم دەتوانم دڵنیات کەم، کە هەموو کورد جەنەراڵ بارزانی وەک سەرۆکی خۆیان دەبینن و رێز و حورمەتیان بۆی هەیە. ئەو هەر لە منداڵییەوە تا ئێستە خەبات بۆ مافی کورد دەکات. ئەو نە تەنیا لێرە لە کوردستانی عێراق بگرە لەناو دڵی هەموو کورددایە. بۆ ئەوەی بزانی، کە کورد چەندە جەنەراڵ بارزانییان خۆش دەوێ دەبێ بزانی، کە وێنەی وی لە هەموو ماڵە کوردێک لە رووسیاشدا هەن و ناو لە منداڵی خۆیان دەنێن بارزانی، لە رووسیا ها نەک لێرە.

بەڵام دەمەوێ بپرسم چی روو دەدات ئەگەر ئەو بمرێ؟

– ئێمە ئاواتی تەمەنێکی درێژی بۆ دەخوازین، بەڵام بێتو ئەو بمرێ ئێمە رێگەیەک ئەو پێشانی داوین دەگرین و درێژەی دەدەین.

دوکتۆر کەمال لە رووسیا خوێندوویەتی و رووسیی رەوان و بە باشی قسە دەکات بەڵام لە ئینگلیزیدا باش نییە، بۆیە بانگی "شەوکەت"، کە یەکێک لە پێشڕەوانی شۆڕش و ماوەیەکی زۆر تەنیا کەسێک بوو وەرگێڕانی بە زمانی ئینگلیزی لە دەست دەهات، دەکات.

"شەوکەت" ٢١ی ئەیلوولی ١٩٦١ هاتە ڕیزی هەڤاڵانی بارزانییەوە. ئەو ئەفسەری پۆلیسی عێراق بوو و کاتێک دیتی لە شوێنی خزمەتەکەی ئەو بە یەک بەتالیۆنی تەواوەوە هێرشیان کردە سەر کورد، بە ناو بەرەی شەڕدا هەڵات و خۆی بە بارزانی ناساند. شەوکەت لەم بارەوە دەڵێ:

- جەنەراڵ زۆر خۆشحاڵ بوو، لەو دەمەدا زۆر ئاسایی نەبوو کەسێک لەناو پۆلیسی عێراقەوە بڕوات و خۆی بە شۆڕش بناسێنێ. بەڵام دوای ئەوە سەدان ئەفسەری عێراقی، هەم لەناو پۆلیس و هەم سوپاشدا ئەو بڕیارەیان داوە و هاتوون، من هیچ کات لەو بڕیارەی خۆم پەشیمان نەبوومەتەوە.

شەوکەت شەهادەی کارکردن لە رادیۆی هەبوو و یەکەم ئەرکیشی ئەوە بوو سەرپەرشتیی رادیۆیەک، کە شۆڕش لە دەوڵەتی بە دەست کەوت گرتبوو، بکات. ئێستە بەرپرسی بەشی فەنیی رادیۆی شۆڕشە و پاش راگۆڕینەوەیەکی کورت لەگەڵ دوکتۆر کەمالدا بڕیار دەدەن، کە بۆ من جیاوازییەک لەگەڵ خەڵکی تردا دابنێن و ئێستگە و شوێنی رادیۆیەکەیانم پێشان دەن. ئێمە بە سواری لاندرۆڤەرێک بەرەو چۆمان وەڕێ دەکەوین بەڵام بە ڕێگەیەکی تردا لادەدەین و بەرەوژوور بۆ سەر کێوێک سەر دەکەوین. لە دەربەندێکدا، کە بە باشی پارێزگاریی لێ دەکرێ بنکەی رادیۆی کوردستانی ئازاد بە شێوەی کوردی لە خشتی گڵێن (قوڕین)، کە لەبەر خۆرەوە سوور بوونەتەوە - ئەسڵەن دواکەوتووانە نایەتە پێش چاو - و کۆمەڵێک دیو، ستۆدیۆی تۆمارکردن و دیوی رادیۆ ساز کراون. ئەو بەشەی رادیۆیەکە، کە دەنگەکە دەنێرێ - کیانەر - (وشەیەکی هەورامییە بە مانای بەڕێکەر -

وەرگـێـڕ)، لە ژێرزەمـینێکدایە کـە لە دڵی بەردێکدا هەڵکەندراوە، پیـاو لە کـونێکەوە دەڕواتـە ناو و هات و چوو و کـاری ئەم خـەڵکە لەم بن ئەردەدا دەبێتە مایەی رامان و سەرنجی من. شەوکەت دەبێژێ:

- ئێستـە ئێمە بە کوردی، عەرەبی، ئاسووری، تورکی و ئینگلیزی بەرنامە بڵاو دەکـەینەوە. لەبەر ئەوەش عـێراقیـیـەکـان بە یارمـەتیی رووس پارازیتی بەهێزیان بەدەست خستـووە، کە پێشی بڵاوبوونەوەی دەنگی ئێمـە دەگرێ. ناچارین لەسـەر شـەپۆلی جـۆرەوجـۆر بەرنـامـەکـانمان بەڕێ کـەین. بەڵام خـەریکین "کـیـانەر"ی نوێ دامـەزرێنین و لە مـاوەیەکی کـورتدا لە شـەش شەپۆلانەوە بەرنـامـە بڵاو دەکـەینەوە بۆ ئەوە بەسـەر پـارازیتەکەدا زاڵ بین و دەنگمان بگاتە خەڵک.

شەوکەت لە درێژەدا دەڵێ:

- ئێمە تەکنیکاری زۆر باشمان هەن.

چاپخـانەی شـۆڕشـیش هـەر لەم نزیکانە و لە ژێرزەمـینێکی تـردایە. ئەو سـەردەمـە بەسـەرچووە، کـە مـرۆڤ کۆمـەڵێک شـتی سـاکار و تـەنزاوی لە کاغـەزێکدا دەنووسـی و بە دزییـەوە بڵاوی دەکردنەوە، لێرەدا چاپخـانەیەکی مۆدێرن و گەورە هەیە، کە بە کارەبا ئیش دەکات و ٣٦ کەس دایمی کاری لێ دەکەن. لەم شـوێنەدا حـەفتـەنامـەیەک، کە زیاتر هـەواڵ و دەنگوباسـە و ناوی "شەڕ" و هەر ژمارەی ٥٢١ دانەیە دەردەچێ، هەروەها گەلێک بڵاڤۆکی تریش بۆ نموونە کۆوارێکی تایبەتی پێشمـەرگە، کۆوارێکی تایبـەت بە ئەندامـانی حزب، کۆوارێکی زانستی و مانگنامەیەکی ئەدەبیش لێرە چاپ دەکرێن.

دەبینم ئەمـڕۆ رۆژێکی زۆر باش بوو بۆ من، زۆر شت فـێـر بووم، من تا ئێـسـتـە زۆر لەوە زیاترم بینیـوە، کـە بە تەمـای بـووم. لای ئێـوارە کـۆڕێکی میوزیک دێن و لە پاڵ پەنجەرەکەی من لە قەسرول - سەلامدا بارگە و بنەیان دەخەن. هەتا نیوەی شەو پێکەوە دادەنیشن و گۆرانی دەڵێن. مانگ نیوەیە و

لە دۆڵەکەی خـوارەوە سـتـوونی سـەربازی پێشـمـەرگان بـەرێوەن بۆ بەرەی شـەڕ، جاروبار گرمـەیەکی لاواز و دوور دێتـە گوێم، نازانم هـەورە یان دەنگی تۆپە.

من تـەنیـا دوو ڕۆژە لێـرەم بەڵام دەبینم دۆسـتـم لێـرەدا زۆرتـرن وەک لە هەموو شوێنەکانی تری دنیا.

## ئەم شەڕە هەڵەیە

بەیانی زوو بە دەنگی تەقە وەخەبەر هاتم، فڕۆکەیەکی تۆپۆلۆف هاتووەتە سەر ئاسمانی ناوچە و هێندە بەرز دەفڕێ گوللەی چەکی دژە هەواییی کورد ناگاتە لای. میشل لەم بارەیەوە دەڵێ:

– ئێمە دەزانین، کە چەکی مە ناگەنە فڕۆکە. تەنیا بۆ ئەوە تەقەیان لێ دەکەین بیانترسێنین، بەڵام لە بەرەی شەڕدا زۆر نەوی دەفڕن و ئێمە دەتوانین بیانپێکین. تا ئێستە ٢٠ – ٣٠ دانەمان خستوونەتە خوار و ئاخر دانەیان حەفتەی پێشوو بوو. فڕۆکەوانەکەی خۆی بە چەتر فڕێ دایە خوار و کەوتە ناوچەی ژێر دەسەڵاتی ئێمە و بە دیلمان گرت. ئەو ئێستە لە شوێنێکی تایبەت بە گیراوانی شەڕدایە و تۆ ئەگەر بتەوێ دەتوانی ببینی.

من زۆر کەیفم بەوە نییە لایەنەکانی شەڕ دیلەکانیان وەک "پێشانگە" نیشانی رۆژنامەوانان دەدەن و حەز ناکەم شتی وا ئازاردەر ببینم. بەڵام من هەر دەبێ ببینم دیلەکانی ئەم شەڕە لە کوردستان چۆن هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا دەکرێ – من پێشتر بیستوومە هێندێک لەوان بە تۆڵەی هەڵواسینی ئەو کوردانەی لە لایەن دەوڵەتەوە لە بەغدا دەکرێن، لە لایەن شۆڕشەوە گوللە کراون. میشل، کە زۆر بە بیستنی ئەم شتە تووڕە بوو، روو بە من دەڵێ:

– ئەمە بە تەواوی درۆیە، هیچ کات ئێمە دیلمان نەکوشتووە، تەنانەت بیرکردنەوەشی لای ئێمە نەگونجە. ئێمە لەگەڵ ئەواندا باش دەجووڵێینەوە و دەزانین ئەمە تاوانی ئەوان نییە، کە لە لایەن دەوڵەتە تاوانبارەکەیانەوە ناچار بوون بێنە شەڕی کورد. ئێمە هەست بە هیچ رقێک لە بەرانبەر سەربازانی عێراقدا ناکەین.

- پێم وا نییە هیچ کوردێ، تەنانەت پێشمەرگەکانی بەرەی شەڕیش هەست بە شتی وا بکەن.

کامپی دیلەکانی شەڕ لە ناوەڕاستی چۆماندایە و من چەند جار بەوێدا تێ پەڕیوم بێ ئەوەی هەست بە بوونی بکەم. بینایەکی یەک نهۆمیی گەورەیە، کە پێشتر لە بەردەستی قایمقامدا بووە. ئەم بینایە جوانترین بینای چۆمانە و لە راستیدا من تێ ناگەم بۆچی راست ئەم جێگەیە کراوەتە شوێنی سەربازانی دیلی شەڕ. لە بەراورد لەگەڵ شوێنی نەخۆشخانە قورینەکەی دوێنێ بینیم ئەیرە چەند قات خۆشترە. ئەم ماڵەی قایمقام گەلێک باشتر بوو بۆ نەخۆشخانە، لەبەر چی ئەم جێگەیەیان نەکردووەتە نەخۆشخانە، وەڵامێکی دەردخواردووم دەست نەکەوتووە بەڵام پێم وایە لەبەر دیاریبوونی، شوێنەکە زوو دەبووە ئامانجی بۆمبارانی فڕۆکەکانی رژێم و وێران دەکرا. هەروەها لە نزیکی ئەم شوێنەش ناوەندێکی نیوەتەواوی کارەبا هەیە، کە دەکرا وەک ئامانجێکی سەربازی بناسرێ و بیانووی بۆمبارانی ساز بێت.

کامپی دیلەکان بە زەحمەت بوترێ چاودێریی لێ دەکرێ. ژمارەیەک پێشمەرگەی قسەخۆشی بەتەمەنی لێیە و بێ زەحمەت و گرفتێک دەرگەی ئیدارەی شوێنەکەم بۆ دەکەنەوە بچمە لایان. جێگەیەک، کە تەنیا مێزێکی ئاسنین و چەند کورسیی لێیە. فەرماندەی ئەم کامپە نەیگەرەکە ناوی راستەقینەی خۆی بڵێ و ناشیەوێ وێنەی لێ بگرم. دیارە هۆی ئەم کارەشی ئەوەیە، کە رژێم وشار نەخاتە سەر بنەماڵەکەی، کە ئێستە لە بەغدان و رەنگە ئێستە پێیان وا بێت ئەو لە شەڕ کوژراوە. بەر لە چەند مانگ ئەو لە سوپای عێراق ئەفسەر و فەرماندە بوو. ناوبراو، کە ئێستە بەرپرسی ئەم شوێنەیە دەڵێ:

١٢٤ گرتوو لێرەدان و ژمارەیەکی تریش لە رێگەدان، کە لە بەرەی

ڕۆژاوادا گیراون. هەموو دیلەکان لێرە کۆ دەکرێنەوە، شوێنێکی ترمان نییە و سروشتیشە گشت ئەمانە لە شەڕ گیراون.

ئێمە باش هەڵسوکەوت لەگەڵ ئەم دیلانە دەکەین و لە راستیدا خواردنی ئەوان لە پێشمەرگەکانی بەرەی شەڕیشمان باشترە. بۆ بەیانی هەر کامەیان دوو نان بە پەنیرەوە دەخۆن، نیوەڕوان برنج و شلەیە و ئێوارانیش نان و جۆرێک شلەیان دەدەینێ. هەموو ڕۆژێک هەموو زیندانییەک ٦ نان و ٩ پیاڵە چای پێ دەدرێ. شەش جار لە مانگدا هەر کەسە ٢٠٠ گرام گۆشتی بەر دەکەوێت. هەر دیلێک لە مانگدا پاکەتێک مووس (تیخ) ٢ سابوون - زیاتریش ئەگەر خۆیان بیانەوێ - کیلۆیەک تووتنی کوردی، ٣ تۆپ کاغەز جگەرە و یەک دینار تا خۆیان میوەی پێ بکڕن بەردەکەوێ.

لە بەرەی شەڕدا ئەوان فێر دەکرێن رقیان لە ئێمە بێت و رژێم ئەوانی بە کۆڵێک درۆ فریو داوە. - پێیان دەڵێن ئەوان لە دژی کۆمەڵێک چەتە و خەڵکی دواکەوتوو شەڕ دەکەن - ئەمە فاشیستەکانی بەعسن راستییان لەمانە شێواندووە. بەڵام بەرەی شەڕ قوتابخانەیەکی باشە بۆ ئەوان. ئەوان وا حاڵی کراون ئەمە شەڕێکی هاسانە و نازانن کە چی جەهەندەمێک چاوەڕوانی ئەوانە. بۆیە ئەوانەیان گیانی خۆیان دەردەکەن و دەگەنە لای ئێمە زۆر خۆشحاڵن. ئێمە باشیان لەگەڵ دەجووڵێینەوە و پێشمەرگە هەر دوای گیران تۆقەیان لەگەڵدا دەکەن و دەڵێن "وەرن با ببینە دۆست" بەڕاستی وایە، ئاخر بەم شێوەیە ئێمە تێیان دەگەیێنین کە ئەوان بڕوایان بە چی ڕێبەرانێکی دەستبڕ و فریوکار کردووە. ئەفسەرێکی عێراقی بەدیل گیرابوو، دوای دوو ڕۆژ دەیوت گەورەترین ئاواتی من ئەوە بوو کوردێک بگرم و دارکاریی بکەم، بەڵام ئێستە دەزانم پڕوپاگەندەی بەعس چەندە چەواشەکارانەیە. ئەگەر بێتو ئێمە باش لەگەڵ ئەم دیلانەدا نەجووڵێینەوە گورج بەرپرسەکانمان سزامان دەدەن. فەرماندە درێژە بە قسەکانی دەدا و دەڵێ:

- ئێمە ناوی هەموو دیلەکان دەدەینە خاچی سوور و داوایان لێ دەکەین کە نوێنەری خۆیان بنێرن، بەچاوی خۆیان کردەوەی ئێمە لەگەڵ دیلەکان ببینن و بزانن ڕژێمی بەعس درۆ دەکات کاتێک دەڵێ ئێمەش وەک ئەوان دیلان هەڵدەسواین. قەت شتی لەو شێوەیە لە ئێمە ناوەشێتەوە چونکە ئەوان برای ئێمەن. گەورەترین کێشەی ئێمە ئەوەیە ئەوان ناتوانن لەگەڵ بنەماڵەی خۆیاندا پێوەندی بگرن. ئێمە هەوڵ دەدەین یارمەتییان بدەین - ئەگەر خۆیان بخوازن ئێمە دەهێڵین هەر کامەیان نامە بنووسن و بینێرین لە دەرەوە پۆست بکرێ، بەڵام ئەوان ناوێرن ئەم کارە بکەن. ئەوان دەترسن ڕژێم ئەم کەمپە بۆمباران بکات یان گرفت بۆ ماڵباتیان پێک بێنێ. ئاخر ڕژم بانگەشەی ئەوە دەکات، کە شەڕێک لە گۆڕێدا نییە تا دیلی شەڕی هەبێ.

فەرماندە بۆ خواردنی نیوەڕۆ من لە دیوەکەی خۆیدا میوان دەکات و خواردنەکەش هەمان خواردنی گیراوەکانە نەک شتێکی زیاتر. پاشان من هەڵدەستم بە هاوڕێیەتیی فەرماندە سەیرێکی دەوروبەر لەناو کەمپەکەدا دەکەم، تەختی نووستن لەناو دیوەکاندا نییە، تەنیا دۆشەکە لەسەر زەوی ڕاخراون. ئەمە هێندێک نامۆ دێتە بەرچاو ئەگەر مرۆڤ نەزانێ، کە لە ماڵێکی ئاساییی کوردانیشدا هەواڵێک لە تەخت و مێز نییە. - کورسی و مێزی پێویست نییە، خەوتن، خواردن و دانیشتن هەمووی لەسەر ئەردە. ئەوەی، کە لەگەڵ چوونە ژوورەوەی ئێمە هەموو پیاو هەڵدەستنە سەرپێ و تەنیا کاتێک دادەنیشن "فەرماندە" پێیان بڵێ زۆر من ئەزیەت دەکات. فەرماندە کاتێک لەگەڵ من بەناو ئەم دیوانەدا دەگەڕێ دەڵێ:

- ئەوان خۆیان خواردنی خۆیان ساز دەکەن، خۆیان داوایان کرد ئەم کارە بکەن، دیارە بێکاری گرفتێکە بۆ ئەوان، بەڵام لە هەموو دیوەکاندا رادیۆیەک هەیە و ئەوان دەتوانن گوێ لە دەنگوباس بگرن تەنانەت هەواڵ و دەنگوباسی ئێستگەی عێراقیش.

من قسه لەگەڵ "چاودێرێک"دا دەکەم کە ناوی شەهاب ئەحمەدە و لە ٤ی مانگی تەمووزەوە لێرەیە. پیاوێکی کورتەباڵا و وا دیارە ماوەی گرتن بە جۆرێک کاریگەری لەسەر داناوە، بڕوای بە خۆی نەماوە، شتێک لەبارەی داهاتووەوە نازانێ و گەیشتووەتە هەلومەرجێک هیوایەکی تێدا بەدی ناکات. من لێی دەپرسم داخوا گرفتێک هەیە ئەگەر باسی خۆیم بۆ بکات، ئەو لەم بارەوە کێشەیەکی نییە بە هاسانی دەست دەکات بە گێڕانەوەی بەسەرهاتی خۆی:

- پێش ئەوەی بێینە بەرەی شەڕ پێیان وتین ئێمە دەچینە شەڕی کۆنەپەرست و یاخییان و دەیانوت پێشمەرگە نایەڵن کەسێک بە زیندوویی بکەوێتە دەستیان. بەڵام ئێستە بە چاوی خۆم دەبینم ئەمە چەندە هەڵەیە. ئەم گرتیگەیە جێگەیەکی باشە بەڵام روونە من حەز ناکەم لێرە بم. من ژنم نییە بەڵام باوک و دایک و خوشک و براکانم لە بەغدان و ئەوان هیچ شتێک لەسەر دۆخی من نازانن. تەنیا رێگە ئاشتییە و من تەنیا هیوام بە ئاشتییە. بەڵام شەڕ ئێستە بەردەوامە، ئەگەر ئێستە من ئازاد بکرێم ناتوانم جارێکی تر لەم شەڕەدا بەشداری بکەم. من گەرەکمە عەرەب و کورد پەیمانی ئاشتی مۆر بکەن - ئەم شەڕە بێ مانایە.

پێت وایە چۆن دەکرێ هەلومەرجی دۆخێکی وا پێک بێت؟

- دژوار و نامومکینە بڵێم، چۆن کوردیش چەکی باشیان هەیە ئێستە، بەڵام عێراقی زۆرتریان هەیە. ئەوان لانی کەم چوار لەشکریان لە بەرەی شەڕدا هەیە و هەر لەشکرەش ١٢٠٠٠ کەسە. هەروەها تانک و تەیارەش.

بەڵام ئێستە دەزانم کە کورد حەقیانە و داواکانیان رەوان.

ئەو مێشکیان نەشۆردووەتەوە بەڵام تووشی شۆکێکی گەورە بووە، کە هێشتا ئاسەوارەکانی پێوەی دیارن.

تۆ دەڵێی ئەم شەڕە دەبێت تەواو بێت، بەڵام پێت وا نییە، کە هەموو شەڕ

وان و وەک ئەم شەڕە بێ مانان؟

– نا، ئەگەر ئێمە شەڕی ئیسرائیل بکەین، من سازم ئەرکی خۆم لە سوپادا بەجێ بگەیێنم.

کتوپڕ هەست پێ دەکەم هەموو ئەو قینەی پێشتر لە کوردی هەبووە پێش ئەوە بە دیل بگیردرێ، هێندێکی تریشی لێ زیاد و گواستیەوە بۆ ئیسرائیل، بۆیە من لێی دەپرسم:

بەڵام رەنگە تۆ لەو شەڕەشیش بە دیل بگیردرێیت و لەوێش بۆت دەرکەوێ، کە جارێکی تر فریوت خواردووە؟

– قەت، ئیمکانی نییە. رۆژێک بێت و بڕیار بێت لە لایەن ئیسرائیلییانەوە بە دیل بگیرێم خۆم دەکوژم.

فەرماندە دەڵێ من بۆم هەیە لەگەڵ هەر کام لە سەربازە دیلە عێراقییەکاندا پێم خۆشە بە تەنێ قسە بکەم و ئەو لەم بارەوە گازندەیەکی نییە. من داوا دەکەم کە لەگەڵ فرۆکەوانە عێراقییەکەدا قسە بکەم و بە هاسانی دەرفەتم بۆ دەڕەخسێنن.

ئەو ناوی سەفا شەلال فایال و ٢٣ ساڵی تەمەنە. ئەو راست بە پێچەوانەی ئەو چاودێرە چووکەڵەی پێشوو، باڵابەرز، خوێندەوار، ئینگلیزییەکی باش قسە دەکات و ڕەنگە لە بنەماڵەیەکی چینی سەرەوەی بەغدا سەر بە حزبی بەعسیشە. بەڵام کاتێک دێمە دیوەکەی هەست دەکەم دەترسێ و دەکرێ سەرچاوەکەی لە دڵنیانەبوونەوە بێ. من بۆی روون دەکەمەوە، کە خۆی دەتوانێ دیاری بکات ئاخۆ گەرەکیە قسە لەگەڵ مندا بکات یان نا. پێی دەڵێم نە من و نە بەرپرسی کامپیش ناچاری ناکەین بەو کارە.

بەڵام ئەو دەڵێ بە سەردانی من خۆشحاڵە، دیداری من ئەو ئارام دەکاتەوە. کاتێک دێتە سەر باسی خۆی دەڵێ ئەو میگێکی ١٩ی بەسەر بەرەی شەڕدا لێ دەخوڕی، کە دوو حەفتە پێشتر بەر چەکی کورد کەوت،

خرایە خوارەوە و لە لایەن پێشمەرگەوە بە دیل گیرا:

- لە کاتی دووەم هێرشمدا بوو هەستم کرد شتێکی فڕۆکەکە وەک خۆی نییە. نەدەکرا وەک پێویست هەڵی سووڕێنم، خۆم لە فڕۆکەکە فڕێ دا و لە هەڵدێرێکی سەختدا هاتمە خوار. زۆر نێزیکی بەرەی شەڕ بوو و من هەوڵم دا بڕۆمە بەرەی عێراقییەکان، بەڵام پشتم بریندار بووبوو و نەمتوانی توند بڕۆم. لە لایەن پێشمەرگانەوە دەورەم گیرا و داوایان لێ کردم "مەبزوو" لە شوێنی خۆت راوەستە... من ترسام، ئەوان لە دەوروبەرم بوون بەڵام ئارامیان کردمەوە، یارمەتییان دام، هێنایانم بۆ نەخۆشخانە و ئەوەتا ئێستە لێرەم.

ئەوان باش، زۆر باش لەگەڵم دەجووڵێنەوە بەڵام ئێرە زۆر ناخۆشە و بیری ماڵەوەم کردووە. ئەو بە پاسەوانەکانی خۆی دەڵێ "دۆستەکانی من".

تۆ پێش ئەوە چۆن لەبارەی کوردەوە بیرت دەکردەوە؟

- من دەمزانی ئەوان مێواندۆست و بە بەزەیین. باوکم بۆی باس کردبووم. هەروەها خۆم بۆ گەشت و سەیران و سەردانی ئێرە ناو کێو و شاخان حازر کردبوو بەڵام بەو حاڵەش دەترسام، کەس نازانێ لە شەڕێکدا چی روو دەدات.

بەڵام بەوەشەوە کە تۆ کوردت دەناسین بەشداریی شەڕی دژی ئەوانت کرد؟

- من ساڵی ١٩٧٠ بوومە فڕۆکەوان و دەمەویست دژی ئیسرائیل شەڕ بکەم - هەر لەبەر ئەوە بوو من خۆم بە هێزی هەوایی ناساند - کاتێک دەستوورم بۆ هات بەشداریی ئەم شەڕە بکەم ئیشی من نەبوو هەڵوێست بگرم، من دەبووا بڕیار جێبەجێ بکەم نەک هەڵوێستی سیاسی بگرم.

ئەو لەسەر ئەو شێوە ئاساییە سەربازییە بیر دەکاتەوە، کە سەربازێکی باش لە هەر حاڵەتێکدا دەستوور جێبەجێ دەکات.

ئێستە چۆن بیر دەکەیتەوە، ئەم شەڕەت پێ چۆنە؟

- هەڵەیە - ئەم شەڕە هەڵەیە. ئەوان دەبێت بگەنە ڕێگەچارەیەکی ئاشتییانە، کە جێ پەسندی هەمووان بێت. شەڕ هیچ کێشەیەک چارەسەر ناکات.

ئەگەر تۆ ئێستە ئازاد بکرێیت دەگەڕێیتەوە ناو هێزی هەواییی عێراق؟

- بەڵێ، بەڵام لەم شەڕەدا بەشداری ناکەم. من دەمەوێ شەڕ دژی ئیسرائیل بکەم نەک دژی کورد.

من تێ دەگەم ئەو هێشتا بەسەر ئەو شۆکەدا کە دوای کەوتنەخوارەوە تووشی بووە زاڵ نەبووە. دوو حەفتەیە تەنیا لە سلوولێکدا ماوەتەوە - بە هۆیەک ئەو لە دیوی تاکەکەسیدا دەژی - و بیر لە چارەنووسی خۆی دەکاتەوە. دوای کەوتنە خوارەوە هەموو دنیای پێشووی بەسەردا رووخاوە و هێشتا خۆی کۆ نەکردووەتەوە. تەنیا بەشێک لەو دنیایە هێشتا وەک خۆی ماوەتەوە قین و رقێکە لە ئیسرائیل هەیبوو و من بێزار دەبم کاتێک هەست بەم دۆخەی دەکەم.

تۆ تێ ناگەی، کە رەنگە وەک ئەم جارە لە پێوەندی لەگەڵ ئیسرائیلیشدا وەک کوردستان فریوت خواردبێت و کاتێک لەوێش دیل کرای هەمان شت بڵێی، کە تۆ تەنیا دەستوورت جێبەجێ کردووە بەڵام شەڕەکە هەڵەیە؟

ئەو کتوپڕ دۆخی بە تەواوی تێک دەچێ و هەوڵ دەدات بە باشترین شێوە مەبەستەکەی دەرببڕێ و نیشان بدات، کە باسی ئیسرائیل بە تەواوی شتێکی ترە، خۆی کۆ دەکاتەوە، ورد و حیسێب بۆکراو دەڵێ:

- ئەوان وڵاتی عەرەبیان داگیر کردووە، دزیویانە و خەڵکیان کوشتووە، ئەوان دەبێت پێشیان پێ بگیرێ، لەناو ببرێن. کاتێک ئەم شتانە دێنێتە زمان هێندە رق لە دڵیدا کۆ بووەتەوە خەریکە لە رقان هەموو شتێک تێکەڵ دەکات.

بەڵام بۆچوونێکی تریش هەیە، ئەگەر دەوڵەتەکەی تۆ لە پێوەندی لەگەڵ

کوردستاندا درۆی کردووە – شتێک، کە تۆ بۆ خۆتددانی پێدا دەنێی کە کردوویە – رەنگە هەر بەو شێوەیەش لە پێوەندی لەگەڵ ئیسرائیلیشدا درۆ بکەن.

بەڵام بانگەشەکەی من نارەحەتی دەکات من تێ دەگەم کە نامەنتقییە بەو شێوەیە وشاری بۆ بێنم و پەشیمانم، کە چوومە ناو ئەم باسەوە. قازانجێکی نییە، من دەبێت بزانم کە ئەو لەم گرتیگەیە لە کوردستاندا تەنیا رقی لە ئیسرائیلە وەک شتێکی دیار مانا بە ژیانی دەدا. زاڵمانەیە ئەویشی لێ بستێنییەوە.

بۆ ئەوەی باسەکە بگرم دەپرسم تۆ تەنیا بەسەر بەرەکانی شەڕدا فڕیت؟ تۆ بۆ خۆت دەزانی کە فڕۆکە عێراقییەکان خەڵکی سیڤیلیشیان بۆمباران کردوون، ئاخۆ تۆش بەشداریت لە بۆمبارانی خەڵکی ئاساییدا کردووە؟

– نا، من تەنیا لە بەرەی شەڕدا بووم، دەزانم گوندیشمان بۆمباران کردوون، بەڵام حەزم لەوە نییە، پیاو نابێ خەڵکی سیڤیل بۆمباران بکات.

بەڵام لە ئیسرائیل، ئەگەر لەوێ دەستووورت پێ بدەن بۆ کوشتنی ژن و منداڵی ئیسرائیلی، مەبەستت ئەوەیە، کە هیچ گومانی لێ ناکەیت؟

– نا، نا، (هێند دەنگی بەرز دەکاتەوە هەست پێ دەکەم دەنەڕێنێ).

من دیسان پەشیمانم تووڕەم کردەوە، چە قازانجێکی هەیە. لە راستیدا من ئەوم خۆش دەوێ، ئەو ئێستە بە تەواوی کەسێکی ترە و لە بەراورد لەگەڵ پێشتردا. لێ دەگەڕێم تا ئاخر درێژە بە قسەکانی لەسەر ئیسرائیل بدات. کاتێک من دەڕۆم تا دەمی دەرگە لەگەڵمدا دێت.

وەرگێڕەکەی پێشووم ئەحمەد، کە لە بەردەرگەیە لێم دەپرسێ چیم لێ پرسیوە؟

– ئەگەر ئەو وتبێتی، کە هیچ لە بۆمبارانی خەڵکی سیڤیلدا بەشدار نەبووە درۆی کردووە، چونکە لەو شوێنەدا کەوتە خوارەوە خەڵکی سیڤیلی

بۆمباران کردبوو، ژمارەیەک بنەماڵە بوون کە لە شوێنی تر بە هێسترێکەوە هەڵاتبوون و خۆیان گەیاندبووە شاخەکان. ئەو یەکەم هێرش ئەوانی نەپێکا و کە گەرمکی بوو جارێکی تر هێرش بکاتەوە خستمانە خوار. ئەو بەو جۆرەش، کە خۆی باسی دەکات بێ تاوان نییە. من مەیلەو دڵنیام، کە ئەو فڕۆکەوانی ئەو فڕۆکەیە بوو کە چەند ڕۆژ پێشتر گوندێکی بۆمباران کرد و دە ژن و منداڵی کوشت.

من لە ناخەوە هەوڵ دەدەم خۆم لە جێگەی ئەو، واتا ئەو گەنجە عێراقییە دانێم، کە لەناو مێگێکی رووسیدا دانیشتووە و لە ئاسمانەوە بۆ سەر گوندێک شەڕ دەبێتەوە بۆ ئەوەی باشتر دڵنیا بێت و دەست لەسەر دوگمەی بۆمبایەکەی دادەنێ تا مردن و فەوتاندن بەسەر گرووپێک ژن و منداڵدا لەو خوارەوە بڵاو کاتەوە. هەر ئێستە ئەو وەک هەر مرۆڤێکی تر وا ترسی پێوە دیار بوو، کە من بەزەییم پێدا هات ئەو تەنیا لە دیوێکدا دانیشتووە و ژیانی گەنجیەتیی خۆی لە بەین دەبات. بەڵام بەڕاستی چۆن لەگەڵ ویژدانی خۆیدا قسە دەکات؟

لە راستیدا ئەویش قوربانییەکی ئەم شەڕەیە، ئەویش دەیتوانی لەگەڵ فڕۆکەکەیدا بکەوێتە چاڵێکەوە و بمرێ، ئەو هێشتا ٢٣ ساڵی تەمەنە، کەچی هەر لە ئێستەوە ناخی پڕە لە رق و قین.

## تۆ دەبووا بڕۆی بۆ بادینان

ئەحمەد دەڵێ تۆ دەبوا سەردانێکی ناوچەی بادینان بکەیت.

بادینان؟

– ئەرێ، ئەم ناوچەیە لە لای ڕۆژاوا هەڵکەوتووە و شارەکانی دهۆک، زاخۆ و ئامێدی لەوێن. تۆ دەبوا ئەو بەشەی کوردستان ببینی، من خەڵکی ئەو ناوەم، دەتوانم لەگەڵت بێم. تۆ دەبێ بەرواریی بالا ببینی، دۆڵێکە راست لەسەر سنووری تورکیا. کاری خەڵکی ئەو ناوە بەرهەمهێنانی میوەیە، گەلێک گوند لەو ناوەن، کە هیچ بەر بۆمباران نەکەوتوون. لەبەر نزیکییان لە سنووری تورکیا عێراق ناوێرێ بۆمبارانیان بکات نەوەک بە هەڵە خاکی تورک بەر بۆمب کەوێ. من زۆر حەز دەکەم بەرواریی بالات پیشان بدەم.

کاتێک ئەحمەد باسی بەرواری بالا، ئەو دۆڵە جوان و دڵڕفێنەم بۆ دەکات من نەخشەیەکم نییە تا بزانم لە کام لاوەیە بەڵام لە فانتازیی خۆمدا شوێنێکی سەخت و هەڵەمووتم دێتە بەرچاو، بەهەشتێک لە پشت ئەو کێوانەوە. زوو بڕیاری خۆم دەدەم لەگەڵیدا بڕۆم.

پاش نیوەڕۆیەکی درەنگ بە سواریی لاندرۆڤەرێک بەڕێ دەکەوین، بۆ من ئەم سەفەرە روو لە شوێنێکی نادیارە و بۆ ئەحمەدیش زۆر و کەم هەر وایە. ئەحمەدیش هیچ لەم ڕێگەیەوە نەڕۆیشتووە، چونکە لە کاتی ئاشتیدا ڕێگەکە لە خوار، لەناو هەولێرەوە بۆ مووسڵ و دیسان لەوێوە روو لە باکور دێتەوە. بەڵام ئێستە ئەو ڕێگەیە بەستراوە و ئێمە ناچارین لە پشت شاخە بەرزەکانەوە بڕۆین تا لە دەست تۆپبارانی سوپای عێراق دوور بین و لەبەر

ئەوە تەیارە نەمانبینێ ناچارین بە تاریکی ڕێگە ببڕین. ئەحمەد دەبێژێ:

- ئێمە دەبێ لە چۆمێک بپەڕینەوە و چۆمەکەش پردی نییە. ڕەنگە شەو درەنگێک بگەینە ئەوێ، تەنیا چەند سەعاتێک ڕێگەیە تا ئەوێ و دواتر بزانین چۆن درێژە بە ڕێگەکەمان بدەین.

بەڵام دواتر دەردەکەوێ، کە ئەو بە تەواوی لەم بارەوە هەڵەیە.

شۆفێرەکەمان ناوی عەبدوڵڵایە و ئارامیی لە ڕادەبەدەری و شێوەی لێخوڕینی ژیرانەی جۆرە دڵنیاییەک بە من دەدا. هەر کاتێک لە حاڵەتێکی مەترسیدار تێپەڕ دەبێ - تێپەڕین بەلای کامیونێک لە باریکاییی جادەیەکی ترسێنەردا، ستۆپکردن لەسەر پێچێکی دۆڵێکی هەزار بەهەزار و... - سەیرێکی من دەکات و بە زەردەخەنەیەک، کە هەموو دەموچاوی گەش دەکاتەوە دەبێتە هۆی ئەوە منیش بزەیەک بکەم. جێی سەرسووڕمانە، کە چۆن بزەیەک دەتوانێ پێوەندییەکی وا قووڵ و مانادار دروست بکات.

ئێمە لەناو گەلاڵە، کە ڕۆژێک ناوەندی سەرەکیی شۆڕش بووە تێ پەڕین. ئێرە جیاوازییەکی زۆری لەگەڵ چۆماندا هەیە، لە چاو چۆمان ئێرە زۆر دواکەوتوو دێتە بەرچاو. گەلاڵە لە لێژاییییەکی سەختدا هەڵکەوتووە و ماڵەکانی لە پاڵ یەک و لەسەر شەقامێکی باریکدا ساز کراون. ئەم شوێنە چەندین جار لە مانگی نیساندا بۆمباران کرا و دژوارترینیان ڕۆژی ٢٩ هەمی مانگ بوو، کە ٢٠ کەس کوژران.

ئێمە دیسان بە دۆڵێکی تردا سەردەکەوین، هەورازێکی بەرز بەرەو لووتکەیەکی لە گیران نەهاتوو. جاروبار ماشینی تر و کاروانی خەڵک بە هێستر و ئەسپەوە دەبینین بەلاماندا تێ دەپەڕن و هەورێک لە تەپوتۆزی دەم ڕێگەکە هەڵدەستێ. لەناو یەکێک لەم کاروانانەدا کە بە لاماندا ڕادەبرن یەکێک لەو دیمەنە کورت، بەڵام جوانانە دەبینم کە بۆ پاشماوەی ژیانم لە بیرم دەمێنێ: کۆمەڵێک ژن بە هێسترەکانیانەوە ڕادەبرن، تۆزێک کە بە پێی

ئەوانەوە هەڵدەستێ روو بە خۆر بەرز دەبێتەوە و دیمەنێکی وا ساز دەکات، کە زیاتر لە خەون و خەیاڵ دەچێ. لە ڕێگەی یەکێک لەو شۆفێرانەوە، کە لەوسەرەوە دێت دەزانین ڕێگەکە لە لای "باڵەک" بەستراوە. شەڕی دژوار روویان داوە و تانکەکانی عێراق وا هاتوونەتە پێش، کە دەتوانن تەقە لە ڕێگەکە بکەن و ببنە هۆی بەستنی هاتوچۆی خەڵک. بە ناچاری بۆ لای باکور بادەدەینەوە و بەسەر شاخەکاندا دەگەینە ڕێگەیەک، کە چەند ساڵ پێش بۆ رۆژی وەک ئێستە، کە ڕێگەکەی تر بەسترا لە لایەن شۆڕشەوە ساز کراوە. ئەم ڕێگە سەربازییە زۆر دوورترە، بەڵام نە عەبدوڵڵا و نە ئەحمەد دەزانن چەندە دوورترە. بۆیە ئێمە بە نابەڵەدی درێژە دەدەین بە رۆیشتن بێ ئەوەی بزانین کەی دەگەینە شوێنی مەبەست.

ڕێگەکە زۆر سەختە و تەنیا لاندرۆڤەر و ماشینی باری دەتوانن پێیدا سەرکەون. خۆر لە لای دۆڵەکەی خوارەوە ئاوا دەبێت بەڵام عەبدوڵڵا تا بە تەواوی هەوا تاریک دادێ بۆ پاراستنی باری تەناهیی جێگەکە بێ چرا لێ دەخوڕێ، دوای ئەوە زۆر تێ دەپەڕین و دەگەینە پشت کێوێکی بەرز ئەو کات چرای ترۆمبێلەکەی دادەگیرسێنێ.

لە ڕێگەدا تووشی گەلێک کامیۆن دەبین، کە باری گرانیان پێیە و بە سەختی سەردەکەون. هەروەها زۆر ترۆمبێلی تر، کە بە پێچەوانە لەو لاوە بە خاڵی دێن و لێمان تێ دەپەڕن. من شتێک لەم ناوچەیە ناتوانم ببینم بەڵام جاری وایە هەست دەکەم، کە لە جێگەیەکی زۆر بەرزین – لە دوورەوە چەند ئاگرێک دەبینم لە خوارەوەی ئێمەوە دەبریسکێنەوە. وەک ئەوە دێتە بەرچاوم، کە بۆ "فەزا" برۆین.

عەبدوڵڵا چەند جارێک رادەوەستێ و لەگەڵ ئەو خەڵکەی لەوسەرەوە دێن پرسیاری ڕێگە لە یەکتر دەکەن، لێرە پێوانەی ڕێگە بە کات و سەعاتە و هەواڵێک لە کیلۆمەتر نییە:

چەندی ماوە بۆ گەلاڵە؟

- شەش سەعات.

ئەی بۆ بلێ؟

- نێزیکەی شەش سەعات.

ئێمە بە دۆڵێکدا تێ دەپەڕین ناوی حەسەن بەگە و دەوترێ جوانترین دۆڵی کوردستانە. من لەبەر تاریکی هیچ نابینم، لە ئاسمانەوە تەنیا ئەستێرە دیارن و درەوشانەوەی کەوانەی مانگ.

عەبدوڵڵا پڕی ٥ دۆلکە بەنزینی زیادی پێیە و لە ڕێگە حازر دەبێت یەکێکیان بە شۆفێری لاندرۆڤێرێک، کە پڕە لە پێشمەرگە و وەک پێویست بەنزینیان پێ نییە تا دەگەنە گەلاڵە، بفرۆشێ. پیاوێک بە چرا قوتوومەکەوە دێتە سەر ڕێگەمان و گەرمکیە بزانێ ئێمە هەواڵی نوێی بەرەی شەڕمان پێیە؟ ئەو بیستوویە ڕۆژی پێشتر شەڕێکی گران لە لای "باڵەک" رووی داوە و پێشمەرگە سەخت خۆڕاگرییان کردووە. ئەو لەبەر ئەوە پاتریی رادیۆیەکەی تەواو بوون ناتوانێ گوێی لە هەواڵەکان بێ لەو ڕێگەیەوە، هەر بۆیە روو لە ئێمە دەپرسێ شتێک دەزانن؟

- نا ئێمەش گوێمان لە ڕادیۆ نەگرتووە.

لە جێگەیەک دەگەینە چۆمێک پردێکیان بە شێوەی کاتی بەسەردا ساز کردووە و ئێمە پێدا تێ دەپەڕین. ئەحمەد دەڵێ عێراق پردەکەی بۆمباران کردووە و رووخاندوویە، لای نیوەشەو دەگەینە "بلێ" جێگەیەک، کە وا دیارە خاڵی پێوەندی و نێوەڕاست بێت بۆ ئەو گرێدانە لاوازەی نێوان ڕۆژهەلات و رۆژئاوای ئەم ناوچەیە. من هەوڵ دەدەم لەم شوێنە نوێیەدا بەرزایی، دۆڵ و دەشت لێک جیا کەمەوە بەلام دەردەکەوێ هەوڵەکەم بێ سوودە چونکە شتێک بە ناوی دەشت لەم بەشەی کوردستاندا نییە.

ئێمە دەچینە ناو دیوێکی گەورە، کە چرا پریمزێکی تێدایە، پێشمەرگە بە چەکەکانیانەوە بێدەنگ لەسەر تەختێکی چوارگۆشە دانیشتوون و بە خۆشحاڵییەکی زۆرەوە سەیری من دەکەن. دەست بە چاخواردنەوە دەکەین، کوڕێک لە سووچێکی ماڵەکەدا ئاگر دەکاتەوە و پاش ماوەیەکی کورت برنجمان بۆ ساز دەکات. من لە پێشمەرگەکان دەپرسم وا دیارە نابێت زۆریش لە بەرەی شەڕ دوور بین:

– ئەرێ، لە ماوەی ڕۆژدا شەڕێکی گران هاتە گۆڕێ، ڕێژیم بە تانک هێرشی کرد و ئێمە توانیمان ٨ تانک بسووتێنین بەڵام نەمانتوانی پێشی هێرشەکەیان بگرین و تەپۆڵکەیەک، کە لە ڕێگەکەش نزیکە کەوتە دەست ئەوان و لەوێوە دەوروبەر دەکوتنەوە، هەر بۆیەشە ئێستە ڕێگەکە گیراوە.

هێشتا دوو سەعاتمان ماوە بگەینە چۆمێکی تر، بە تاریکی و بە ناو دۆڵی بارزاندا تێ دەپەڕین. دوای سەعاتێک دەگەینە گوندێکی تاریک – ئێرە گوندی بارزانە – و درێژە بە ڕێگەکەمان دەدەین. ڕێگەکە زۆر دژوارە و گوایا تەنیا چەند حەفتە پێش لە لایەن شۆڕشەوە ساز کراوە و ماشینەکەی ئێمە لەو هەوەڵین ترۆمبێلانەیە، کە پێدا ڕەت دەبێت. لە ڕێگە یەکێک لە تایەکانمان پەنچەر بوو و دوای زەحمەتێکی زۆر لای سەعات ٥ی بەیانی و لە کاتێکدا خەریک بوو هەوا ڕووناک بێت گەیشتینە لای چۆمەکە. چۆمێکی گەورە و بەرینە، لێرە پێی دەڵێن "ڕیبەشین" بەڵام لام وایە ئەو چۆمەیە، کە لە نەخشەکەی مندا ناوی زێی گەورە و یەکێک لە لقەکانی چۆمی دیجلەیە. کیسە خەوەکەم دەکەمەوە تا تۆزێک بخەوم بەڵام زۆر ناخایەنێ ئەحمەد هەڵم دەستێنێ و دەڵێ کاتی ڕۆیشتنە. عەبدوڵڵا ماڵاوایی کردووە و گەڕاوەتەوە . ئەو هەر بەو ڕێگە درێژەدا، کە هاتووین دەبێت بگەڕێتەوە بۆ چۆمان بەڵام بێگومان لە بلێ ڕێبواری دەست دەکەون چونکە پڕە لە پێشمەرگە، کە دەیانەوێ بۆ حەسانەوە بڕۆنەوە بۆ لای چۆمان.

له خوارەوەی ئێمە لای ئاوەکەوە کۆمەڵێک پیاو بە هێسترەکانیانەوە کۆ بوونەتەوە و چاوەڕوانی خۆرهەڵاتن و کاتی پەڕینەوە دەکەن. "کەشتییەک" کە خەڵک لە کۆمەڵێک سیم و تەختە سازیان کردووە و چوار پیاو لەمسەر و لەوسەرەوە و هەر کامیان بە دارێکی درێژەوە ئاوەکە دەشڵەژێنن هاتوچۆی پێ دەکەن لەو بەرەوە دەگاتە ئەمبەر و ئێمە سوار دەبین، خەڵکی بارەکان دەخەنە سەر ئەم کەشتییە و هێسترەکانیش بە مەلە دەپەڕنەوە. هێندێک لە وڵاخەکان خۆیان بە دڵخواز دەپەڕنە ناو ئاوەکە و هێندێکیش بە پەت ڕاکێشی دوای کەشتییەکە دەکرێن.

لەوبەری چۆمەوە لە کەپرێکدا نان و چایەک دەخۆین و دوای سەرکەوتن لە هەورازێک لاندرۆڤێرێک دەگرین و بەرەو ئامێدی وەڕێ دەکەوین. دۆڵێکی بەرین و گەورە باوەشمان بۆ دەکاتەوە بەڵام لە لای باشوورەوە هێشتا لە پەنای دیواری بەرزی کێوەکاندایین. لە ڕێگە تەنیا تووشی یەک ئاوەدانی دەبین، دەچینە خوار بۆ سەر کانییەکە، ئاو دەخۆینەوە و جگە لە چەند ژن و منداڵ و پیاوی بەساڵاچوو کەسی تری تێدا بەدی ناکرێ. ئەحمەد دەڵێ:

من پێش مانگێک لێرە بووم، گوندەکە بە تەواوی چۆڵ بوو، کاتی بۆمبارانەکە بوو... کەس نەیدەوێرا لێرە بمێنێتەوە. بەڵام ئێستە خەریکە خەڵک دەگەڕێنەوە، سێ حەفتەیە هیچ بۆمبارانێک لە بادینان ڕووی نەداوە ئێمەش هۆیەکەی تێ ناگەین.

سەعات دەی بەیانی، دوای بڕینی ١٨ سەعات ڕێگە و بە ماندوویەتییەکی زۆرەوە گەیشتینە شاری ئامێدی. شارێکی جوان و دیمەنێکی خەیاڵیی هەیە.

ئامێدی لە دۆڵێک و بە لالێژێکەوە ساز کراوە، لالێژێکی زۆر هەڵەمووت، کە لە لای لووتکەوە هێندێک ئارام دەشێتە. ئەم جێگەیە شاری ئارام و سەربەستی "سانمارینۆ"ی ئیتالیا وەبیر من دێنێتەوە، یان قەڵای کێوینی

"ماسادا" له ئیسرائیل. بەڵام ئامێدی لەو شوێنانەش خەیاڵیترە.

تەنیا یەک ڕێگە بۆ چوونە سەر هەیە، ڕێگەیەکی باریک و پێچاوپێچ، کە لە کێوەکەدا هەڵکەنراوە. بەو ڕێگەیەدا هەڵدەزنێین و دەگەینە دەروازەی شار. ڕاست وەک ئەوە وایە بڕۆیتە ناو مێژووی چەرخەکانی ناوین. ئاخر بێگومان ئامێدی لە چاو سەدان ساڵ پێش ئێستە گۆڕانێکی تایبەتی بەسەردا نەهاتووە؟ ئەحمەد لەم بارەوە دەبێژێ:

دەگێڕنەوە، کە سەردەمێکی زۆر کۆن، دوژمنێک ئامێدی ماوەی هەشت ساڵ دەورە گرتووە بەڵام شارەکەی بۆ نەگیراوە.

بنەماڵەی ئەحمەد لێرەن و ئەو من دەباتە ئەوێ. ماڵێکی زۆر کۆن و دەتوانم بڵێم لە ماڵە هەرە کۆنەکانی ئەم شارەیە، کە بێگومان تەمەنی لە سەد ساڵ پترە.

تەمەنی ئەحمەد ٢٣ ساڵە بەڵام ئەو لێرە لەدایک نەبووە، لە بامەڕنی گوندێک هێندێک ئەولاتر بۆ لای ڕۆژاوا. باوکی بازرگانە - یان بازرگان بووە - چونکە ئێستە پیرە و بە وتەی ئەحمەد هیچ کارێک ناکات.

ئەحمەد دوو خوشک و برای ڕاستی و لەبەر ئەوە باوکی دوو ژنی هێناون شەش خوشک و برای باوکیشی هەن. پێم خۆشە زیاتر لەسەر بنەماڵەی بزانم بەڵام ئەحمەد زۆر کەم قسەیە و بە هاسانی شتی لێ دەرنایە.

کاتێک ئەحمەد بێ ئاگەداری و لەگەڵ بیانییەکدا دەگەڕێتەوە ماڵ دەبینم لە نەبوونی باوکیدا، کە ئێستە لە سەفەرە لە لایەن زڕدایکی و خوشک و براکانییەوە زۆر بەڕێز و حورمەتەوە پێشوازیی لێ دەکرێ. ئەو لەناو منداڵەکاندا تەنیا کەسێکە لە ئاستی زانستگەدا دەرسی خوێندووە:

بەڵام گشت خوشک و براکانم - بە کچەکانیشەوە - دەڕۆنە قوتابخانە بۆ ئەوەی هەر کامەیان بەشی خوێندن و نووسین فێر بن.

لە پلەکانێکی نیوە رووخاوەوە دەچینە خوار، باوەژنەکەی ئەحمەد، کە ژنێکی بالابەرز و قژکاڵە و دەبێت بە گەنجی زۆر جوانیش بووبێت دۆشەکمان لەسەر زەوی بۆ رادەخات. کۆڵ و ئەسپاوەکان لە خۆمان دەکەینەوە و لاقی لێ رادەکێشین. دوای ماوەیەک باوەژنی ئەحمەد لەناو سینییەکی گەورەدا خواردنمان بۆ دێنێ، کە بریتییە لە برنج، گۆشت و تەماتە و لە تەنیشتییەوە هێندێک (ترێ)ش دانراوە. دوای نانخواردن رادەکشێین و بۆ خۆمان سەرخەوێک دەشکێنین.

بە رۆژدا گەرمای ئێرە هێندە زۆر دەبێ، کە بەرگەگرتنی دژوارە و شار بە تەواوی چۆڵ دەبێت. ئەحمەد لەم بارەوە دەڵێ:

- خەڵکی دەڕۆنە خوار بۆ ناو دۆڵ، لەم وەرزەدا هەموو لەوێن و خەریکی مووچە و مەزرای خۆیانن.

پاش نیوەڕۆ دادەبەزینە خوار بۆ ناو دۆڵ و بە ناو سەوزەلانی و دارستانی جواندا تێ دەپەڕین، کە هاژەی ئاوی زولاڵ و سارد لە هەر لاوە دێتە گوێی مرۆڤ. باخ و موڵکی خەڵکی راست لە داوێنی شاردا هەڵکەوتووە و لێرە هەموو جۆرێک مێوە وەک ترێ، قەیسی، هەڵووژە و سێو بەرهەم دێن و لەناو ئەم سەوزەلانییەدا دارگوێز... . و سنەوبەری بەرز بەرز روو لە ئاسمان هەڵکشاون.

خەڵکی شار لەناو باخەکانیان و لە "سۆلاف" لە دەربەندێک رووبەڕووی لووتکەی ئامێدی دەمێننەوە. لە سۆلاف هۆتێلێکی تووریستی ساز کراوە و بە هۆی شەڕەوە هێشتا کارەکەی ناتەواو ماوەتەوە. ئەم هۆتێلە بەشێکی وەک نەخۆشخانە و بەشێکیشی وەک شوێنی مانەوەی ئاوارە بەکار دێت. جۆگەئاوێک بە توندی لە دەربەندەکەوە دێتە خوار و ئێمە بە شوێن ئاوەکەدا سەر دەکەوین بۆ سەرەوە. لە هەر چواردەوری ئاوەکەوە خەڵک دانیشتوون، ئێمە رادەوەستین تا هێندێک پرسیاریان لێ بکەین. تێکڕای ئەم خەڵکە ئاوارەن و هەر کەسە کەپرێکی ساکاری بۆ شوێنی حەوانەوەی خۆی ساز

کـردووه. بە دوای ئـاوەکـەدا دەڕۆین تا دەگـەینـە سـەرچاوەکـەی، کـە لـە بنی شاخێکدا دێتە دەر. دەموچاومان بە ئاوە ساردەکە فێنک دەکەینەوە. دەگەینە نووسینگەی پارێزگار، کە کەمێک خوارتری هۆتێلەکەومیە. ئەویش لە دەست گەرما هەلاتووە ، ئامێدی بەجێ هێشتووە و رووی لەم سێبەر و فێنکاییە کردووە.

مێزی نووسینگەی پارێزگار لەژێر کەپرێک و لە پەنای تاڤگەی ئاوەکەدایە. مێزێکی نووسین و چەند دانە کورسی بۆ میوانان. پارێزگار ناوی "ئەحمەد سـالحی" و بەرپرسی پـارێزگـەی دهـۆکـە. هەڵبـەت جگە لەم پارێزگـارە پارێزگارێکی تر لە دهۆک هەیە، کە لەژێر دەست و فەرمـانی رژێمدایە بەلام سـالحی لە لایەن ڕێبـەری شـۆڕشـەوە دانراوە و تـەنیـا بـڕیار لە چۆمـانەوە وەردەگرێ.

من لـە پارێزگـار سـالحی دەپرسم ژمـارەی دانیـشـتـوانی ئەم دەڤـەری ڕۆژاوایە چەندە؟

- بە پێی دوایـین ئامـارەکـان دەوروبەری ۲۰۰۰۰۰ کـەسە بەلام ئەمـە پێش ۱٦ سـالان بوو، ئێستـە زۆر زیاترن، رەنگە ئێسـتـە پارێزگـەی دهۆک نزیکی نیـو ملیۆن کـەس بن. کێشـەی مـەزنی ئێمـە خـۆراکە، وەک پێویست بەشی زستان خواردنمان نییە. زستـانەکانی ئێرە زۆر سەختن و بەفری زۆری لێ دەبارێ. ئێمە بە تەواوی دەورەمـان گیراوە و لە هیچ لایەکەوە یارمـەتیمان پێ ناگـات. ئەوان لە چۆمـانەوە بەڵێنیـان داوە ئەوەی پێویسـتـمانە بۆمان بنێرن. جگە لە خـواردن، چەکی دژە هەوایی و تۆپیـشـمــان پێـویسـتـە. بەڵێنی ئەوەشیان پێ داوین.

ئەو دەڵێ "ئـەوان" و ئـەمـەش سـەرنجی مـن رادەکـێشێ. دیارە مـەبـەسـتی لەوان ڕێبـەری شـۆڕشـە لە چۆمـان بەلام کـاتێک دەڵێ "ئەوان" و ناڵێ "ئێـمـە" لای من پرسـیـار دروست دەکـات. کـاتێک لـە دەرەوە دانیـشـتووین و خـەریکی

چاخواردنەوەمین من لەبەر خۆمەوە بیر دەکەمەوە و بەم شێوەیە لە دۆخی ئەم ناوچەیە حاڵی دەبم:

دەوڵەت خەریکە ئەم ڕێگەیە، کە ئێمە پێیدا هاتین داگیر بکات و ئەم تاقە پێوەندییەی نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاواش بپسێنێ. ڕێگەی ئێرە تا بلێی هاتوچووی زۆری لەسەرە بەڵام دوای ئەوە دەبێتە چۆمەکە و لە ڕاستیدا ئەو چۆمەشە ڕۆڵی سنوورێکی ڕاستەقینە لەم نێوانەدا دەبینێ.

بەڵام سەراسەری ئەم ناوچەیە گرێدراوی ئەو پێوەندییە لەرزۆکەیە و هەموو یارمەتی و پێوەندییەک لەگەڵ دنیای دەرەوە هەر لەو ڕێگەیە و بەسەر ئەو چۆمەدا مومکینە. سنووری تورکیا داخراوە و سنووری سووریاش هەروەتر، لای خوارووش بەرەی شەڕەکەیە.

لە ڕۆژهەڵات دۆخەکە بە تەواوی جیاوازە، ڕێگەی ئێران کراوەیە و لەوێوە دەکرێ خواردن، بێنزین و چەکوچۆلیش بێتە ناو، بەڵام دەبێ دۆخەکە لە بادینان چی بەسەر بێت ئەگەر زستان بێت و ئەم خەڵکە چۆن لەو حاڵەدا بیبەنە سەر؟

ڕەنگە هۆی ئەوەش بێ، کە دەوڵەت وازی لە بۆمبارانی ناوچەکە هێناوە و هێرشەکانیش وەک لای ڕۆژهەڵات سەخت و بەرفراوان نین هەر ئەوە بێت؟ ئەوان حیسێبی ئەوە دەکەن، کە برسییەتی کاری خۆی دەکات و وا دیارە تاکتیکی ئەوان لەسەر ئەوە ڕاوەستاوە. ئەمە بارێکی زۆر جیدییە بەڵام بلێی ڕێبەران لە ڕۆژهەڵات بە تەواوی ئەمە تێ گەیشتبن؟ دوکتۆر مەحموود هیچێکی لەم بارەوە نەوت کاتێک من دیدارم لەگەڵدا کرد. ئاخر من پێشتر لە "بیافرا"ش (بەشێکی وڵاتی ئەفریقایی نێجیرییە، کە سەردەمێک خەباتێکی خوێناوی بۆ سەربەخۆیی لە ئارادا بوو - وەرگێڕ) بووم، لەوێ بینیم چۆن برسیەتی خەڵکی ئەو جێگەیەی بە چۆکدا هێنا. هەوڵ دەدەم خۆم لە بەراوردکردنی کوردستان و بیافرا بپارێزم بەڵام ئەم کارە دژوارە و

ئەزموونی ڕابردوو خۆیان لە لام زیندوو دەکەنەوە. لە بەرچاوم روونە و لەبەر خۆمەوە دەڵێم:

دەوڵەت خەریکە بیافرایەکی نوێ لەم ناوچە دوورەدەستەدا لە بادینان بئافرێنێ. بێ گومانم، کە زستان گەیشت برسییەتیش دەگاتە ئێرە.

من دەبێ دیسان دوکتۆر مەحموود یان ئیدریس بارزانی ببینم. ئەی بۆ پارێزگار دەیگوت "ئەوان" بەڵێنیان داوە کێشەکە چارەسەر بکەن؟ بۆ نەیوت خۆمان هەوڵ دەدەین چارەسەری بکەین؟

شوێنی دانیشتنەکەمان زۆر جوان و دڵڕفێنە، من لێرەوە هەڵدێرەکانی ئامێدی و دۆڵەکەی خوار شار بە گشت باخەکانیەوە دەبینم. خەریکی چای شیرین خواردنەوەین و کوڕێکی گەنج خەریکی گەڕاندنی ئاوە بەسەر خەڵکەکەدا. لەسەر تەختەکانی دەوروبەرمان پێشمەرگە بە چەکەوە دانیشتوون و زۆربەیان بێدەنگ و تەنیا سەیری وڵاتە جوانەکەی خۆیان دەکەن و چێژ دەبەن. وا دێتە بەرچاو، کە ئەم پێشمەرگانە بە سەیرکردنی ئەم جوانییە هێزیان وەبەر بێتەوە و بە باوەڕ و ورەی زیاترەوە بگەڕێنەوە بۆ بەرەی شەڕ.

کوڕێکی گەنج کە لە پەنای من دانیشتووە بە ئینگلیزی لێم دەپرسێ من خەڵکی کوێم، من پێی دەڵێم سوێدیم. ئەو زۆر باش دەزانێ سوێد لە کوێیە و زۆریش خۆشحاڵە، کە من لێرەم. ئەو دەگێڕێتەوە، کە برا گەورەکەی دوو حەفتە پێش لە لایەن عێراقییەکانەوە کوژرا:

- براکەم لە مووسڵ دەژیا، ناوی فارووق ئیسماعیل لینکی و ٢٤ ساڵ تەمەنی بوو. ئۆتۆمۆبێلێکی هەبوو و لەو ڕێگەیەوە یارمەتیی شۆڕشی دەکرد تا خواردن بگەیەنێتە هێزی پێشمەرگە. براکەم لە لایەن سەربازێکی عەرەبەوە ئاشکرا کرا، من بیستبووم کە گیراوە و دواتر پەیام هات، کە هەڵیان واسیوە. کچێکی دوو ساڵە و کۆرپەیەکی ساوای لە دوا بەجێ ماوە.

ژن و منداڵەکانی لە مووسڵ بەجێ ماون.

ئەم کوڕە بۆ خۆی ناوی ئیسماعیلە، تەمەنی ١٩ ساڵ و لە ئامێدی مامۆستایە:

– ئێمە چوار برا بووین و من بچووکی هەمووان بووم. کاتێک بیستم براکەم گیراوە ویستم بڕۆم بۆ مووسڵ بەڵکو بتوانم سەربەستی کەم بەڵام کەس هاوکاریی نەکردم. من دەبێت ئاگام لە ژنی براکەم بێت و کوردستان رزگار بوو زەماوەندی لەگەڵدا بکەم. ئەویش ئامۆزای خۆمە.

من لەو دەپرسم ئاخۆ ئەو ژنی براکەی خۆش دەوێ؟

– ناوەڵڵا، بەڵام ئەمە نەریتی ئێمەیە و پێشم وایە نەریتێکی باشە. من نامەوێ لەو رەسم و نەریتە لابدەم، من براکەم خۆش دەویست و ئەرکی سەرشانیشمە ئاگام لە ژن و منداڵەکانی بێت. بنەماڵەی براکەم بنەماڵەی منیشە و منداڵەکانی ئەو منداڵی منیشن. من ئێستە زگورتیم، بەڵام دەبێ ژنی برایەکەم مارە بکەم.

ئیسماعیل چەند وێنە و لەوانە وێنەیەکی براکەیم پێشان دەدات:

– سەیری کە، ئەوە براکەمە لەگەڵ دوو سەربازی عەرەبدا. ئەوانە دۆستی براکەمن، هەمووان خۆشیان گەرەک بوو و گەلێک دۆستی عەرەب و کوردی هەبوون، بەڵام ئێستە فاشیستەکانی بەغدا ئەویان لە ئێمە سەندووە و کوشتوویانە.

## کەس گوێی بۆ ئێمە شل نییە

ئەحمەد هێسترێکی بەکرێ گرتووە و هەوەڵی بەیانی لە بەردەرگە ئامادەیە. بڕیارە بڕۆین بۆ بەرواریی باڵا لەسەر سنووری تورکیا. بۆ چوون بۆ ئەو جێگەیە ڕێگەی ترومبێل نییە و تەنیا ڕێگەی وڵاخ و ئەویش دەبێت بەسەر کۆمەڵە شاخێکی بەرز لە باکوری ئامێدییەوە سەرکەوین. خاوەنی هێسترەکە ناوی ساڵح و وەک عەبدوڵڵای شۆفێری لاندرۆڤێرەکە، لە چۆمانەوە هێنامانی ئارام و لەسەرەخۆ دێتە بەرچاو. من و ساڵح هیچ قسەیەک پێکەوە ناکەین، تەنیا سەیری یەکتر دەکەین، بە بزەیەک وەڵامی یەک دەدەینەوە و ئەمەش بۆ هەمیشە دەمانکاتە دۆستی یەکتر.

ساڵح هەموو کۆڵەکەمان - کیسە خەو و ساکەکەی من و کۆڵەپشتەکەی ئەحمەد - دەخاتە سەر پشتی هێسترەکەی و وە ڕێ دەکەوین. بەڵام هێسترەکە ناڵی پێشەوەی نەماون و بۆ ئەم ڕێگە سەخڵەتە پێویستە لابدەینە لای ناڵبەندێک و "پێڵاوی تازەی" بۆ بکڕین.

من و ئەحمەد بە ناو دارستانەکەدا هەڵدەکشێین و ساڵح و هێسترەکە لە ڕێگەیەکی ترەوە دەڕۆن. بەیانییەکی سەرنج ڕاکێشە و ڕێگەی بەرواریی باڵا لە تەنیشت کانییەکەی دەربەندەوە دەست پێ دەکات. کاتێک ئێمە خەریکی سڕینەوەی ئارەقەی دەموچاومان و ئاوخواردنەوەین ساڵحیش دەگات و هێسترەکەی دێنێتە سەر ئاو. سەیرێکی لووتکەی شاخ دەکەم، زۆر بەرز و بەسام دێتە بەرچاو. من بۆم دژوارە بە کێواندا هەڵگەڕێم، لە ڕاستیدا من پیاوی دەشتاییم، هەناسەم سوارە و بڕینی هەر مەترێکی ئەم هەورازە ئازارێکە بۆم. زەحمەتە بێ یارمەتیی هێسترەکە بتوانم بڕۆمە سەر.

هەرچەند زەحمەتە تێ بگەم، کە ئەم هێسترەش چۆن هێزی سەرکەوتن لەم بەرەوژوورەی هەیە، دیسانیش کاتێک ساڵح رای دەگرت و بە دەست حاڵیم دەکات تا بڕۆم سوار بم لێ راناوەستم و ئەو کارە دەکەم. ساڵح هەوساری هێسترەکە بەردەدا، بۆ خۆی لە دواوە لێ دەخوڕێ و بێ وچان و راوەستان تا سەر لووتکەی شاخ دەڕۆینە سەر.

لە ماوەی چوار رۆژاندا فێری هێز، توان و لەسەرخۆیی لەدوانەهاتووی هێستر دەبم بەڵام هێشتاش سەرم سووڕماوە لەم گشتە توانە. گیان لەبەرێکی لەم چەشنە سەرکەوتنی ئاشکرای سروشتە بەسەر تەکنیکدا. دیار و ئاشکرایە هیچ لاندرۆڤەر، تراکتۆر یان تانکێک ناتوانێ بەم رێگەیەدا، کە هێسترەکان بە بارەکانیانەوە رۆژانە دەیبڕن سەرکەوێت. سەدان ساڵ و رەنگە هەزاران ساڵە هێستر بۆ ئەم کارە و ئەم مەبەستانە لەم جۆرە شوێنانەدا بە کار دەبرێ.

کاتێک من سوار و لاقم بە دەوری ملی هێسترەکەدا شۆڕ کردوونەتەوە ساڵح لە دواوەیە و دارێکی بە دەستەوەیە، بەڵام قەت بە کاری ناهێنێ و تەنیا ئەو کاتە هێسترەکە لە شوێنێک راوەستا و گومانی لە رۆیشتن کرد دارەکە رادەوەشێنێ هەرای لێ دەکات.

هێسترەکە زۆر بە وردی رێگە دەبڕێ، رێگەکە دەخاتە ژێر کۆنترۆڵ و هەردەم هۆشیارانە جێگەی ناڵەکانی هەڵدەبژێرێ. قەت لە بەینی دوو بەردانەوە، کە بۆ تێپەڕینی تەنگەبەر بێت رەت نابێت و هەوڵ دەدات رێگەی تر هەڵبژێرێ و هەمیشەش رێگەی دروست و لەبار هەڵدەبژێرێ... ... ... . . .

لێرە لە کوردستاندا هێندێک گوێدرێژیش هەن و خەڵکی بۆ راگواستنی کەلوپەل بەکاریان دێنن. هێندێک جار لەم رێگەیەدا بە کاروان دەیانبینین و بەباری گرانەوە لە هاتوچۆدان... ... ... گوێدرێژ وەک هێستر توانی بارهەڵگرتنی زۆریان نییە و ئەسپیش زیاتر بۆ سواری بەکار دێ. دەکرێ

بلێین بە بێ هێستر و ڕۆڵی ئەو، ژیان لە کوردستان ڕادەوەستێ. هەموو ڕۆژێک و تەنانەت شەویش سەدان کاروانی هێستر لەمسەر بۆ ئەوسەری ئەم وڵاتە خەریکی گواستنەوەی خواردن، سووتەمەنی و چەکوچۆڵن بۆ خەڵک و بۆ بەرەکانی شەڕ.

جارێک لەگەڵ ژمارەیەک پێشمەرگەدا گوێم لە ڕادیۆ گرتبوو باسی هێرشێکی پێشمەرگەی دەکرد، کە تێدا کورد ٢٠ کلاشینکۆف، ژمارەیەکی زۆر فیشەک، ٢ ئار پی جی، ٢ بێسیم و ٩ دانە هێستریان دەست کەوتبووە. پێشمەرگە زۆر ئاسایی گوێیان گرتبوو کاتێک چەک و چۆڵ و بێسیمەکانی خوێندەوە بەڵام کاتێک ناوی هێسترەکانی هێنا ڕەنگیان ڕوونتر بووەوە و لە کاتێکدا سەیری یەکیان دەکرد سەرێکی ماناداریان بۆ یەکتر ڕادەوەشاند.

ئەو دۆڵەی لە سۆلاقەوە دێت و بەرەو کێوەکانی باکور دەڕوات یەکجار زۆر قەرەباڵغە و لە هاتوچۆی کاروانچییان جمەی دێت. ئەحمەد دەڵێ:

– ئەم ڕێگەیە پێشتر لە لایەن ئینگلیزەوە ساز کراوە و ئەوان لەم پشتەوە بنکەیەکی سەربازییان هەبوو هێشتاش وێرانەکانی دەبینرێن. لە دەربەندەکە جۆرێک پلیکانەیان ساز کردبوو، کە ئێستە بەردەکانی لەژێر ناڵی هێستراندا ساف و سوواون.

دوای دەربەندەکە ئێمە سەرمان بە دەشتاییەکەوە دەردەچێ، کە لێرە و لەوێ هێندێک دەوەن و بنچکی لێ ڕواون و بەر و سەمەرێکی زەردیان هەیە، کە گوایە دەشخورێن. جڵەیەک مەڕ لە دوورەوە دەبینرێن، کە بە لالێژێکەوە خەریکی لەوەڕن، ئێمە هێشتا هێندێکمان ماوە بگەینە لووتکە بەڵام خۆشیی ئەم وڵاتە جوانە لەوەدایە لێرەش، لەم لووتکە بەرز و بیابانەشەوە کانی و ئاوی لێیە و ئێمە، کە دیسان تینوومانە پڕ بە پێستیەتی لادەین و ماندوویەتییەک دەرکەین. ئامێدی بە حاڵ لە دوورەوە دەبینرێ، ئێمە دەچینە سەر کانییەکە، تاوێک ڕادەوەستین و ئاوێکی سارد دەخۆینەوە.

کە دەگەینە سەر یاڵەکە من لە هێسترەکە دادەبەزم، چونکە ڕۆیشتنی بەرەوخوارم لا هاسانە. دەگەینە ناو دارستانێکی چڕ و بە جۆگە و گوێ کەناڵێکدا درێژە بە ڕێگە دەدەین. دواتر بۆم دەردەکەوێ، کە لە گشت شوێنێکی ئەم وڵاتەدا جۆگە و کەناڵی پێچاوپێچ بە بناری هەڵدێرەکاندا تێ دەپەڕن، باخ و بێستان، مووچە و مەزرای گوندنشینان تێرئاو دەکەن.

لە هەوەڵین ئاوەدانی لادەدەین تا خواردنی ناو کۆڵەکەمان بخۆین، سەرەتا لە کەنارێکەوە رادەوەستین بەڵام زوو پەشیمان دەبینەوە و دەڕۆینە ماڵێک، ژنی خاوەن ماڵ لە کەپرێکی گەڵاییندا بە ماست، کە لە شیری بزن سازی کردووە و چایی پێشوازیمان لێ دەکات.

ئێمە درێژە بە ڕێگەکەمان دەدەین، جاروبارێش من سواری هێسترە ماندووەتی نەناسەکەمان دەبم و هێندێک جاریش بە پێ لەگەڵ ئەواندا ڕێگە دەبڕم. دەگەینە دۆڵێکی چۆڵ و هۆڵ، هێندێک مانگا خەریکن دەلەوەڕێن و ڕووبەڕوومان بەرزاییەکی پڕ لە ئەشکەوت و کونەبەردە. لە پشتەوەی ئەو کێوەوە لووتکەیەکی بەرزتر دەردەکەوێ، بەرواریی باڵا لەوێیە.

هێڵێکی تیژی ئاسۆییە - سنووری تورکیا لەو سەرەوەیە:

ئێرە ئاخری ئەم دنیایەیە. هیچ کەس لەوێوە دەرباز نابێت. لە لای خوارەوە، ئەو تەپۆڵکە زەردهەڵگەڕاوانە، بنچکێک لێرە و لەوێ، دۆڵەکەی لای خوار و سنەوبەرەکانیش وەک نیشانەی سەرسووڕمان دەچن. ڕاست وەک ئەو جێگەیە دەچێ، کە ئینجیل باسی دەکات. هەم ئینجیل و هەم قورئان بەم شێوەیە باسی باخی عەدەن دەکەن. دەبێت ئەوانەی یەکەم جار ئەو شوێنەیان بینیبێ خەڵکی دەشتەکی بووبن و کاتێک دۆڵ و شاخ و باخاتێکی لەم جۆرەیان بینیبێ و بۆ هەتایە خەونیان پێوە بینیبێ.

دەچینە خوار بۆ ناو دۆڵ و سەوزەڵانییە فێنکەکان، خوڕەی ئاوی کانی دێتە گوێمان و ژنێک لەسەر کانی خەریکی پڕکردنی زەرفی ئاوەکەیەتی.

پیاوێک دەڵێ بەخێر بێن بۆ "کانی ماسی" کە ناوی گوندەکەیە و بە کۆڵانێکدا پێشمان دەکەوێ بۆ باخەکەی خۆی. باخی ئەم کابرایە سەمەرێکی لە ئەندازەبەدەر، لەوانە سێوی گەورە گەورەی گرتووە، تازە کاتی گەیشتنیان هاتووە و خەریکی داوەرینن.

- ئێمە ناتوانین ئەم میوانە بفرۆشین. دەبێت لێیان گەڕێن تا لەسەرە خۆیان دەگەنێ.

من پێشتر قەت سێوی لەم جۆرەم نەبینیون، هەم سوور و هەم زەردن.

- فەرموون، بخۆن شەرم مەکەن.

من دوو دانە سێو دەخۆم و دووی تریش هەڵدەگرم، خاوەن باخ بەناو میوە و دارەکانیدا دەمانگێڕێ، ترێ، تەماتە، خیار و شووتی.

ساڵح بە هێسترەکەوە، هێندێک لەسەرترەوەیە و لەناو ئاواییدا پێک دەگەین، ئەم خەڵکە، لە سیستەم کەناڵێکەوە، کە بە شێوەیەکی زۆر داهێنەرانە ساز کراوە ئاویان راکێشاوە و "لەوپەڕی بیابانەوە" گەنمەشامی و مەرەزەی برنج ئاودێری دەکەن. بەڵام لەو شوێنەی سنووری ئەم کشتوکاڵە تەواو دەبێت ئەرزی رەش و سووتاو دەست پێ دەکات.

پیاوێک لە کۆڵانێکەوە بەرەو رووما‌ن دێت، ئەحمەد هاوار دەکات:

- ئەوە باوکمە.

ئەحمەد دەزانێ باوکی هاتووە بۆ سەردانی خزمانی بۆ بەرواری باڵا و ئامادەیی ئەوەی هەبوو لێرەدا ببینێ. ئەوان یەکتر لە ئامێز دەگرن و ماچی سەرکوڵمی یەکتر دەکەن. باوکی ئەحمەد پیاوێکی بە تەمەنە، جلوبەرگی ساکاری لەبەرە بەڵام هیچ ددانی نەماون. مەودایەکی زۆر جگە لە هەستێکی دەروونی لە نێوان کوڕ و باوکدا هەست پێ ناکرێ.

سەرەڕای ئەوە ئێمە هەمیشە پێکەوە بووین، من بە درێژایی رێگە

نەمتوانی پێوەندییەکی بەتەواوی باش لەگەڵ ئەحمەددا ساز بکەم. بێگومان گەرم نەبوونی پێوەندیی من و ئەحمەد پێوەندیی بە منیشەوە هەیە، بەڵام ئێمە قەت ناگەینە ئەو جێگەیە، کە بە روونی پێکەوە بدوێین. ئەو گشت هەوڵێکی خۆی دەدات بۆ ئەوەی یارمەتیی من بدات و تێ بگات من چیم دەوێ. هەرچەند خۆشی ملی پێدا ناکات بەڵام ئەو ماوەیە وەک قوتابی لە بەغدا بووە ئاو و هەوای ئەوێ هێندێک لە خەڵکەکەی خۆی دوور خستووەتەوە، بۆ نموونە وەڵامی هەموو شتێکی لا نییە و ناشیەوێ لە خەڵکی تر پرسیار بکات.

بەڵام، ئەویش وەک گشت قوتابیان، پزیشکان، پرۆفیسۆران و مامۆستایانێک، کە تێکەڵی شۆڕش بوون، هیچ کات نایەوێ خۆی بە زانیارییەکانیەوە هەڵکێشێ، پلەی خوێندن وەک پوانێک بۆ خۆی حیساب بکات و بە چاوی بچووک سەیری خەڵکی تر بکات. ئەم بیرۆکەیە هیچ بە مێشکیدا نەهاتووە.

من قەت هیچ کۆمەڵگەیەکم نەدیوە هێندەی ئەم کۆمەڵگەی کوردستانە لە کێشە و ڕووبەڕووبوونەوەی چینایەتی بە دوور بێت و ئەحمەد خۆی دەتوانێ نموونەیەکی ئەم بانگەشەیە بێت - هیچ جیاوازییەک لە نێوان ئەو و ساڵحی هێسترەواندا نییە - پێکەوە ڕێگە دەبڕن، ڕێز لەیەک دەگرن و هیچیان بە چاوی سووک یان ڕێزی زیاترەوە سەیری یەک ناکەن بۆ ئەو جێگە کۆمەڵایەتییەی هەیانە. هەروەها کێشە و ناکۆکیی نێوان تەمەن و وەچەکانیش لێرە نابینرێ، لە وڵاتانی تری لای باشوور پیاو گەنجانێک دەبینێ پێیان وایە خوێندن هەموو شتێکە، هەوڵ دەدەن بە هاسانی بنچینە و ریشەی خۆیان لە بیر کەن، کاتێک دێنەوە ناو خەڵکی گوندەکەیان وەک خەڵکی جیاواز هەڵسوکەوت دەکەن و بە چاوێکی کەم بایەخەوە سەیری خزمانی "نەزانی" خۆیان دەکەن. ئەم جۆرە گیان و نەریتە هاوشێوەی لە سوێدیش دەبینرێ بەڵام من لە کوردستان شتی لەو جۆرە نابینم و بە پێچەوانە بیرکردنەوە لە

نەریتی لەو جۆرەش بە تەواوی نامۆمکینە. ئەوان شانازییەکیان هەیە و بناخەی ئەو شانازییەش لەسەر سامانداری، پلە و پایەی کۆمەڵایەتی یان خوێندن نییە، بگرە لەسەر ئەوەیە، کە هیچ حاشا لە کوردبوونی خۆت نەکەیت، وڵاتەکەت نەفرۆشی، یاسا و رێسای خەڵکەکەت پێشێل نەکەیت، کوردێک بیت لەناو کوردان و مرۆڤێک بیت لەناو مرۆڤەکانی تردا.

ئەوەی من و ئەحمەد ناتوانین بە شێوەیەکی کراوەتر نزیکی یەکتر بینەوە رەنگە هێندێکی هۆی رێگەکە بێت، کە ناهەموار و سەختە، هێندێکیشی هی ئەوە بێت، کە ئەحمەدیش وەک من لەم مەودایەی بڕیومانە ناشارەزایە و منیش دەمەویست هەموو شتێک بزانم و چاوەڕوان بووم ئەو وەڵامی گشت شتێکی لە لابێت.

بەڵام کاتێک دەبینم کتوپڕ و بێ ئاگەداریی پێشوو، ئەحمەد باوکی لە نزیک بەرواری باڵادا دەبینێ چی رێز و خۆشەویستییەکی پێشان دەدات، رێز و حورمەتێک کە لە دڵەوە دێت و بە هیچ رەنگێک ساختە و دروستکراو نییە، هەروەها کاتێک باوکیشی هەمان رێز پێشانی کوڕەکەی دەدات بۆم دەردەکەوێ ئەم شتەیە لە کوردستان پێوەندیی گەرموگوڕی نێوان وەچە و نەوەکان رادەگرێ و نەوەکانی داهاتووش بەو شێوەیە باردێنێ.

باوکی ئەحمەد سواری هێسترەکە دەبێت، لەگەڵمان دێت بۆ گوندی "بەدە بەدە"، کە قەرارە شەو لەوێ لەماڵی مامێکی ئەحمەددا بمێنینەوە و باوکیشی هەر لەوێ مێوانە. بەدە بەدە گوندێکی زۆر گەورەیە، بووەتە سێ بەش و هەر بەشەی لە لایەکدا هەڵکەوتووە. ئێمە راست دەڕۆینە ماڵی مامی ئەحمەد.

– ماڵێکی زۆر ساکار و سادەیە، خزمەکانی من دەوڵەمەند نین، پێم وایە بۆ تۆ سەرنج ڕاکێش دەبێت ببینی، کە خەڵک لە کوردستان چەندە ساکار دەژین.

له کوردستان به شێوەی سەردەمی زۆر کۆن، خانووەکان یان له بەردی ئاسایی یان له خشت، که لەبەر خۆردا سوور هەڵگەڕاون ساز دەکرێ. قوڕ و کا تێکەڵ دەکەن بۆ ئەوەی چاک خۆی بگرێ، له قاڵبێکدا ڕێکوپێکی دەکەن و به شێوەی بلۆکی دڵخواز دەری دێنن تا دواتر لەبەر خۆرەوە وشک بێتەوە. ماڵی قوڕین ئاساییترین شێوەی ماڵن پیاو دەیانبینێ بەڵام دەڵێن ماڵی بەردین باشترە. دیوارەکان به قوڕ سواخ دەدرێن و بانەکانیشیان سافی سافە. دارچناری درێژ دەخەنە سەر دیوارەکان و دواتر به لق و گەڵا دای دەپۆشن دیسان قوڕی بەسەردا دەکەن. مەرجی ئەوەی ئەم ماڵانە له وەرزی باران و بەفردا دڵۆپە نەکەن ئەوەیە قوڕەکە سفت بێت و بۆ ئەو مەبەستەش هەر بانە شتێکی لەسەرە پێی دەوترێ بانگردێن. هەرکه بەفر باری دەیماڵن و بەو بانگردێنەش بانەکە دەشێلن تا سفت و پتەو بێتەوە و دڵۆپە ناکات.

ڕەنگی ئەم دیوارە قوڕینانە پاش ماوەیەک دەگۆڕێ و له دوورەوە بینینی ماڵەکان دژوار دەبێت. سەربانی ئەم ماڵانەش کاتێک هەوا گەرم دەبێت دەبێتە شوێنی کاری ژنان، گەنمی لێ پاک دەکەن، نۆک و ساوەری لێ دەستهاڕ دەکەن و... ... . هێندێک جاریش شەوانە لەسەر بان دەخەون. لەسەر هەموو بانەکان کونێک هەیە، که زستانان سۆبەیەک له ناوەڕاستی ماڵەکان دادەنێن و ئاگری تێدا دەکەنەوە، دووکەڵ و گەرما زیادەکە لەو کونەوە، که تا خوار لوولەیە دەچێتە دەر و له ماڵەوەش گەرمای دیوەکان دابین دەکات. (*نووسەر له سێ لاپەڕەدا باسی سازکردن و چۆنیەتیی کارکردنی ماڵە کوردێکی ئەو سەردەمە دەکات، من وەرگێڕانی هەموویم بۆ کوردی به پێویست نەزانی و تەنیا چەند کۆپلەیەکم وەک نیشاندانی مەبەستەکەی ئەو هەڵبژارد. - وەرگێڕ*)

ماڵی مامی ئەحمەد، که به بەرد ساز کراوە تەنیا دوو دیوی هەیە. دیوە گەورەکەیان پەنجەرەیەکی لێیە، تەختە و مێزێک له گۆڕێدا نابینرێ، له

گۆشەیەکەوە لێفە و جێوان بە دیوارەوە هەڵپەسێردراون و چەند دۆشەکەشیان بۆ دانیشتن راخستوون. دیوێکی بچکۆلانەی تر هەیە، کە پەنجەرەی نییە، وەک ئەنبار کەڵکی لێ وەردەگیردرێ، کاتێک بیانییەک لە ماڵ بێت ژنەکان لەوێ دەخەون و چێشت و خواردنیش لە دەرەوە لە دالانێکدا ساز دەکرێ.

لەگەڵ تاریکداهاتنی هەوادا دەچینە ژوور، لەسەر دۆش دادەنیشین و خواردنمان لەناو سینییەکی فافۆندا بۆ دێنن. خواردنەکە ماست، برنج، نان و جۆرێک سۆسە، بەلام خەبەرێک لە گۆشت نییە.

کۆمەڵێک پیاوی تر دێنە ناو، لە کاتێکدا هەموو لە پەنای یەک دادەنیشن تێکرا دەست دەکەن بە جگەرەکێشان، کە خۆیان لە توتنێکی زەردی کوردی هەڵی دەپێچن و لەسەرەخۆ مژی لێ دەدەن. چرا لامپایەکی کز رووناکی دەداتە دیوەکەمان، ژنەکان کەسیان نایەنە ماڵ، ئەوان لە دەرەوە لە لای "چێشتخانەکەی" دەرەوە دانیشتوون و خەریکی قسەوباسی خۆیانن.

ئەحمەد بۆم باس دەکات کە میوانەکان باسی چی دەکەن:

– ئێمە باسی باری شەڕەکە دەکەین، ئەوان دەڵێن داخوا دوارۆژ چی روو دەدات و هیوادارن ئاگربەستێک بێتە ئاراوە. ئەوان وەک پێویست ئازووخەی ئەم زستانەیان نییە و ئەوەش بە گەورەترین کێشە دێتە ئەژمار.

تێکڕای ئەم پیاوانە گوێ لە رادیۆ کوردستان دەگرن، لە هەموو جێگەیەکدا شەڕ رووی داوە. ساڵوەگەڕی شۆڕشیشە، جەنەراڵ بارزانی پەیامێکی تایبەتی بەم بۆنەوە بۆ خەڵک دەرکردووە و ناوەڕۆکەکەی بە کورتی بەم جۆرەیە:

"ئێمە تا بەدەستهێنانی ئۆتۆنۆمی دەست لە خەبات هەڵناگرین. رۆژی سەرکەوتن نزیکە."

هیچ کام لەم پیاوانە چەکی پێ نییە، ئەی بۆ ئەمانە نەبوونەتە پێشمەرگە؟

ئەحمەد دەڵێ:

- زیاتر لە حەفتا کەسی ئەم گوندە پێشمەرگەن، هەموو بنەماڵەیەک کەسێکی لە بەرەی شەڕدایە. بەڵام نەریت وایە کە هەردەم دەبێت پیاوێک لە ماڵدا بمێنێ، ئاخر دەبێت کەسێک ئاگای لە دەر و دەشت بێت، هەموو ناتوانن لە شەڕدا بن. دیارە ئەگەر پێویست بێت ئەم پیاوانەش سازن ببنە پێشمەرگە و پێم وا نییە کەسیان ئاواتێکی تری هەبێت.

بەڵام شەڕ لێرەش لەم دۆڵە دوورەدەستەشدا کاریگەری لەسەر ئەوان دەکات، هەردەم باسی شەڕ، ئاکامەکانی و گرانی دەکەن، کە هۆیەکەی هەر شەڕە. دوای ڕۆیشتنی میوانەکان سەرینێک بە من دەدەن، کەسێک لامپاکە دەکوژێنێتەوە و من لەسەر دۆشەکە نەرمەکەوە خەو دەمباتەوە.

بەیانی پێش ئەوە من وەخەبەر بێم ساڵح هێسترەکەی بار کردووە و سازی ڕۆیشتنە، ژنەکان هەموو بە توندی سەرگەرمی کاری خۆیانن. ژنێک خەریکی مەشکەژەندنە، ماستەکەی کردووەتە ناو پێستی بزنێک و بە سێ پەت لە دارێکەوە شۆڕیان کردووەتەوە. ژنەکە پاڵ بەو پێستەوە دەنێ بۆ پاش و دوایە بۆ لای خۆی ڕای دەکێشێ، شڵقەشڵقی ماستەکە بە باشی دەبیسترێ و وا دیارە ڕۆنە کەرەیەکی چاکی لێ بێتە دەر.

پێش ئەوەی بکەوینە ڕێ دەبینم ئەحمەد و مامی پێکەوە قسە دەکەن، من دەزانم ئەحمەد خەریکە لە جێی خواردن و زەحمەتی ئەم شەوە هێندێک پارە بداتە مامی، بەڵام ئەو ساز نییە هیچ پارەیەک گل بداتەوە و ئەحمەدیش نارەحەتە و دەڵێ:

- ئاخر ئەوان پێویستیان بەم پارەیە هەیە، ئەوان پارەیان نییە شتی زستانیان دابین کەن. بەڵام حازر نین هیچ وەرگرن.

ئێمە بەناو کۆڵانە تەنگەبەرەکانی گونددا تێپەڕ دەبین، بەسەر جۆگەیەکدا دەڕۆین و دەگەینە پردێک، کە بە دار سازیان کردووە. دارگوێزی بەرز و

توودڕک دەورەی ڕێگەکەیان داوە. تۆزێک سەرتر دەگەینە بێستانێک پڕە لە خیار، پەتاتە و. . . مەڕومالآت بەسەر بەرزاییەکانەوەن و هەر دەستەیەک شوانێک و چەند سەگ پاسەوانییان لێ دەکەن.

لای نیوەڕۆ، لە دۆڵێکی تردا دەگەینە گوندێک بە ناوی "ئادینە"، هەوەڵ بە تەمای ڕاوەستان نین، بەلآم کاتێک دەگەینە سێبەری دارگوێزەکان، کە فێنکییەکی باش بە خەڵکەکە دەدەن پەشیمان دەبینەوە و بۆ خواردنی نانی نیوەڕۆ لادەدەین. لەم شوێنە خەڵکی دوو بۆمبای گەورەمان پیشان دەدەن، کە وەک یادگارێک لەبن دارەکاندا رایان گرتوون، بە قسەی ئەم خەڵکە ئەم بۆمبانە ساڵی ١٩٦٦ لە لایەن فڕۆکەی دەوڵەتەوە دژی ئەم گوندە بەکار هاتن بەلآم نەتەقینەوە و دواتر لە لایەن شۆڕشەوە پووچەڵ کرانەوە، ئێستەش وەک نموونەی دڕندەیی دەوڵەت دانراون تا خەڵک بیانبینێ.

لە درێژەی ڕێگەدا گەلێک دیمەنی جوان دەبینین، کە سەرنجم رادەکێشن. لە کەناری ڕێگەکەوە سێو، هەنجیری گەییو شۆڕ بوونەتەوە و لە هەر لایەک کانی و جۆگەی ئاوە، کە لە بنەبەردێکدا دێتە دەر، لە بەرزاییەکدا کۆ دەبێتەوە و دواتر لە تاڤگەیەکی دڵڕفێنەوە خۆی هاوێتەی سروشتی جوانی ئەم دەڤەرە دەکات. ساڵح و هێسترەکە بە ڕێگەیەکی هێندێک گەورەتردا دەڕۆن و من و ئەحمەد هەروا بە تەنیشت جۆگەکەدا دەڕۆین تا دەگەینە گوندێکی تر. لە ماڵێکدا لادەدەین، کە خاوەن ماڵ خەریکی دروومانی جلوبەرگی پێشمەرگەیە. کابرای بەرگدروو ناسراوی ئەحمەدە و هەرکە خەڵکی ئاگەداری هاتنمان دەبن کۆمەڵێک ژن و پیاو دێن تا هەواڵی شەڕ و دۆخی لای چۆمان لە ئەحمەد بپرسن. هێندێک لە خەڵکەکە دەڕۆن لەناو باخ سێو، هەنجیر و ترێمان دێنن و هەر بۆڵێکی ترێیەکە هێندەی هەڵووژەیەک دەبن. کاتێک من یەکێک لە سێوەکان لەت دەکەم کرمێکی زەلام لەناویدا دێتە دەر و مریشکێک کە لەو ناوە حازرە پەلاماری کرمەکە دەدات، هەوەڵ کرمەکە خۆی ون دەکات بەلآم سەرەنجام مریشکەکە دەتوانێ بیگرێ و بیخوات. من

نازانم بۆ ئێستە ڕاست ئەو سێو و کرمەم دێتەوە بیر ڕەنگە هی گەورەیی سێوەکە یان قەڵەویی کرمەکە بێت، کە من تا ئەوکات کرمی هێندە زەلامم نەدیتبوو. لە کاتێکدا ئەحمەد و هاوڕێیانی بە زمانێک، کە من تێ نەدەگەیشتم خەریکی قسان بوون منیش خۆم بەو کرم و مریشکەوە خەریک کردبوو.

من هیچ کات هێندەی ئەم سەفەرەی کوردستان میوەم نەخواردووە و قەتیش لە هیچ جێگەیەک سێوی وا گەورە، شووتی، ترێ، هەنجیر و... وا باش و خۆشم نەدیتوون.

هێندێک ڕێگەمان لێ تێک دەچێ، ئەحمەد و ساڵحیش وەک من قەت پێشتر بەم ڕێگەیەدا نەهاتوون. لە چەند پیاوێک، کە خەریکی مەرەزەی برنج و ئاودێرانی گەنمەشامین یارمەتی وەردەگرین و دێینەوە سەر ڕێگەی ڕاست. دەگەینە گوندێک لەسەر تاشەبەردێکی زۆر تەختەوە ساز کراوە و دوای ئەم گوندە زۆرمان نەماوە بگەینە گوندی "بازێ" کە بڕیارە شەو لەوێ بمێنینەوە.

جارێکی تر دەڕۆینە ماڵێکی گەورە، پاڵشتی نەرمی لێ دانراون و دوای دانیشتن بە لیوانێک ئاوەوە بەخێرهاتنمان دەکەن. دواتر من تێ دەگەم، کە ئەمە لە کوردستان نەریت و باوە کە بە لیوانێک ئاوی سارد بەخێرهاتنی مێوان بکەن. ئاوێکی ساردی کەللەتەزێن و وەک کریستاڵ ڕوون. من هەوەڵ لیوانەکە دەگرم، هەوڵ دەدەم بە ئارامی ئاوەکە بڕواتە خوار و هەموو لەشم هەستی پێ بکات. ڕاستی من لە بیرم نایە خواردنەوەیەکی ترم لە هیچ کوێیەک خواردبێت تامی ئەم ئاوەی ئێرەی دابێت.

دەنگۆی هاتنی ئێمە لەناو خەڵکدا بڵاو دەبێتەوە و زوو دەورمان پڕ دەبێت لە خەڵک. یەکێک لەوان ناوی محەمەد ئەحمەدە، ٣٥ ساڵ تەمەنیە و داوا لە ئەحمەدی هاوڕێی من دەکات بە من بڵێ، کە ئەوان خۆشحاڵن بە هاتنی من و زۆریان پێ خۆشە من لەسەر کوردستان بنووسم:

– پێش هەر شـتـێک تۆ دەبێ باسی ئەوە بکەیت ئێمـە وەک پێـویست ئازووخـە و خواردنمان نییـە. لە گشت لایەکەوە دەورە گیراوین و زەحمـەتە زستان ببـەینە سـەر – ئێمە زۆر لەم دۆخـە دەترسین. هەروەها دەمانەوێ تۆ باسی ئەوە بکـەیت ئێـمـە سـەرەڕای ئەو هـەمـوو ئازار و زیانەی بـەرمـان کەوتووە، نەتەوە یەکگرتووەکان گوێ ناداتە چارەنووسی خەڵکی کوردستان. راستی، کەسێک نییە بایەخ بە ئێمە بدات؟ ئێمە ناتوانین هۆی ئەم شـتە تێ بگەین.

من لە مـحـەمـەد دەپرسم شۆڕش بۆ ئەم گـوندە بە گـشـتی چی مـانایەکی هەیە و بە چی شێوەیەک ئاڵوگۆڕ بەسەر باری ئەواندا هـاتووە؟

– شـۆڕش بۆ ئێمـە مـانای ئەوەیە، کە نـرخـی مـرۆڤـانەمـان بۆ گـەڕاوەتەوە، پێشتر ئەرد و خـاکی ئەم گوندە و ئاواییـیەکانی تر هـی خـەڵکانی دەوڵەمـەند بوو، کـە خـۆیان لە شـار دەژیان. ئێـمـە زەوییـەکـانمان بەخـێـو دەکـردن و وەرزێەری ئەوان بووین. ئێمـە کـورد وەک چینی خـوارتر و پلـە دوو حیسـێب دەکراین. بەڵام دوای دەست پێکردنی شـۆڕش خـاوەن مـوڵکە زۆردارەکـانمان راونان و مـاڵەکـانمان سـووتاندن. ئێـسـتـە خـۆمـان خـاوەنی ئەو مـوڵک و زەوینەین خـۆمـان دەیکێڵین. ئاغاکـان ئێستـە لە شـاردان و هـاوکـاریی رژێم دەکەن. ئەوان دەخـوازن شۆڕشـەکەی ئێمـە تێک بشکێنن و ببنەوە ئاغاکەی جاران. بەڵام هەرگیز ئێزنی ئەو کارەیان پێ نادەین.

جەنەراڵ بارزانی چۆن دەبینی؟

– لە روانگەی منەوە جەنەراڵ بارزانی پیاوێکی زۆر گەورەیە، ئەو هەمیشە خەباتی بۆ نەتەوەی کورد کردووە، هەموو ژیانی.

کـەسی تر بە نیشـانەی رەزامـەندی سـەر بۆ قسـەکانی دەلـەقێنن و پێیـان وایە چاکی قسـە کردووە، ئەحمەد هـەمـوو هـەوڵی دەدات قسەکان وەرگێڕێ و من گومـانێکم نییـە، کە قسـەکانی دروست وەرنەگێڕابێ. ئەوان ئاگـەداری

ئامـانجـەکـانی ئـەم بزاڤـەن تەنـانەت لەم گـونـدە دوورەدەسـتـەشـدا . ڕێگەی ئاگـەدارکردنەوەی ئەم خـەڵکە لە مـەبەسـتـەکانی شـۆڕش رادیۆیە و رادیۆی کوردستـان، سەرەڕای وژەوژی حکوومەت لێرەدا باش دەبیسترێ. پێش ئەوە بخەوین گوێ دەدەینە دوایین هەواڵەکانی:

- پەیامێک لە ناوچەی رانیەی پارتییەوە رادەگەیەنێ، کە هێزێکی زۆری دوژمن هێرشی کـردووەتە سـەر پێشـمـەرگـە لە گـوندەکـانی "بـەردانگە" و "بەردەبی" لە نزیـک شـاری رانیـە. هێـزی دوژمن تێک شکێنران و حـەوت بەکـرێگیـراویش کـوژران. ڕێژیم وەک تۆڵەکـردنەوە هەشت گـوندنشـینی گـرتوون... بە پێی هەواڵی هێـزی شـێـخـان شـەڕەکـانی ئەو ناوەش لـە نزیک ئاوایی "مـرێبـە" بە تـوندی بەردەوامـن و دوژمن زیانـی زۆری بەرکـەوتووە... هەواڵدەرمـان لە دهـۆک رادەگـەیێنێ، کـە دوێنێ تۆپخـانـەکـانی شـۆڕش هێـرشـیـان کـردە سـەر پێگەیەکی دوژمـن لە نزیـک دهۆک. هەروەهـا باس دەکـرێ، کـە ڕێژیم دیسـان لـە شـاری مـووسـڵ ٣٢ هاووڵاتیی کـوردی هەڵواسیـون... هـێزی زاخـۆ رادەگەیێنێ، کە دوێنێ مینێکی پێشـمـەرگە بە کـامیـۆنێکی پڕ لە سـەربازی دوژمـندا تەقـیـوەتەوە و هـەمـووی کـوشـتـوون... بەتالیـۆنی شـەشـی خـانەقین رادەگـەیەنێ، کە هێزێکی پـێشمـەرگە هێرشی کردووەتە سەر کاروانێکی ڕێژیم لە نێوان گوندەکانی"عیسایی" "عەلیخان"دا. هەروەها هێزی دژە هەوایی ئەو بەتالیۆنە تەقەی لە فڕۆکەیەکی دوژمن، کە بەسەر چۆمی سیرواندا دەسووڕایەوە کرد و ئەنگاوتی.

ڕاست لە خوار گوندەوە جۆگەیەک هەیە و لە تەنیشت جۆگەکەوە ئاشێکی ئاوی کـۆنی سـەردەمی زوو هەیە بە ئـاوی ئەو جـۆگـەیە دەگـەڕێ. بەیـانی لە ئاوی سـاردی ئەو جۆگەیە دەمـوچاوم دەشـۆم و دوای خـواردنی نـانی بەیانی دەکەوینـە ڕێ. ئێمـە دەبێت لە کێـوی "مـەتین"ەوە سـەرکـەوین. کێـوێکی زۆر بڵندە و من هەرچەند بەزەییـشـم پێدا دێتـەوە ناچارم سـواری هێسـترەکەم ببمەوە. چەند سات بەم کێوەدا هەڵدەگەڕێین، هێندێک جار من لە هێسترەکە

دادەبەزم و دیسان سوار دەبمەوە. دەگەینە دارستانێک دوو کوڕ و دوو کچ خەریکی بڕینی گەڵای داربەڕوون بۆ زستانی مەڕەکانیان. کوڕەکان دەچنە سەر، لقەکان دەبڕن و کچەکان لە خوار کۆی دەکەنەوە. تووشی کاروانێکی تر دەبین، کە بە ژمارەیەک هێسترەوە لە ڕێگەدان و سەرەنجام دەگەینە سەر لووتکەی شاخ، لەوێشەوە دۆڵێکی تر لەلای خوارەوە دەردەکەوێ.

## تا ئەو کاتەی سەردەکەوین یان لەناو دەچین

پێش ساڵی ١٩٧٠ کێوی مەتین کەوتبووە نێوان سنووری هێزەکانی دەوڵەت و پێشمەرگە. سوپای دەوڵەت لە شەڕەکانی ٦٥ - ٦٦دا لە دهۆکەوە هێرشی هێنا، ئامێدی و بامەڕنیشی داگیر کردن. ئەحمەد دەبێژێ:

- من ئەو دەم لە بامەڕنی بووم. جگە لە مزگەوتەکە هەموو گوند لە لایەن دوژمنەوە ئاگری تێ بەردرا، خەڵک کێویان گرتە بەر و هەڵاتن بۆ بەرواریی باڵا. دەوڵەت بە تانکەکانیەوە توانی بگاتە نزیکی ئەم کێوە، بەڵام پێشمەرگە پێشیان پێ گرتن و نەیانهێشت زیاتر بێنە پێش.

ساڵح بە هێسترەکەوە لە پێشمانەوە بەو هەورازە هەڵدێرمدا هەڵدەگەڕێ و من حەز دەکەم زوو زوو راوەستم بۆ ئەوەی ئەم دیمەنە جوان و سەیرانە زیاتر تەماشا بکەم. دەگەینە کانیاوێک دیمەنەکەی لە بەهەشت دەچێ، ژنێک بە منداڵەکانیەوە هەواری لێ خستووە و بزن و مەڕ بە دەوروبەری کانیاوەکەوە خەریکی لەوەڕن. ئەحمەد پێشم دەکەوێ بۆ ناو کەلاوەیەک:

- لێرە من و بنەماڵەکەمان دەژیاین. بەڵام دەوڵەت ماڵەکەمانی سووتاند و ئیدی هیچ کات سازمان نەکردەوە، قەت نەگەڕاینەوە بۆ ئێرە.

لە بامەڕنی لادەدەینە لای ژمارەیەک پێشمەرگە، کە لە حاڵی مۆڵەتدان و لە سێبەرێکدا تاوێک لە لایان دادەنیشین. ژنان خەریکی جلشۆرین، ئەحمەد لێرەش خزمی هەن و ئێمە سەردانیان دەکەین. باسی ئێرەش هەر لەسەر شەڕ و ئەو گەمارۆیە بوو، کە دەوڵەت خستوویەتییە سەر ئەم خەڵکە. یەکێک لە پیاوەکان کوڕێکی بچووکی لە باوەشدایە و کلاشینکۆفەکەی پاڵداوە بە دیوارەکەوە. ئەم پیاوە تازە لە بەرەی شەڕ گەڕاوەتەوە و داوا لە ئەحمەد

دەكات قسەكانی بۆ من وەرگێڕێ:

- بۆ هیچ كەس گوێ ناداتە خەباتی كورد؟ بۆ كەس گوێ لە ئێمە ناگرێ؟ ئێمە بە تاقی تەنیاین، كەس دۆستمان نییە. تەنیا كێوەكانمان نەبن. داخوا رێگەی كوێ بگرینە بەر ئەگەر ئەم كێوانەش پەنامان نەدەن بە سەربەستی بژین؟ ئێمە ناتوانین لە شوێنێكی تر بژین، بەڵام دەبێت درێژە بە خەبات و بەرخۆدان بدەین و لای ئێمە هەژاری زۆر لە ژێردەستی باشترە.

پلانی من و ئەحمەد ئەوەیە ئەسعەد، فەرماندەری هێزی یەكەمی پێشمەرگە ببینینەوە تا مۆڵەتی ڕۆیشتن بۆ بەرەی شەڕی لێ وەرگرین. لە لای بنكەی ناوەندیی سوپا لە دهۆك، گوندێكی بچووك لە ڕۆئاوای بامەڕنییەوە هەیە و رێگەیەكی هەیە ئۆتۆمۆبێلێكی جێب دەتوانن پێیدا بڕۆن. ئێمە هەر چوارمان، من، ئەحمەد، ساڵح و هێسترەكە دەڕۆین بۆ ئەوێ. پاسەوان لە بەرزاییەكانەوە دەبینرێن و كاتێك نزیكی گوند دەبینەوە پێشمەرگەیەك رێگەی بنكەمان پێشان دەدات. بنكە ماڵێكی ساكار و كەپرێكە. پێشمەرگە لەسەر كورسی بە دەوری یەكەوە دانیشتوون و جلوبەرگ و "یونیفۆرمی" هەمووان وەك یەكە.

لەناو سوپای پێشمەرگەدا تۆ ناتوانی كەسەكان لە رێگەی پایە، پلەی ئەفسەری و... لێك جیا بكەیتەوە. چونكە شتی لەو بابەتە نییە، سان، رژە، سڵاوی سەربازییەكیش لە گۆڕێدا نییە. بەو حاڵەش من كاتێك دێمە ژێر كەپری هەوارەكە گومانێك لەوە ناكەم كامیان ئەسعەدە، بۆیە راست دەچمە پێش بۆ لای. ئەو بەخێرهاتنی من دەكات، ئاماژەم بۆ دەكات لەسەر كورسییەكەی تەنیشتیەوە دانیشم. هەست بە ئارامییەكی زۆر دەكەم. جاروبار پێشمەرگەی نوێ دێنە ژوور، سڵاو دەكەن و بۆ خۆیان دادەنیشن و بە ئارامی و لەسەرخۆ قسە لەگەڵ یەكدا دەكەن.

ئەسعەد دەڵێ زۆر خۆشحاڵە بە هاتنی ئێمە و كێشەیەكیش نابینێ بۆ

سەردانی ئێمە لە بەرەی شەڕ.

پێشمەرگەیەک بە نامەیەکەوە دێتە ناو، نامەکە دەداتە دەستی ئەسعەد و ئەویش دەیداتە کەسێک، کە لە تەنیشتییەوە دانیشتووە و وا دیارە بەردەستی بێت و داوای لێ دەکات نامەکە بخوێنێتەوە. ئەحمەد دەڵێ:

- نامەیەکە لە مووسڵەوە هاتووە، بینراوە خەڵکی دروشمی بە دیوارانەوە نووسیوە و لە دروشمەکاندا دەڵێن: لە وڵاتێکی خاوەن نەوتی دەوڵەمەندا هەموو شتێک گرانە و بەعسی ژن و منداڵی خەڵک دەکوژن، نەخۆشی نەخۆشخانەی مووسڵیان دەرکردوون و سەربازی برینداریان لە جێگە داناون. لە دەرەوەی نەخۆشخانە خەڵک کۆ بوونەتەوە و ناڕەزایەتییان دەربڕیوە بەڵام دەوڵەت بەزۆر پێشی پێ گرتوون.

من داوا لە ئەسعەد دەکەم باسی چۆنیەتیی بەرەی شەڕم بۆ بکات:

- دۆخەکە لە قازانجی ئێمەدا دەڕواتە پێش. ئێمە کۆنترۆڵی تەواومان بەسەر بەرەدا هەیە. هێزەکانی ڕژێم لە دەهۆک ناوێرن لە مۆڵگەکەیان بێنە دەر و تەنیا خەریکی تۆقاندنی خەڵکی سڤیلن.

زیانی گیانیتان تا ئێستە لەم شەڕەدا چەند کەس بووە؟

- پێشمەرگە کەمتر لە ۳۰ کەسمان لە دەست داون، بەڵام نزیک بە سەد کەسی سیڤیل کوژراون. زیانی ڕژێم نێزیک هەزار کەس کوژراو و ٥٠٠ کەسیشیان بریندار بوون. بۆ ئێمە سەخت نییە پێشی هێرشی ئەوان بگرین، ئەگەر بە تانک و تەیارە هێرشمان بکەنە سەر زەحمەتە ڕووبەڕوو لە بەرانبەریان خۆمان ڕاگرین، بەڵام دواتر لێکیان هەڵدەبڕین، لە چەند لاوە دێینەوە سەریان و لەناویان دەبەین. ئێمە شارەزای کون و قوژبنی ئەم وڵاتەین و لە پشتی بەرەی شەڕیشەوە هێرشیان دەکەینە سەر. ئەوان تەنیا لەناو شار و مۆڵگەی خۆیاندان.

ئەسعەد لە ساڵی ۱۹٥۲ەوە لەگەڵ بارزانیدا بووە و یەکێکە لەوانەش کە

لەگەڵیدا چوون بۆ رووسیا و ساڵی ١٩٥٨ دوای رووخانی رژێمی ئەو دەمی عێراق گەڕانەوە. ئەسعەد لە شەڕەکانی ١٩٦١یشدا بەشدار بووە، من داوای لێ دەکەم بەراوردێکی شەڕی ئەو کات و ئێستە بکات:

– جیاوازیی زۆری هەیە. ئەودەم ئێمە رەنگە زیاتر لە ١٠٠٠ پێشمەرگە نەبووین، بەڵام ئێستە دە قات زێدەترین. ئەودەم چەکەکانیش وەک ئێستە نەبوون، ئێستە دەوڵەت مۆدێرنترین چەکی لە رووسیاوە پێ دەگات. ئێستە شەڕەکە گرانترە، بەڵام بۆ ئێمەش هەلومەرجێکی تەواو جیاوازە، ئێستە هەموو خەڵکی کورد تێ دەگات خەبات بۆ چی دەکات. خەڵکی ئاگەدارن ئێمە جگە لە بەرخۆدان رێگەیەکی ترمان بۆ نەماوەتەوە و بۆ خۆشیان تێکڕا بەشداری شۆڕشەکەن. هێزی پێشمەرگە لە شکان نەهاتوون، راستی ئەم پێشمەرگانە باشترین سەربازی دنیان. ئێمە هێشتا بەشێکی زۆری هێزەکەمان بەشداریی شەڕ نەکردووە، ئەگەر من ئێستە بمەوێ لە تەنیا چەند رۆژاندا ٢٠٠٠ هەزاری تر پێشمەرگە ئامادە دەکەم بێنە بەرەی شەڕ، پیاوانێک ئاواتیان ئەوەیە بێنە بەرەی شەڕ و گیانفیدایی بکەن.

پێت وایە تا کەی ئەم شەڕە درێژەی دەبێت؟

– تا سەردەکەوین، یان تێکڕا لەناو دەچین. ئێمە تەنیا دوو جێگرەوەمان هەیە: یان کوردستان یان نەمان.

ئەوڕۆ چ شتێکی نوێ لە بەرەی شەڕدا رووی داوە؟

– ئێمە بەتۆپ هێرشمان کردووەتە سەر هێزی دوژمن، چەند مینی ئێمە لە نێوان دهۆک و مووسڵ بە کامیۆن و هۆیەلی ئەواندا تەقیونەتەوە، دەستەیەک پێشمەرگە هێرشیان کردووەتە سەر رێگرەکانی دوژمن لە نێزیک زاخۆ.

ئەسعەد بۆ خواردنی ئێوارە میوانداریمان دەکات، کە بڕیارە دوای ساتێکی تر بێت، لەو ماوەیە پێش ئەوە تاریکی بکات ئێمە دەچینە خوار بۆ

ناو گوند، ئاوەدانییەکی بچووکە بەڵام لەبەر ئەوە ماڵەکان لە نزیک یەکن ژمارەیەکی زۆر خەڵکی لێ دەژین، تەماشای ئێزگەی رادیۆ دەکەین کە لەناو ئەشکەوتێکدا دایان مەزراندووە. لە ژوورتر و لای کێوەکەوە پڕە لە ئەشکەوتی سروشتی، کە هەموویان "رۆژێک" ئاوەدان بوون. ئەحمەد دەڵێ:

- مانگێک پێش ئێستە دەوڵەت هەر رۆژ ئەم دەڤەرەی بۆمباران دەکرد و خەڵکی پەنایان هێنابووە بەر ئەم ئەشکەوتانە، بەڵام ئێستە بە تەواوی فڕۆکەکان وازیان لە بۆمباران لەم بەرەیەدا هێناوە و خەڵکیش گەڕاونەتەوە ناو ماڵەکانی خۆیان. ئێمە هۆی ئەم کارەی دەوڵەت نازانین.

هێشتا چەند ژن و منداڵێک لە یەکێک لە ئەشکەوتەکاندا دەژین. بە گەڵا و هێندێک دار، کەپرێکی زۆر جوانیان ساز کردووە بۆ خۆیان.

خواردنی ئێوارەمان لە لای ئەسعەد بوو. خۆشترین تەماتەی ئەم ناوەیان بۆ لێ ناوین، پێش شەڕەکە تەماتەی ئەم دەڤەرە بەناوبانگ بوون و هەر رۆژە سەدان لۆری بە تەماتەوە دەچوونە بەغدا و ئەو دەم کیلۆیەک بە ٣٠ فلس دەفرۆشران. ئێستە کیلۆیەک بە دووسەد فلسیش دەست ناکەون، بەڵام کوردستان سەر بە زیادەی خۆشی تەماتەی هەیە.

دوای ئەوە بە تەواوی تاریک دادێ، بە سواریی گەلابەیەک بۆ بەرەی شەڕەکە بەڕێ دەکەوین، من پێش وەڕێ کەوتن، مالاوایی لە ساڵح دەکەم، کە قەرارە بە هێسترەکەیەوە بگەڕێتەوە بۆ بەرواریی باڵا بۆ لای بنەماڵەکەی. دوای تۆزێک چرای گەلابەکەمان لە کار دەکەون و شۆفێرەکەمان، کە کوڕێکی گەنجە ناچارە بە تاریکی لێ خوڕێ تا شوێنێکی لەبار بۆ راوەستان و باشکردنی چراکانی.

دیارە زۆر زەحمەتە چرایەکان بخرێنەوە کار چونکە "ستارتموتۆرەکە"ش مردووە. لاندرۆڤەرێکی پڕ لە پێشمەرگە بە دوامانەوەن و گەلابەکەی ئێمەش هەموو رێگەکەی گرتووە. هەموو پێکەوە خەریکی وەکارخستنەوەی گەلابەکە

دەبن و سەرەنجام لە هەوڵەکەیاندا سەرکەوتوو دەبن. پاش تۆزێک جارێکی تر گەلابە تووشی کێشە دەبێتەوە و ناچار دەبین راوەستین. من تەمای گەیشتن بە بەرەی شەڕ بۆ ئەو شەوە لە دەست دەدەم بەڵام دەبینم ماشێنێک لە دواوە دێت و دەگاتە لامان. دەرکەوت ماشێنی تایبەتیی ئەسعەد خۆیەتی، تویوتا لاندکرۆزەرێکی مەیلەو نوێ.

بەم تویوتایە بە خێرایی بەسەر جادەی قیردا بەرەو لای باشوور لێ دەخوڕین و دوای دوو سات شۆفێرەکە چرای تویوتاکە دەکوژێنێتەوە. تاریکەشەوە و بە زەحمەت پیاو پێشی خۆی دەبینێ، شۆفێرەکەمان لە شووشەی ماشینەکەوە سەر دەردێنێ و وە دوای رێگەکە دەکەوێ. نیوەشەو دەگەینە شوێنی مەبەست و دەمانبەنە دیوێک لەوێ پێشمەرگە لەسەر زەوی بە چەکەکانیانەوە خەوتوون. من چوومە ناو کیسەخەوەکەم و لەبەر ئەوە رۆژێکی پڕ زەحمەتم تێ پەڕاندبوو بێ دەردی سەر خەوم لێ کەوت.

من نازانم ئێستە ئەم شوێنە لە کام لا هەڵکەوتووە، ناشزانم ئەم رێگەیەی پێیدا هاتین لە کوێ دەستی پێ کرد و چۆن گەیشتینە ئێرە، بەڵام دەزانم زۆر لە بەرەی شەڕ و لە بەروارێی بالا دوور نین. هەرچەند ئەو رێگەیەی بڕیمان زۆر دوور دێتە بەرچاو و رۆژەکەش زۆر درێژ بوو. دەمەوێبەیان ئەحمەد، کە کەیفی ساز نەدەهاتە بەرچاو وەخەبەری هێنام و تەنیا وتی کاتی ئەوەیە برۆین بۆ بەرەی شەڕ.

دەکەوینە دوای دەستەیەک پێشمەرگە – من نازانم چەندەی تر دەبێت برۆین و لە لای خۆشم حەزێکی وام بۆ رۆیشتن نییە. هەموو رۆژەکە خەریکی رۆیشتن دەبین، خوناوکە بە گشت لەشمدا دێتە خوار، ژێر پێیەکانم بوونەتە بلۆق و جاری وایە خەریکە بە چۆکدا بێم. رەنگە من بتوانم رۆژێک وەک ئەم پێشمەرگانە لەم چۆڵەوانییە سووتاوەدا، کە هەموو دێیەکانی وێران و دیوارەکانیان جێگەی ناشیرینی گوللەتۆپانیان پێوە دیارە هەڵکەم. . بەڵام زۆرتر ناتوانم.

ئێمە بە سات بەڕێوەین و هەتا دێت گەرماش زۆرتر و ڕۆژەکەی بەتینتر دەبێت. ئێرە پێچەوانەی لای سەرو، کانی و ئاوی لێ نییە و من بە تەواوی مەودا و کاتم لێ تێک چووە. لە دەفتەری یاداشتەکەمدا بۆ گشت ئەم ڕۆژە تەنیا دوو پەڕەم نووسیوە بەڵام ئێستە، کە دەمەوێ ئەوەی ئەو ڕۆژە بینیم بێنمەوە بیری خۆم ناوچەکەم ئاوا دێتە پێش چاو:

- بنکەی ناوەندیی هێز، کە ئێمە شەو تێیدا بووین و من هیچ بە ڕۆژدا نەمبینی، لەماڵێکی سپیدایە لە بنی ڕێگەکە. ڕەنگە ئەم شوێنە کاتی خۆی ڕێستووورانی سەر ڕێگەکەی دهۆک بووبێ. ئەمە تاقە ڕێگەی ماشێنە لە نێوان ئامێدی و دۆڵی بامەڕنیدا. زنجیرە شاخێک بە لای چۆمی دیجلەدا تێ دەپەڕێ بۆ لای دهۆک، کە زۆریش بەرز و سەخڵەت نییە و ڕێگەکە لە ناوقەدی ئەو کێوەوە تێپەڕ دەبێت.

ناوچەیەک کە دەکەوێتە نێوان بنکەی هێز و شاری دهۆک بەتەواوی لەژێر دەستی پێشمەرگەدایە و کورد لەوێوە چاودێریی دەوروبەر دەکەن. هەموو خەڵکە ئاسایییەکە باریان کردووە و گوندەکانیشیان لەژێر ڕەهێڵەی تۆپبارانی عێراقدا وێران بوون و ئەوەی لەم ناوەدا جووڵەی بێت و ببینرێ پێشمەرگەیە. مرۆڤ دەتوانێ وا بیر بکاتەوە، کە ناوچەکە بە تەواوی چۆڵەوانییە و بێ شک لە ئاسمانەوە وا دێتە پێش چاو، بەڵام لە هەر قڵشی بەردێک و لە پەنا هەر دەوەنێکدا، پێشمەرگە خۆیان حەشار داوە. هەزاران پێشمەرگە، کە ئامادەن هەر جموجۆڵێک بەربەرچ بدەنەوە.

ئێمە دەگەینە دەراوێک ژمارەیەک پێشمەرگە لەژێر کەپرێکدا، کە بنکەی پەلێکە دانیشتوون و خەریکی حەوانەوەن. تاوێک لەژێر کەپرەکەدا پشوو دەدەین و پیاڵەیەک چا دەخۆینەوە. پاشان بە گوێ جۆگەیەکدا درێژە بە ڕێگە دەدەین، دەگەینە هێندێک بێستان و چەم و دۆڵێک دێتە سەر ڕێگەمان تا دەگەینە بنکەی پەلێکی تری پێشمەرگە. ئێرە نزیکترین بنکەیە بە شەڕەوە و

لێرە بۆ نانی نیوەڕۆ دەبینە میوانی ئەم بنکەیە. ژمارەی پەلەکە بە قسەی فەرماندەکەیان ٩٥ کەسە و ئەرکی ئەوەیان لەسەرە ئاگەداریی بەرەکە بکەن و بەرپەرچی هەر هێرشێکی دوژمن بدەنەوە. بەڵام ماوەیەکە شەڕێک نەهاتووەتە گۆڕێ و دوا هێرشی دوژمنیش بەری سێ حەفتە بوو، کە زیاتر لە سێ ساتی تووڵ کێشا:

- دوای ئەوە بینییان هیچیان پێ ناکرێ پاشەکشێیان کرد، تانکیشیان لەم هێرشە بەکار هێنا، ئێمە بە تەواوی نازانین ئەوان چەند کەسیان لێ کوژرا بەڵام شەش لاشەیان لە مەیدانی شەڕدا لێ بەجێ مان و ڕۆژی دواتر هێندێک ژنیان ناردن بیانبەنەوە. - ئێمە بە شێوەی سروشتی ئەم کارانە دەکەین و تەرمەکانیان دەدەینەوە - ئێمە چەکی دژە تانکمان نییە بەڵام دەتوانین بە مین پێشی تانکەکان بگرین. ئێستە بەرەی شەڕەکە لای ئێمە زۆر ئارامە، دۆخەکەمان بە تەواوی لەژێر کۆنترۆڵدایە، ئێمە زۆر لە پشت سەنگەرەکانی ئەوانەوە هێزمان هەیە و هەوڵ دەدەین پێوەندییەکانیان تێک بدەین.

من لەم فەرماندەیە دەپرسم، ئەوان تا ئێستە چەند کەسیان گیانی لە دەست داوە؟

- لە مانگی ئادارەوە ٨ کوژراو و ١٥ بریندارمان بوون، بەڵام عێراقییەکان زۆر زیاتریان هەبوون، ئێمە نازانین چەندە.

لەگەڵ ئەحمەد و دوو شارەزای تردا لە دەراوەکەوە بەرەوژوور هەڵدەبەزین و دوای دەشت و جارێکی نەکێڵدراو دەگەینە تەپۆڵکەیەکی بچووک و لەو شوێنەوە دەتوانین دهۆک ببینین. لەژێر دارهەنجیرێکدا خۆمان حەشار دەدەین و بە دووربین سەیری هێندێک مۆڵگە و پێگەی عێراقییەکان دەکەین. هێندە نزیکین بە روونی دەتوانین جموجۆڵی سەربازەکان لە شوێنەکانی خۆیاندا ببینین. ئارامییەکی تەواو بەسەر ناوچەکەدا زاڵە و من نابیستم

تاکە فیشەکێک بتەقێ.

کاتێک ئێمە دەگەڕێینەوە لەژێر پردێک تووشی دەستەیەک پێشمەرگە دەبین. دەچینە لایان و ئەوان هەوڵ دەدەن چەکەکانیان پیشانی من بدەن. من بە وردی سەرنج دەدەم بزانم چی جۆرە چەکێکیان پێیە:

چەکی هەرە دڵخوازی ئەم پێشمەرگانە ماوزەری درێژە لە مارکەی برنۆ. ئەم چەکانە لە ساڵەکانی ١٩٢٢ - ١٩٢٧ ساز کراون و پیاو دەتوانێ ئەم ڕێکەوتە بە سەریانەوە ببینێ. پێشمەرگەیەک کە برنۆی پێ بێ زۆر چاک ئاگەداریی دەکات و بە شێوەیەکی سەرسووڕهێن بەکاری دێنێ، کە بەوپەڕی دڵنیاییەوە ئامانج دەپێکێ. من لەگەڵدا بووم چەند پێشمەرگەیەک بۆ مەشق و تاقیکاری سێوێکیان لەسەر بەردێکدا دادەنا، کە من بە زەحمەت لە دوورەوە دەمبینی، بە نۆبە تەقەیان لێ دەکرد و هەر کامە و بە هەوەڵین فیشەک لە سێوەکەیان دەدا.

ئەوانەی برنۆیان پێ نییە لە بری ئەوە کلاشینکۆفی مارکەی ڕووسییان لە شانە. مەخزەنەکانیان ٣٠ فیشەک دەگرێ و ئەوانیش نیشانە و ئامانجیان باش دەنگێون. هەمان ئەم کلاشینکۆفە ڕووسییانە مارکەی چینیشیان هەیە بەڵام زۆر باش و پەسند نین. جگە لەمانە سیمینۆف و جۆرێکی تری چەکی گران بە ناوی دیکتانۆفیان هەیە، کە فیشەکەکانی بە زنجیرێکەوەن و سەد دانە هەڵدەگرن. بەڵام گرانترین چەکی ئەم بەرمیە دۆشکەیە، چەکێکی ئۆتوماتیک، کە دەکرێ دژی ئەو فڕۆکانەش، کە نزم دەفڕن بەکار بێت.

ئێمە دەڕۆین بۆ لای گرووپێکی تری پێشمەرگە، کە لە بناری کێوێکی لێژدا بنکەیان داناوە. پەیامێک دەگاتە لای بەرپرسانی ئەو شوێنە و تێیدا هاتووە، کە بڕیارە سات چواری پاش نیوەڕۆ تۆپبارانی هێندێک لە بنکەکانی ڕێژیم بکرێ. - من پێم وایە ئەم کارە تایبەت بۆ من ڕێک خراوە، بەڵام بەرپرسان بە توندی ئەمە ڕەد دەکەنەوە. داوا دەکەن لەگەڵیاندا بڕۆم بۆ سەر

باڵ و لەوێوە چاودێریی تۆپبارانەکە بکەم. زۆر ماندوو و هیلاکم بەلام نەمگەرەکە دڵیان بشکێنم و لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەک بۆ سەر باڵ وەڕێ دەکەوم. بڕوا ناکەم ئەم هەورازەم پێ ببڕێ، بەلام دوای دوو سات دەگەینە سەر لووتکە و لەوێوە دەشتێکی چۆڵ و وێران، شاری دهۆک و جادەیەک، کە بەرەو دەشتەکانی عێراق دەڕوا، بە ئاسانی دەبینرێن.

تیرەشانێک کە ئێمەی لێین پڕە لە تاشەبەرد و زۆر گونجاوە بۆ سەیرکردن بێ ئەوەی لە دوورەوەش ببینرێن. مۆڵگەی عێراقییەکان راست لە تەنیشت دهۆکە، من بە دووربین دەتوانم ئۆتۆمۆبێلی باری ببینم وەستاون و سەرباز لە هاتوچۆدان. تۆپباران بە چەند نرکەی گەورەوە دەست پێ دەکات و من لەو بەرزاییەوە دەبمە شاهیدی شانۆگەرییەک، کە بە تەواوی لام جێگەی بڕواکردن نییە. تۆپخانەی رژێمیش لە مۆڵگەکە و من هێندێک دووکەڵی چڕ، چەند ترۆمبێلێک دەکەونە جووڵە و لە گۆشەیەکەوە رادەوەستن.

بەلام کورد لەوە ناچێ مۆڵگەکە تۆپباران بکەن، بگرە هێندێک پۆست و پێگەی بچووک، کە ئێمە لە خوارەوە لە سێبەری دارهەنجیرەکەوە بینیمانن و ئێستە لێرەوە نابینرێن. تۆپخانەی کورد لەناو شاخەکاندا شاردراوەتەوە و من نازانم لە کوێوە دەهاوێژرێن و لە کوێش وە زەوی دەکەون. بەلام تۆپخانەی عێراقییەکان لە مۆڵگەکەدایە و لێرە و لەوێش دەبینرێن، دوای دەنگێکی ترسێنەر لە زەوی دەدەن و دووکەڵ و تۆزێک بەرپا دەکەن. دیارە عێراقییەکان هەروا "ئەلا بەختەکی" تۆپەکانیان داوێن و ئاگایان لەوە نییە داخوا تۆپخانەی پێشمەرگە لە کام لایە. سەرەنجام چەند گوللەتۆپێک ویزەویز دێن و بەسەرماندا تێ دەپەڕن، یەک دوو دانەیان لەو خوارەوە نزیک دارهەنجیرەکە دادەکەون.

من ناتوانم حوکم لەسەر ئەم تەقە و تۆپهاویشتنەی کورد بدەم چونکە نەمزانی گوللەکان لە کوێ وە زەوی کەوتن بەلام دەزانم تۆپەکانی عێراق بێ

کەڵک و وەک ئەوە بوو فەرمیان بدەیت، دیارە لای من ئەمە تەنیا گاڵتەجارییەکە، کە بۆ ئەوە سازیان کردووە من شتێکم بۆ باسکردن هەبوو بێت.

دهۆک شارێکی بە تەواوی کوردنشینە، بەشێکی زۆری ئەم پێشمەرگانە من قسەم لەگەڵ کردوون خەڵکی ئەوێن و بنەماڵەکانیان لەوێ بەجێ ماوە. جاری وایە دەستەی پێشمەرگە بە شەو دەچنە خوار بۆ ناو شار. بەڵام هیچ پلانێک بۆ گرتنەوەی شار لە ئارادا نییە. کارێکی ناومکینە، پێشمەرگە لە دەشتاییدا بەرانبەری تانک و زرێپۆشی دەوڵەت شانسێکی زۆریان نییە. بەڵام دەوڵەتیش بەو ئەندازەیە ناتەوانە لە داگیرکردنی ئەم شاخانە، کە پێشمەرگەی لێ دامەزراوە.

دوای ئەوە تاریک داهات دەگەڕێنەوە دواوە و پیاوێکی پیری شەڕدیتە، کە لە بەیانییەوە لەگەڵمانە رێگەکەمان پێشان دەدات. هەوا بە تەواوی تاریکە و من تا بۆم بکرێ خۆم لە نزیکی ئەم پیاوەوە رادەگرم. سەرم سووڕ ماوە، کە ئەم پیاوە بە تەمەنە لەم هەڵەمووتەدا چۆن رێگە دەردەکات. رێگەیەکی سەخت و بۆ من دژوارە، تاکە ئارەزووم ئەوەیە بێمە ناو چۆمەکە، لاقم لەناو ئاوی ساردی کانییەکە نێم و بحەسێمەوە. کاتێک دێنە خوار پێشمەرگە لە دەوری مێز و لای چرا لامپایەکدا ریزیان بەستووە و فەرماندەی لەشکر بە پیرمانەوە دێت و دەڵێ:

بەخێربێن بۆ لامان

کاتێک لە نزیکەوە سەرنجی ئەم بەرپرسە دەدەم دەبینم راست وەک ئەسعەد، فەرماندەکەی هێزی پێشمەرگە، کە لە بنکەی ئەسڵیدا بینیمان دەچێ و بە سەرسووڕمانەوە لە ئەحمەد دەپرسم ئەمە کوڕی ئەسعەد نییە؟

– بەڵێ راستە ئەمە کوڕی ئەسعەدە.

لێکچوونی ئەم دوو کەسە جۆرێکە، تەنیا لە رواڵەتدا نا، بگرە رووخۆشی،

ئارامی و بڕوابەخۆبوونیشیان ڕاست وەک یەک دەچێ.

جگە لە ئێمە مێوانێکی تر لەناو کۆڕەکەدایە، جلی پێشمەرگانەی لەبەرە و کلاشینکۆفێکیشی لە پێشە. بەلام من بڕوا ناکەم ئەمە پێشمەرگەی بەرەی شەڕ بێت. دۆستانە بە ئینگلیزی قسە لەگەل مندا دەکات و دەلێ ناوی "محەمەد سەلیم ئەلموفتی"یە. لە بەشی سیڤیلی شۆڕشدا خزمەت دەکات و ئێستە بۆ سەردان و بینینی دۆخەکە هاتووە بۆ بادینان:

- من هاتم بۆ ئەم بەرەی شەڕ تا بەلکو هەوالێک لە بنەمالەکەم، کە ئێستە لە دهۆکن و من هیچ هەوالێکم لێیان نییە بزانم.

پێش چەند مانگان محەمەد لە دهۆک دەژیا و نووسینگەی بریکارەتیی هەبوو، جگە لەوەش مولک و مالێکی باشی لە دەرەوەی شاردا هەبوو و ژیانی زۆر باش دەسووڕا. بەلام لە مانگی مارت هات و تێکەلی شۆڕش بوو:

- ئێستە دەبێتە حەوت مانگ و دە ڕۆژ، کە من هیچ هەوالێکم لەبارەی بنەمالەکەمەوە نییە. تەنیا ئاگەدارم، کە زاواکەم کە ئەفسەری سوپا بوو گیراوە، ئەوڕۆ هاتم بۆ ئەم شوێنە تا بزانم ئەوان خەبەرێکیان هەیە بمدەنێ بەلام بە داخەوە ئەوانیش هیچ هەوالێک لەم بارەوە نازانن.

پێم وت، کە من ئەمڕۆ لە بەرزاییەکەوە دهۆکم بینی.

- ئای، خۆزگە بە خۆت، منیش زۆرم پێ خۆشە هەر لە دووریشەوە بیبینم و بزانم بنەمالەکەم لەو خوارەوە لە چی جێگەیەکدا دەژین.

محەمەد کاتێک هاتە دەر لە دهۆک ترۆمبێلە "فیاتە"کەی لەگەل خۆی هێنا و هێشتا پێیەتی، بەو ماشێنە هاتووە بۆ ئێرە و داوا لە من و ئەحمەد دەکات لەگەلیدا بڕۆین بۆ سەرسەنگ گوایا ئەو لەوێ مالی هەیە. کوڕەکەی ئەسعەد دەلێ لێرە بمێننەوە پشوو بدەن ئەمشەو. منیش وام پێ باشە بەلام ناشمەوێ ئەو هەلە لە دەست بدەم، کە بە هاسانی بۆم هەلکەوتووە سەرسەنگ ببینم، ڕێگەیەکی دوورە تا چۆمان و لەم بەرەی ڕۆژاواشدا

شــتـێکـی نوێ نیـیــه من لەســەری بنووسم بۆیە نیــوەشــەو مــاڵاوایـی لەم پێشمەرگانە دەکەین و بەڕێ دەکەوین.

لە کاتی ڕێکەوتندا ئەو پێشمەرگە بە تەمەنەی، کە دوێنێ لەگەڵمان بوو من لە ئامێز دەگرێ، بە شێوەی کوردی ئەملا و ئەولام ماچ دەکات و دەڵێ:

- تۆ زۆر ئازای، ئەگەر بمایایتەوە دەمانکردیتە پێشمەرگەیەکی باش.

## راستیت دەوێ، ئەوەی ئێمە داوای دەکەین شتێکی زۆر نییە

سەرسەنگ یەکێک لە ناسراوترین شوێنە تووریستییەکانە لە کوردستانی عێراق. لە سەردەمی ئاشتی خەڵکی ناوچە دەشتاییەکان بە شاخاندا هەڵدەگەڕان و خۆیان دەگەیاندە ئەوێ تا خۆیان بگەیێننە هەوای فێنک و سازگاری ئەم دەڤەرە. سەرسەنگ بەگەلێک هۆتێل و بینای تازەوە، کە بە مەبەستی گەشتەوەری ساز کراون خۆی جۆرە ناوەندێکە. پێش دەست پێکردنی شۆڕشی ١٩٥٨ مەلیک فەیسەڵ کۆشکێکی لێرە ساز کردبوو و ئەم هۆتێلانەش بەشێک بوون لە پرۆژەکە.

ئێستە هەواڵێک لە گەشتەوەران لە گۆڕێدا نەماوە، هۆتێلەکان بە ناچار کراونەتە ماڵ بۆ ئاوارە و لێقەوماوانی شەڕ و شارەکەش بووەتە ناوەندێک بۆ ئیدارەی شۆڕش لە هەموو بادیناندا. زۆرێک لە رووناکبیران، کە لە مانگی ئاداردا تێکەڵی شۆڕش بوون لێرە کۆ بوونەتەوە و هەوڵ دەدەن بۆ شۆڕش بە کەڵک بن و قازانجێکی پێ بگەیێنن. رێنوێن و رێبەری ئەمانە پرۆگرامی پارتی دیموکراتی کوردستانە، کە بۆ نموونە لە فەسڵی ٢٣دا هاتووە:

"ئێمە تێ دەکۆشین خوێندنی قۆناغی سەرەتایی بۆ ژن و پیاو بکەینە زۆرەکی و کورسیی شەوانە بۆ کرێکاران، جووتیاران و. . . دابنێین و ژمارەی کتێبخانان زیاد بکەین تا ئاستی خوێندەواریی خەڵک بەرینە سەر."

ئامانج ئەوەیە نەخوێندەواری بە تەواوی لەناو ببرێ و لەناو کڵپەی ئاگری شەڕیشدا ئەم هەولانە بە بەربلاوی بەردەوامن و شەڕ نەیتوانیوە پێشی

بگرێ. راست ئەو ڕۆژەی من دەگەمە سەرسەنگ تاقیکردنەوەی دەرسی ئینگلیزی بۆ ٢١٨ کەس، کە قەرارە ببنە مامۆستا بەڕێوە دەچوو. تاقیکردنەوەکە لە قوتابخانەیەکدا بەڕێوە دەچوو، قوتابییەکان بە پرسیارەکانیانەوە لەسەر مێز و لە دالانی مەکتەبەکەدا دانیشتوون و خەریکی کاری خۆیانن. زۆربەی ئەم قوتابیانە، کە بڕیارە دوای تاقیکردنەوە ببنە مامۆستا، کوڕی گەنج و هێندێکیان پێشمەرگەن، کە راست لە بەرەی شەڕەوە هاتوون و چەکەکانیان لە دیوێکی تری تەنیشتەوە هەڵپەساردوون. بەڵام هێندێک کچیش بەشداری ئەم تاقیکارییەن.

لە سەرەتای شۆڕشدا زانسگەی کوردیی سلێمانی داخرا بەڵام مامۆستا و قوتابییەکان تێکڕا بەشداری شۆڕش بوون. پلان ئەوە بوو زانسگەیەکی نوێ لە قەلادزێ ساز بکرێ. بەڵام ڕۆژی ٢٤ی تشرینی یەکەم شارەکە کەوتە بەر شالاوی بۆمبارادمان و لە ئاکامدا ١٣١ کەس کوژران و زیاتر لە ٣٠٠ کەسیش بریندار بوون. دوو قوتابخانە وێران بوون و ژمارەیەکی زۆر لە کوژراوەکان قوتابی بوون. قەلادزێ دوای ئەم ڕووداوە کەوتووەتە دەست هێزەکانی ڕێژیم و زۆربەی خەڵکەکەشی کێویان گرتووەتە بەر و گەیشتوونەتە لای شۆڕش.

تا توانرا هەوڵ درا قوتابخانە بەردەوام بن بەڵام بۆمباران مۆڵەتیان نەدا و سەرەنجام بڕیار درا لەبەر ئاسایشی خەڵک لەو دەڤەرە قوتابخانەکان دابخرێن. مستەفا محەمەد، کە لە سەرسەنگ بەڕێوەبەری قوتابخانەیەکە دەڵێ:

– ئێمە خەریکین جارێکی تر قوتابخانە بکەینەوە و خوێندن لە کۆمەڵێک گوند دەستی پێ کردووەتەوە. بەڵام لە ترسی فڕۆکەی دوژمن زیاتر لە دەرەوەی قوتابخانەکان دەرس بە منداڵەکان دەڵێین و ناوێرین ریسک بە ژیانی خۆمانەوە بکەین چونکە دەترسین کارەساتی قەلادزێ دووپات بێتەوە.

گرینگ ئەوەیە نەهێڵین کردەوەی خوێندن راوەستێ. چونکە ئێمە لە هەلومەرجێکی تایبەتدا دەژین، ستانداردی ئێمە بۆ خوێندن زۆر لەسەرترە لە عێراق. ئەو گەنجانەی ئێستە خەریکی تاقیکردنەوەن لە هەموو کوردستانەوە دێن، سلێمانی، کەرکووک، مووسڵ و. . . ئەوان لەم ماوەیە درێژەیان بە خوێندنی خۆیان داوە و ئێستەش هاتوون بۆ سەرسەنگ تا لێرە تاقیکردنەوەکەیان بدەن و ببنە مامۆستا.

لە سەرسەنگ تووشی کەسێکی سەیر بە ناوی جەرجیس مەلەک چەکۆ، بە پێی ڤزیت کارتەکەی: بەرپرسی کۆمیتەی بەرزی کریستیانەکان (لە کوردستانی عێراق) بووم.

من لەم ماوەدا بۆم دەرکەوتووە کورد لە بناخەدا هەموو موسڵمان نین. چونکە لە سەفەری بادینانمدا لە بەرواریی باڵا تووشی کەسانی مەسیحی بووم. زۆر دیار و روونە، کە لە هێندێک گونددا موسڵمان و کریستیان لە تەنیشت یەکتردا دەژین. لە چۆمانیش من خۆم میری خەڵکی یەزیدییانم بینیوە.

لە سەرسەنگ گەڕەکێکی مەسیحییان هەیە و ئێمە دەچین بۆ ئەوێ تا قەشەکەیان ببینین. من زۆرم پێ خۆشە بزانم ئەوان سەر بە کام تیرەی مەسیحین - ئاخر گەلێک تیرەی جۆرەوجۆری مەسیحی هەن - ئەحمەد کە سەر بە وەچەی مۆدێرن و زۆر پێوەندیی بە ئاینەوە نییە بەڵام ئەویش وەک باوکی موسڵمانە و لەم بارەوە ناتوانێ وەڵامێکی بۆ من هەبێت.

ئێمە لە بەرجێوانی ماڵێکدا قەشە دەبینین بەڵام هاوکات جەرجیس مەلەکیش لەوێیە، کە بە ئینگلیزییەکی تەواو بانگی من دەکات و بەوپەڕی ئامادەییەوە قەول دەدات وەڵامی پرسیارەکانی من سەبارەت بە ئاین لە کوردستان بداتەوە. ئاخر ئەو بەرپرسی کۆمیتەی بەرزی کاروباری مەسیحییانە و بۆ من باس دەکات، کە:

– زۆربەی کریستیانە کوردەکان "کاتۆلیکی رۆمین". بەڵام من خۆم سەر بە تیرەی کڵێسای رۆهەڵاتی کۆنم. بە ئێمە دەڵێن "نێستووریان" نێستووریوس ساڵەکانی ٤٢٨ – ٤٣١ "پاتیریارکێک" (قەشەیەک) بوو لە کۆستانتینوپێل (ئێستانبووڵ). ئەو بیری لە کریتسی (مرۆڤایەتیی راستەقینە) دەکردەوە و گەیشتبووە ئەوەی، کە عیسا سروشتێکی دوو لایەنەی هەیە. واتا هەم مرۆڤە و هەم خوا. جیاوازیی ئێمە لەگەڵ مەسیحییەکانی تر لەوەدایە، کە نێستووریانەکان مریەم بە "دایکی خوا" قەبووڵ ناکەن. دەورووبەری ٤٠٠٠٠ مەسیحیی نێستووریان لە کوردستانی عێراقدا هەن بەڵام قەشەکەیان لە سانفرانسیسکۆیە و لەم جۆرە تیرەیە لە هەموو دنیا بڵاو بوونەتەوە.

جەرجیس درێژەی دەدات و دەڵێ:

– زۆربەی کورد موسڵمانی سونین، دوای ئەوان کاتۆلیکە رۆمەکان دێن و دوای ئەوانیش ئێزیدی – ئێمە شەیتانپەرستیان پێ دەڵێین – هەروەها ژمارەیەکی کەم مەسیحی پرۆتێستانیش هەن. بەڵام ئێمە لە کوردستان دەگمەن هەست بە کێشەیەکی بەرچاو لە نێوان پەیڕەوانی ئاینەکاندا دەکەین . لێرە هەر کەس سەربەستە بڕوای خۆی هەبێ و بۆ خۆی خواپەرستی بکات. من خۆم هیچ کێشەیەکم لەگەڵ ئیسلامدا نییە و هێندەی ئاینی خۆم بە نرخ سەیری دەکەم. ئێمە هەموو لایەکمان بڕوامان بە هەمان خوا هەیە، تەنیا ناوی جیاوازمان بۆ پێغەمبەرەکەی هەیە و ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ ئێمە بچووک سەیری یەکتر بکەین. رژێمی بەغدا هەوڵ دەدات دین و بڕوای ئاینیی خەڵک لەم شەڕەدا بە قازانجی خۆی بەکار بێنێ، بەڵام بێ ئاکام بووە. ئێمە لە کوردستان پێوەندییەک لە نێوان ئاین و سیاسەتدا هەست پێ ناکەین. شۆڕش هەمووان دەگرێتەوە و هەموانیش بەشداریی تێدا دەکەن، جا ئیدی نێستووریان بن، موسڵمان، یان ئێزیدی. هەمووان شان بەشانی یەک خەبات دەکەین. ئێمە هەموو لەم ناوچەیە لەدایک بووین و هەڵبژاردنێک بۆ کەسمان لەم بارەوە لە گۆڕێدا نەبووە. بڕوای کەسانیی من ئەوەیە هەموو

مرۆڤێک دەبێت بڕوای بە هێزێکی سەرەوە، کە هەموو شتێکی بەدەستە، هەبێ. دەنا جیاوازیی لەگەڵ ئاژەڵێکدا نابێ. بەڵام چۆن خوای خۆی پێناسە دەکات و چۆن یاد و بۆنەکانی بەڕێوە دەبات زۆر گرینگ نییە. ئێمە لە کوردستان ڕێز لە بڕوای یەکتر دەگرین و ئەمەش تایبەتمەندییەکی خەڵکی کوردە. تۆلەرانس و قبووڵکردنی بیروڕای جیاواز. تۆ هەستت پێ نەکردووە لەم ماوەدا؟

بۆچە نا، منیش لەم ماوە کورتە هەستم بەم دیاردەیە کردووە و ئەگەر وا بێت ئێوە لە چاو خەڵکانی تردا گەیشتوونەتە ئاستێکی باشی پێشکەوتن. چەکۆ درێژەی دەدات:

– بەڵێ، بەڵام شتێکی تر هەیە، کە تایبەتی کولتووری کوردە، ئەویش ئەو پێوەندییە توندەیە لەناو بنەماڵەدا هەیە. من بە جۆرێک بەزەییم بە ئێوەی سوێدییاندا دێتەوە. – لە باری مادییەوە ئێوە گەیشتوونەتە ئاستێکی باش – بەڵام پێوەندیی بنەماڵەتان تێک دراوە. ئێوە نرخێکی گرانتان بۆ ئەم کارە داوە و لەم بارەوە لە دوارۆژدا کێشەی گەورەتان بۆ ساز دەبێت.

من لە چەکۆ دەپرسم ئاخۆ ئەو لە سوێد بووە؟

– بەڵێ، مانگی کانوونی دووەم لەوێ بووم. ڕێبەری شۆڕش منی لەگەڵ تیمێک ناردبوو تا هەوڵی کۆکردنەوەی یارمەتی بۆ شۆڕش بدەین. من لە سوێد چاوم بە "ئۆلۆف پالمە" (ئۆلۆف پالمە ئەودەم سەرەک وەزیری سوێد بوو. – وەرگێڕ) کەوت. بە باشی گوێی لە قسەکانمان گرت و من هەستم کرد ئەو بە شێوەیەکی باش و پۆزەتیف سەیری کورد دەکات. ئەو حاڵی دەبوو شۆڕشی ئێمە بۆ چی ئامانجێک تێ دەکۆشێ.

بەڵام هیچ یارمەتییەکتان وەرگرت؟

– ئەوان بەڵێنی یارمەتیی مرۆڤییان پێ داین. هێندێک داو و دەرمانمان وەرگرت. بەڵام ئەوەی ئێمە پێش هەموو شتێک پێویستمانە یارمەتیی

سیاسییه، ئەمە گرینگترین شتە لای ئێمە و دەشزانین ئەمە زۆر هاسانە بۆ سوێد کێشەی ئێمە لە نەتەوە یەکگرتووەکاندا بێنێتە گۆڕێ. ئەمە تاکە شتێکە ئێمە داوای دەکەین.

من بە تەواوی لە چەکۆ و جێگە و شوێنی لەم شۆڕشەدا تێ ناگەم، لە لایەک ئەو خۆی وەک بەرپرسی کۆمیتەی مەسیحییەکان بە من دەناسێنێ و لە لایەکی ترەوە دەڵێ وەک نوێنەر و دیپلۆماتێک سەردانی ئەوروپای کردووە و دیدارێکی یەک سەعاتەشی لەگەڵ سەرەک وەزیری سوێد پالمەدا هەبووە. ئێستەش من لێرە دەبینم بێ کار لە سەرسەنگە و لێرەوە داوا لە من دەکات سوێد کێشەی ئەوان لە یو ئێندا بێنێتە بەرباس.

پێم وا نییە ئێوە بتوانن هیوایەکی زۆرتان لەم بارەوە بە سوێد هەبێ، چونکە ئەم کێشەیە وەک "کێشەی ناوەخۆیی" عێراق بە حیسێب دێت و نەتەوە یەکگرتووەکان پێوەندییەکی بەم جۆرە شتانە نییە.

– بەلام بنەمای یو ئێن ئەوەیە هەر نەتەوەیەک بۆی هەیە دەولەتی خۆی دامەزرێنێ و چارەنووسی دوارۆژی خۆی دیاری بکات. بۆچی جیاوازییەک بۆ نەتەوەی کورد لە بەرچاو دەگیرێ؟ ئەوەی کە ئێمە دەکاتە کەمایەتییەک لە ولاتێک بە ناوی عێراقدا مانای ئەوە نییە لە مافە نەتەوەییەکانی خۆمان دەست هەلگرین؟ ئێمە بەو حالەش داوای سەربەخۆیی ناکەین، تەنیا داوای ئۆتۆنۆمی دەکەین. راستی ئەمە شتێکی زۆر نییە ئێمە داوای دەکەین. گەلێک کەمایەتیی تر ئەم مافەیان بە دەست هێناوە – بۆ نموونە سەیری کۆیبەک لە کەنەدا بکە – من پێم وایە پالمەی ئێوە ئەم خەباتەی ئێمە بە رەوا دەزانێ. من چاوەڕوانم سوێد هەوڵ بدات کوردستان لە بەرنامەی یو ئێندا جێ بگرێ، ولاتی سوێد کە رۆژێک ژێر پرۆگرامی یو ئێنی ئیمزا کردووە دەبێت هەولی جێبەجێکردنیشی بدات. دەولەتی تۆ دوو رێگەی لە بەرە: یان یو ئێن بەجێ بێلێ یان هەوڵ بدات کێشەی کورد بکرێتە باس و بەرنامەی ئەو رێکخراوە.

من بە چەکۆ دەڵێم لەگەڵتدا هاودەنگم بەڵام دیسانیش دەبێت بزانی، کە شت وا ناچنە پێش. تۆ بە تەواوی چاوەڕوانی زیادە لە رادەت هەم لە سوێد و هەم لە یو ئێن هەیە. جەرجیس مەلیک چەکۆ لە وەڵامدا دەڵێ:

- شتێکی تر هەیە تۆ دەبێت بیگەینیتە خەڵکی سوێد، ئەویش لە پێوەندی لەگەڵ نەوتدایە. ئەگەر کورد رۆژێک بگەنە داوا رەواکانیان بەشی زۆری چاڵە نەوتەکان دەکەونە ناو سنووری کوردستانەوە. ئێستە هێزەکانی دەوڵەت ئەو ناوچانەیان داگیر کردووە بەڵام ئەو شوێنانە خاک و موڵکی ئێمەن. کاتێک ئێمە سەرکەوین ئەو گەلانەی یارمەتییان داوین کێشەیەکیان لەبارەی نەوتەوە نابێت، هەرچییەک نەوتیان بوێ دەتوانن بیبەن.

من دەڵێم: بەڵام نەوت لە لایەن دەوڵەتی ناوەندییەوە دەنێردرێتە دەرەوە و لەم بارەوە دوکتۆر عوسمان بە وردی باسی بۆ من کرد.

- بەڵێ ئەمە راستە. بەڵام ئێمە دەسرۆینمان لەسەر دەوڵەتی ناوەندی دەبێت و ئەو کات ئێمە هەوڵ دەدەین دۆستەکانمان پێش هەمووان بەریان کەوێ. دیارە ئەمە کانزا سروشتییەکانی تریش دەگرێتەوە. کوردستان وڵاتێکی دەوڵەمەندە. لێرە ئاسن، کریستاڵ، یۆرانیۆم و تەنانەت زێڕیش هەیە. ئێمە هەوڵی دەرهێنانی ئەم کانگایانە دەدەین و ئەوانەی ئێستە هاوکاریمان دەکەن بە زیادیشەوە تۆڵەی چاکەیان دەکەینەوە. بە چەکۆ دەڵێم:

من پێم وا نییە باسی ئەم شتانە و بە تایبەتی نەوت بەم شێوەیە لە لای رۆژاواییەکان قازانجێکی بۆ ئێوە هەبێ و ببێتە هۆی یارمەتیدانی ئەوان بە ئێوە، چونکە تا ئەو کاتەی دەوڵەت نەوت و فرۆشتن و ناردنە دەرەوەی کۆنترۆڵ بکات، رۆژاوا ئەوان بە خاوەنی نەوت دەزانێت و پشتیان دەگرێ.

- بەڵام ئێمە چی بکەین؟ تا ئێستە هیچ دەوڵەتێکی ئەندامی یو ئێن یارمەتیی ئێمەی نەداوە. هەرچەند ئێمە خۆمان لە توانماندا هەیە لەم

شەڕەدا سەرکەوین و چونکە ئامانجەکانمان ڕەوا و ڕاستن، هەموو خەڵکی ئێمە هاوکار و پشتیوانی ئێمەن و سازن لەم ڕێگەیەدا بمرن بۆیە هەر سەردەکەوین.

تۆ خۆشت سازی لەم ڕێگەیەدا بمری؟

- برایەکم پێشمەرگە بوو - لە شەڕدا کوژرا - ناوی هورموز بوو و دوای مەرگی ناوی بەتالیۆنێکی تایبەتی پێشمەرگەیان بە ناویەوە کردووە پێی دەڵێن هێزی هورموز. ڕوونە منیش سازم وەک پێشمەرگەیەک خزمەت بکەم هەر کات پێویست بێت. بەڵام دەزانم من لە پشتی بەرەی شەڕەوە خزمەتی چاکترم پێ دەکرێ چونکە من شەڕوانێکی باش نیم.

پاش نیوەڕۆکەی سواری ئۆتۆمۆبێلە فیاتەکەی محەمەد ئەلوفتی دەبین و دەچینە ئامێدی تا شەوێکی تر لە ماڵی باوکی ئەحمەددا بمێنینەوە. پارێزگار قەولی داوە بەیانی زوو ترۆمبێلێکمان بۆ ئامادە بکات تا بمانگەیەنێتە سەر چۆم تا بۆ لای ڕۆژاوا بگەڕێنەوە و دەرکەوت بەڵێنەکەی بردە سەر. بە پێچەوانەی جاری پێشوو ئەم جار ناچینە لای گەمییەکە، بگرە لە خوارترەوە لە شوێنێک، کە ئاوەکە بواری پەڕینەوەی هەیە ڕادەوەستین. چەند وڵاخدارێک بە هێسترەکانیانەوە خەریکی پەڕینەوەن و ئاو تا نزیک سینگیان دەگات. چەند پیاوێک لەوبەرەوە چاویان بە ئێمە دەکەوێ و دواتر ڕێگەهەڵکەنێک (حفارة) دێتە ناو ئاوەکە، ئێمە بە کۆڵەکانمانەوە سەردەکەوین و بێ هیچ گرفتێک دەمانپەڕێنێتەوە. من چاوم بە کرێکارانێک دەکەوێ ڕێگەی نێوان بارزان و ئاوکە و ئامێدی و ئەم چۆمەیان ساز کردووە. بەرپرسی ئەم دەستەیە ناوی ئەحمەد سەعید بریفکانی و ئەندازیارێکی ٢٦ ساڵەی خەڵکی دهۆکە. ئەحمەد بریفکانی ساڵی ١٩٧١ خوێندنی لە زانسگەی مووسڵدا تەواو کردووە. لە مانگی ئاداری ئەم ساڵدا کاتێک شەڕ دەستی پێ کردەوە ئەرکی خۆی لە لای ڕێژیم بەجێ هێشت و

خۆی گەیاندە هێزی پێشمەرگە. ئێستە ئەحمەد سەرپەرشتیی هێزێکی ڕێگەسازکەری ٣٠ کەسی دەکات کە ٣ بۆلدۆزەر، ٢ بەردشکێن، کۆمرێسەرێک و جووتێک تراکتۆریان لە بەردەستدایە. بریفکانی لەم بارەوە دەڵێ:

– ئێمە ڕێگەی نێوان ئەم چۆمە و بارزانمان بە ٣٥ ڕۆژان ساز کرد. ئێمە لەم سەرەوە دەستمان پێ کرد چونکە سەرەتا مەکینەکانمان لێرە بوون. ئەم ماوەیە ٣٠ کیلۆمەترە و ئێمە شەو و ڕۆژ کارمان تێدا کرد تا ئامادەمان کرد. ئێستە گەرەکمانە پردێک لەسەر ئەم چۆمەدا ساز بکەین بەڵام لەبەر نەبوونی سووتەمەنی بۆ دەستگاکانمان ناچار بووین راوەستین و چاوەڕوانی گەیشتنی تانکەرێک بکەین، کە بڕیارە لە چۆمانەوە بگات.

ئەمانە جۆرێکی تایبەتین لە پیاوان، ژیان بۆ ئەوان ئەوەیە کە ڕێگە ساز بکەن. وزە و توانێکی وایان لێ دەبینرێ بتوانن کێو هەڵگرن و بۆ شوێنێکی تری بگوازنەوە. ئەوان ئاگەدارن کە خزمەتی ئەوان بەم شۆڕشە یەکسانە لەگەڵ ئەوەی لە بەرەی شەڕدا ڕاستەوخۆ بەشداریی پەلامار بن و دەشزانن دەردی سەر و زەحمەتیی ئەم کارەی ئەوان لە کاری پێشمەرگەی بەرەی شەڕ کەمتر نییە. کێشانی ٣٠ کیلۆمەتر ڕێگە لەم هەڵەمووتەدا بە ٣٥ ڕۆژ خۆی شاکارێکە. ئەوان پێیان وایە ئەم ڕێگەیە دەتوانرا زۆر پێشتر ساز بکرێ، بەڵام وەک خۆیان دەڵێن ڕێژیم بایەخی بە سازکردنی ڕێگە لە کوردستاندا نەبوو. هەوەڵ جار، کاتێک سەرلەنوێ شەڕ دەستی پێ کردەوە ئەوان توانییان دەست بەو شتەی، کە هەردەم ئارەزوویان بووە – لە کوردستان ڕێگە سازکردن – بکەن. بریفکانی دەڵێ:

– هەڵبەتە مەکینە و کەرەستەکان هی عێراقن، ئەوانیش ئاوارەن. شۆفێرەکان لە دهۆکەوە هەڵیان گرتن و هاتن تا بیاندەنە شۆڕش.

ئەم کەسانە ئەو توانە بەنرخەیان تێدایە هەر ڕۆژە و وەک خۆی ببینن، واتا

خۆیان لەگەڵ هەموو هەلومەرجێکی نوێدا بگونجێنن. بڕیارە کار بکەن، وزەی ئەوان خـــاڵیــبـــوونەوە و تەواوبوون ناناسێ. ئەگـــەر بە هۆی نەبوونی کـەرەسـتـەیەکیشـەوە – نەبوونی سـووتەمـەنی بۆ نموونە – ئەوان دەتوانن پشووی خۆیان وەرگرن و بۆ کاتی کار خۆیان ساز و ئامادە بکەنەوە. کاتی حەسانەوە خۆیان بە ماسیگرتنەوە خەریک دەکەن. من لەگەڵیان دەڕۆم بۆ لای گـۆمـێک، کـە قـووڵـتـرە لە شـوێـنەکـانی تر و دەبینم بە دینامـیت لەناو قـوتوویەکی چوارگـۆشـەدا، کـە حـاڵەتی بۆمـبـێکی بچـووکی هەیە، لەناو ئاوەکەدا دەیتەقێننەوە و دەبێتە هۆی سڕبوونی ماسییەکان و ئەوانیش بە مەلەکردن و بەهاسانی دەتوانن بیانگرن. بریفکانی لەم بارەوە دەڵێ:

– ئەم جـۆرە مـاسـیگرتنە بە پێی یاسـای شـۆڕش قـەدەغـەیە، ئێـمـە زۆر دەگمـەن ئەم کارە دەکەین بەڵام ئەمڕۆ دەمـانەوێ تۆ بـانگهێشـتن بکەین بە ماسی بۆیە ئەم کارە دەکەین.

ماسییەکان لەسەر ئاگرێک و لە کوێ چۆمەکەدا دەبرژێنن و پێکەوە لەگەڵ برنج و پەتاتە دەیخـۆین. ئێـوارەیەکی درەنگ سـواری لانرۆڤـەرێک دەبین و بریفکانی بڕیارە تـا گـوندی "بلێ" بمـانگەیێنێ. ڕێگەکـە لە چاو چەند ڕۆژ پێشتر، کە ئێمە بە شەو پێیدا تێ پەڕین باشتر بووە و بریفکانی لەم بارەوە دەبێژێ:

– ڕۆژێک ئەمە دەبێتە جادەیەکی باش و قیرتاو.

ئەو زۆر خـۆشـحـاڵ و ڕازییـە لە کـارەکـەی و بە وتەی خـۆی بـۆ دەست پێکردنی ئەم کارە ئامرازی پێوانە و تاقیکارییان نەبوو، تەنیا بە بولدۆزەرێک دەستیـان بە هەڵکەندن و هەڵدڕینی کێوەکان کرد و درێژەیان دا تا گەیشتنە کوێ چەم. ئێستـەش ئەم ڕێگەیە تەنیـا ڕێگەی گـرێدانی ڕۆهەڵات و ڕۆئاوای ئەم بەشـە ئازادەی کـوردسـتـانە. من لە بریفکانی دەپرسم ئاخـۆ کـاتی زستانیش دەتوانن ئەم ڕێگەیە کراوە ڕاگرن؟

- به باشی نازانین. هەوڵی خۆمان دەدەین. ئێستە کێشەی هەرە سەرەکیمان ئەوەیە بتوانین سووتەمەنیی تەواو بۆ موتۆڕەکانمان دابین بکەین و ئەویش دەبێت لە ئێرانەوە بگاتە ئێرە.

ئەم ئەندازیارە گەنجە کاریگەرییەکی زۆری بۆ سەر من هەیە، ئەو دەیتوانی لە عێراق راوەستێ، ئیشێکی باشی هەبوو، دەیتوانی ژیانی هاوبەش پێکەوە بنێ، ماڵ و حاڵی خۆی هەبێت و ژیانێکی بێ گرفت بباتە سەر. کەچی من دەبینم ئەو لە بری ئەوە ژیانێکی سەخت و دژواری لەم هەردەدا بەبێ ژن، ماڵ و دوور لە هەر جۆرە ئاسوودەیی و ئاسایشێک بۆ خۆی هەڵبژاردووە.

من لێی دەپرسم تۆ پێت وا نییە ژیانت بەفیڕۆ چووە؟

- با، شتێکی سروشتییە. هێندێک جار و شەو کاتی نووستن بیر دەکەمەوە. ژیانی ئێمە سەخڵەتە. بەڵام جێگرەوەیەکی ترمان نییە. ئێمە دەبێت ژیانمان لە رێگەی کوردستاندا بەخت بکەین.

لە بارزان رادەوەستین تا سەردانی قایمقام، کە ناوی عەبدوڵڵا بارزانی و خزمێکی جەنەراڵ بارزانییە بکەین. ئەو هەوڵ دەدا بۆ خواردنی ئێوارە رامان گرێ بەڵام ئێمە نامانەوێ درەنگمان بەسەر بێت و خوازیاری رۆیشتنین. لە باخچە بۆنخۆشەکەیدا دانیشتین و پێشمەرگە بێدەنگ لەسەر گیای باخچەکە دانیشتوون و گوێەداریی رادیۆ کوردستان دەکەن. هەواڵەکانی رادیۆ باسی شەڕ و پێکچوونی دژوار لە بەرەی رەواندزدا دەکەن. لای نیوەشەو دیسان دەگەینەوە بلێ و دەچینە رستوورانە شڕەکەی پێشوو، کە بە چرا لامپایەکی نەوتی رووناک کراوە. بۆشکەیەکی پڕ لە ئاو لەبەر دەرگەیە و پێشمەرگەی ماندوو لە دەرەوە دێن و خەریکن لێی دەخۆنەوە. هێسترێک لە دەرەوە خەریکی سمکۆڵانە و پشیلەیەک بە بەچکەکانیەوە دێت و لە پاشماوەی خواردنێکی بەجێماو دەگەڕێ تا بیخوا.

من وای حیسێب دەکەم، کە شەو لەم شوێنە ببەینە سەر بەڵام پاش تۆزێک لاندرۆڤەرێک دێت، جێگەی خۆمان دەکەینەوە و دەگەڕێنەوە بۆ چۆمان. من لەم رێگە درێژ و سەختەدا خەریکی وەنەوز دانم بەڵام لەبەر رووناکیی چرای ماشێنەکەوە تانکەرێک دەبینم لە گۆشەیەکی رێگەدا هەڵدێراوە. لەبەر خۆمەوە ئێژم رەنگە ئەمە ئەو تانکەرە بێت، کە کرێکارەکانی رێگە سازکردن چاوەڕوانی گەیشتنی دەکەن.

## کێوەکان تاقە دۆستی ئێمەن

لەو مـاوەیەی من لە بادینان بووم شـەڕ لە بەرەی ڕۆژهەڵات دژوارتر بووبوو. کاتێک سەرلەبەیانی من گەیشتمە چۆمان هەستم کرد دۆخەکە گۆڕاوە و شەڕەکە زۆر نێزیکتر بووەتەوە.

من هەلێکم بۆ هەڵکەوت تا سەردانی بەرەی شەڕ لە ناوچەی باڵەکدا بکەم. ئەم بەرەیە بە ترۆمبێل دوو سات ڕێگەیە و لەگەڵ وەرگێڕێکی تر بە ناوی لەتیف، کە هێندێک جیاوازیی لەگەڵ ئەحمەددا هەیە بە سواری لاندرۆڤەرێک بەرەو ئەو شوێنە وەڕێ دەکەوین. لە لای گەلاڵەوە بەرەو ڕۆژاوا دەگەڕێینەوە و دەگەینە لای بنکەیەکی سەربازیی پێشمەر. لە بەرپرسی بنکە کە لەژێر کەپرێک و لە تەنیشت مێزێکەوە دانیشتووە و لێمان دەپرسێ ئاخۆ ئێمە ئاگاداری مەترسییەکانی ئەم جێگەیەین، مۆڵەتی تێپەڕین وەردەگرین.

هەرچییەک پێشتر دەچین دۆخەکە ئاڵۆزتر و پڕ مەترسیتر دێتە بەرچاو. ماشێن و لۆریی سیڤیل خۆیان لەژێر سێبەری دارەکاندا حەشار داوە و باس دەکرێ تازە هێرشێکی فڕۆکەی مێگ لەم نزیکانە ئەنجام دراوە و بووەتە هۆی کوژرانی چەندین پێشمەرگە. شۆفێرەکەمان زۆر نەبەدڵ و ناڕازییە لەم سەفەرە و زۆری پێ خۆشە بگەڕێتەوە. بە پێچەوانەی عەبدوڵڵا، کە بۆ سەفەری بادینان لەگەڵمان بوو ئەم زۆر شڵەژاو و ترساو دێتە بەرچاو. بەرەوخوار و روو لە دۆڵێک درێژە بە ڕێگە دەدەین و من لام وایە ئەم ڕێگەیە زۆر پڕ مەترسییە. ئێمە دەبووا بە شەو ئەم ڕێگەیە ببڕین، چونکە هەردەم دەشێ مێگێک سەرهەڵبدات و ڕاست ترۆمبێلەکەی ئێمە بکاتە نیشانە. دەنگی تەقینەوەی تۆپ لە هەر لاوە دەگاتە گوێمان و من هەموو ڕێگە بیر لە

بنەماڵەکەم دەکەمەوە و پەشیمانم لەم "قورشیلانە"ی خۆمم تێ خستووە، بەڵام تازە بۆ گەڕانەوەش درەنگ بووە.

کتوپڕ دەگەینە خوار، دەبینم دەربەندێکە لە هەر لاوە ئاو بە خوڕی قەڵبەزەی بەستووە و دوای بڕینی ڕێگەیەکی دوور و پێچاوپێچ دەگاتە ناو جۆگەیەک. دەبوا ئەمە خۆی جۆرە بەهەشتێک بێت بەڵام ئێستە شوێنپێی مردن و بۆنی وێرانیی لێ دێت.

جێبێکی سووتاو لەژێر دارێکدا دەبینرێ و هێندێک پەڕۆ و پارچەی خوێناوییش لەو ناوە کەوتوون. دووکەڵی دوای سووتمانەکە هێشتا هەر ماوە. پێش دوو سات مێگێکی ۱۷ بە هەموو چەکە ۳۷ و ۲۲ میلیمەترە ئۆتۆماتەکانیەوە هێرشی کردە سەر ئەم شوێنە و یازدە پێشمەرگەی گەنج، کە لەژێر ئەم دارەدا خەریکی چاخواردنەوە بوون، پێش ئەوە فریاکەون خۆیان حەشار دەن بەرکەوتن و تێکڕا کوژران. تەنیا کەسێک کە لەم هێرشەدا نەکوژرا پێشمەرگەیەک بوو بە ناوی "فازڵ"، کە ئێستەش بە تەواوی نەهاتووەتەوە سەر خۆی و گێژ و وڕ لە لای جێبە سووتاوەکەدا ڕاوەستاوە. ئەم پێشمەرگەیە دەڵێ:

– ئەوان هەموو گەنجی ۱۷– ۱۸ ساڵان و تازە لە قوتابخانەوە هاتبوون و تێکەڵی شۆڕش بووبوون. چواریان لە دەستەکەی مندا بوون و ئەوەش جێبی منە سووتاوە. ئەوان ئەم شوێنەیان بۆ حەسانەوە لە پشتی بەرەی شەڕ هەڵبژاردبوو و پێیان وا بوو تەناهە. ئەم جێگەیە پڕە لە ئەشکەوت و شوێنی باش بۆ خۆشاردنەوە بەڵام ئەم جارە زۆر کتوپڕ بوو ئەوان بواری خۆشاردنەوەیان نەبوو.

گرمە و ئاگری تۆپخانە نێزیکتر دێتە بەرچاو و وا دیارە لە نێزیک ئێمە وە زەوی دەدەن. لە پڕ فازڵ هاوار لە هەڤاڵانی دەکات بڵاوە بکەن و ڕێگەی ئەشکەوت و حەشارگەیەک بە من نیشان دەدات و کاتێک دەبینێ من زۆر ترساوم دەڵێ:

– تۆ دەتوانی لەم شوێنەدا، بێ خەم دانیشی و ئێرە هیچ مەترسییەکی نییە.

تا ئێستە من هەستم پێ نەکردبوو بەڵام کاتێک لەسەرمخۆیی و ئارامییەکەیم بینی، تێ گەیشتم فازڵ یەکێکە لە فەرماندەکانی ئەم بەرەیە. بەڵام ئەم کوڕە گەنجە هیچ شتێکی لە میلیتەر و سەرباز ناچێ، چۆن بووەتە یەکێک لە قارەمانانی شەڕ، شتێکە دواتر دەیزانم. پاشان و دوای ئەم رووداوە بۆم باس دەکەن، کە ئەویش یەکێکە لەو قوتابییانەی، کە تێکەڵی شۆڕش بووە، ئەو خەڵکی کەرکووک و قوتابیی زانسگەی بەغدا بووە. بۆ خۆی دەڵێ:

– من لە بەغدا دۆستی سوێدیی زۆرم هەبوون، ئەوان لە هاوسێیەتیی مندا دەژیان و کاریان بۆ کۆمپانیایەکی سوێدی بە ناوی ئێریکسۆنەوە دەکرد. ئێل ئێم ئێریکسۆن؟ ئەرێ پێم وایە ناوەکەی شتێکی وا بوو. ئەگەر ئەوان دواتر شتەکانی تۆ بخوێننەوە بێگومان منیان وەبیر دێتەوە.

کاتێک سەرەتا فازڵ هاتە لای شۆڕش لە بەشی سیاسی و ئیداریدا کاریان بۆ دیاری کرد بەڵام ئەو ئامانجی ئەوە بوو بێتە بەرەی شەڕ و بەشداریی کاری پێشمەرگانە بێت. دوای ٣ مانگ گەیشتە پلەی فەرماندە و ئێستە بەرپرسی ٢٠ پێشمەرگەیە. ئەم دەستەیە خولێکی کورتی بەکارهێنانی چەکی دژی تانکیان بینیوە و پاشان نێردراون بۆ بەرەی شەڕ. کاربەدەستانی شۆڕش ئاگەدار کرابوون و دەزانرا دەوڵەت بە سەدان تانک و زرێپۆشی رووسییەوە پلانی هێرشێکی گەورەی بۆ سەر ناوچەکە هەیە، بۆیە ئەم بیست کوڕە گەنجە نێردران تا لە دژی ئەم هێرشەی دوژمن و تانکەکانیاندا شەڕ بکەن.

تۆپەکان زۆر لە نێزیکی ئێمەوە دادەکەون و هێندێک جار هێندە نێزیکن گرمەیان ناهێڵێ ئێمە پێکەوە قسە بکەین، بەڵام هەرکە دەرفەتێک دێتە

پێشـەوە، کوڕێکی گەنج، زۆر ئاسـایی و بە لەسـەرەخۆییـیەوە دێتـە ناو و چاییمان بۆ دێنێ.

لە کاتی بێدەنگیی تۆپەکاندا فازڵ دەگێڕێتەوە:

- دوو حـەفتـە پێش، ئێـمـە لەگـەڵ ٧٠ تانکی دەوڵەتدا ڕووبەڕووی یەکتـر بووینەوە. پاش پێنـج سات شـەڕ توانیـمان پێشی هێرشـەکەیان بگرین. دوو چەکی دژە تانکمـان هەبوو و توانیـمـان ١٢ تانکیـان لێ بسووتێنین. ئەو بە جۆرێک باسی ئەم شـەڕە دەکات دڵنیا نییە لەوەی من بڕوای پێ بکەم. ڕەنگە بڕواش نـەکـەم، ڕەنگە لەم شـوێنەی هێندێک جـار پریشکی گـوللە تۆپە تەقیوەکان بەسـەر سـەرماندا گیفـەیان دێ و خـاک و خۆڵی بەردەکانی بان سەرمان دەخـەنە خوارەوە، بوارێکی بۆ بیرکردنەوە لەو شتانە نەهێشتبێ تا من بیر لە راستی و نەڕاستیی قسەی فازڵ بکەمـەوە. فازڵ درێژەی دەدات و دەبێژێ:

- چوار کـەس لەو کـوڕانەی ئەوڕۆ کـوژران پێـشـتـر بریندار بـووبوون و ئەوڕۆش مـیگەکـە هات کـۆتای بە ژیانیـان هێنا. ئەمـان چوار کـەس لە باشترین هاوڕێیانی من بوون.

چ هەستێکت هەیە ئێستە بیر لە هەڤاڵەکانت دەکەیتەوە؟

- تەنیا شـتێک ئێسـتە من بیری لێ دەکەمەوە تۆڵەسـەندنی هـەڤاڵانمە. من دەبێت تۆڵەی ئەوان لە دوژمن بکەمەوە.

تاریکی بە هێواشـی دەگاتە ئێرە، سـەیری دوور دەکـەم و دەبینم زەردەپەڕ دوا لزگەکانی تیشکی خۆر دەگەیێنێتە سـەر لووتکەی کێوەکان و وردە وردە مالاوایی دەکات. فازڵ درێژە بە قسەکانی دەدات و دەڵێ:

- کارتێکی داوەتمان لە گیرفانی یەکێک لە کوژراوە عێراقییەکاندا دیتەوە، کە بانگهێشتنی جەژنێک بۆ ڕۆژی ٢٤ی ئەیلوول لە چۆمان کرابوو. بەڵام ئەو نەگەیشتە ئەوێ و هیچ کەسی تریشیان ناگەنە ئەو مەبەست و شوێنە.

دوای ئەوە هەوا بە تەواوی تاریک داهات دەنگی تۆپخـانەش رووی لە بێدەنگی نا و تەنیا جاروبار گرمەی گوللە تۆپێک لێرە و لەوێ دەبیسترێ، کە بەسەر دەربەندەکەی جێگەی دانیشتنی ئێمەدا تێپەڕ دەبێ. فازڵ دەڵێ:

– ئێستە دەتوانین بڕۆین و پێکەوە "مستەفا" ببینین.

"مستەفا نێروەیی "بەرپرسی لەشکرە. فەرماندەی هەموو ئەم بەرەی شەڕە، کە شوێنێکی ستراتیجییە و بە گەرووی عەمەر ئاغا لەناو خەڵکدا بەناوبانگە. ئێمە لە بنی شاخەکەداین و مستەفا بنکەی سەرەکیی خۆی لە بنی بەردێکدا ساز کردووە، کە تۆپ و بۆمبا نایگرێتەوە. ئێمە دەچینە ئەو شوێنە و لەسەر چەند بەتانییەک دادەنیشین و چاوەڕێی مستەفا دەکەین، کە لەسەر بەرزاییەکەوە بێتە خوار بۆ لامان. فازڵ من دڵنیا دەکاتەوە، کە ئەم شوێنە بە تەواوی تەناهە و جێگەی مەترسی نییە. تۆپخانە نایگرێتەوە و فڕۆکە مێگەکانیش ئەگەر بیانەوێ ئەم جێگەیە بۆمباران بکەن دەبێت خۆیان بەم بەردانەدا، کە هەر چواردەوری دۆڵەکەیان گرتووە بکێشن. فازڵ روو لە من دەڵێ:

– کێوەکان ئێمە دەپارێزن. ئەم کێوانە تاقە دۆستی ئێمەن.

من دانیشتووم و پاڵم بە دیوارە بەردینەکەوە داوە و بە تەواوی هەست بە ئارامی دەکەم. دوای بێدەنگبوونی تۆپخانەکە، شەو ئارام و بێدەنگە، جار جارێک پێشمەرگەیەک بێدەنگ دێت بە خۆی و چەکەکەیەوە بە پێشماندا تێ دەپەڕێ. کاتێک مستەفای سەرلەشکر دەگاتەوە لای ئێمە سات نێزیک هەشتە. من بۆ رێز لێنان لە بەری هەڵدەستمە سەرپێ، بەڵام ئەو ئیشارەم پێ دەکات، کە دانیشمەوە، بەخێرهاتنم دەکات و ئارام بەڵام ماندوو دیارە. بێدەنگ و لەناو دنیای بیرکردنەوەدا بە چۆکەوە لە بەرانبەرمدا دادەنیشێ. جگەرەیەک هەڵدەکات و دەستەکانی بە شێوەیەکی ژیرانە و بە حورمەتەوە لەگەڵ جگەرەکێشانەکەیدا دەجووڵێنێ، کە ئارامییەکی سەیر بە من دەدا.

من لەبەر رووناکاییی چرا لامپایەکی بێ هێزەوە هەست بە هەیبەت و سامێک لەودا دەکەم، جلوبەرگی هەروەک پێشمەرگەکانی تر و جامەدانییەکی سووری لەسەرە. کوڵەباڵێکی کوردیی لەبەرە، کە لە خوری ساز کراوە و بۆ خۆپاراستن لە گەرما و لە سەرماش بە کەڵک دێت. فیشەکدانێکی پان و پڕ لە فیشەکی لە پشتە، کلاشینکۆفێک و بێسیمێکی تاڵکی - واڵکی لە تەنشتیەوەیەتی.

لووتێکی زۆر گەورە، کونەلووتەکانی ئەستوور و لێوی خوارەوەی هێندێک کۆڵترە. تێکرای ئەو تایبەتمەندییانە دیمەنێکی وایان بە دەموچاوی داوە، کە کەسێکی شێلگیر، خاوەن بڕیار و لە شکان نەهاتوو بێتە بەرچاو. هەموو ئەو تایبەتمەندییانەی لە ئەسعەد فەرماندەکەی بەرەی بادیناندا بینیمن، بە زیادیشەوە لە مستەفادا بەدی دەکرێن.

کاتی قسە نییە، تەنیا بواری بیرکردنەوە هەیە، من تەنیا هەست بە بوونی ئەو لە لای خۆمدا دەکەم و ئەو هەست پێکردنەش رێز و خۆشەویستییەکی زۆری لا دروست کردووم. دوای نیو سات راوەستان و بێدەنگی لە رێگەی وەرگێڕەکەمەوە لێی دەپرسم، داخوا مستەفا ئامادەیە بەرسڤی پرسەکانم بداتەوە؟

- ئێستە نا. من ئێستە زۆر ماندوو و ناڕەحەتم. ئەگەر من وا زوو وەڵامت بدەمەوە ناڕەحەتی و ماندوویيم ئاشکرا دەبێت و ناتوانم ئەو قسانە بکەم، کە دڵم دەیخوازێ. دواتر. دەتوانین تۆزێک دواتر قسە بکەین.

خواردنی ئێوارە سازە و وەک هەر جارێک خواردنەکە برنج و جۆرە شلەیەکە، لەناو قاپێکدا هێندێک گۆشتاویش دانراوە و مستەفا باشترین پلە گۆشتەکان بۆ من دادەنێ. هێشووە ترێیەکیشم لە بەردەستدا دادەنێ و بێدەنگ و لەسەرخۆ تێکڕامان خەریکی خواردن دەبین. لەم ماوەیەدا فێر بووم نانخواردنێک لە کوردستان بە مانای جەژن و یادکردنەوە نییە بەڵام

تەنیا خۆتێرکردنێکیش نایەتە حیسێبکردن، بگرە ئەم ساتەوەختە ڕێگەیەکە بۆ لێک نزیکبوونەوە، قسەکردن و بوونە دۆست لەگەڵ یەک و جاری واشە ئەم دۆستایەتییە بۆ هەموو ماوەی ژیانە. من ئەمەم چەند جاران لە بادیناندا بینیوە و لێرەش لەناو ئاگری بەرەی شەڕی باڵەکدا زیاتر لە گشت لایەک بە چاوی خۆم دەیبینم.

دوای ئەوە چا خوراوەیەوە مستەفا هاتووەتەوە سەرخۆ. من نازانم لە خەڵوەتیی خۆیدا بە چی بڕیارگەلێک گەیشتووە، بەڵام دەبینم بە پێکەنین و بزەیەکەوە دەڵێ:

– ئێستە دەتوانین پێکەوە قسە بکەین. من ئێستە دەتوانم وەڵامی پرسیارەکانت بدەمەوە.

داوای لێ دەکەم باسێکی وردی بەرەی شەڕم بۆ بکات و ئەویش دەست پێ دەکات:

– ئەوان ڕەواندزیان داگیر کردبوو، ئێمە نەمانتوانی پێشی هێرشی تانکەکانیان لەو دۆڵەدا بگرین. بەڵام هەموو خەڵکەکە ناوچەیان بەجێ هێشت و هاتن بۆ لای ئێمە. ئەوان تەنیا وڵاتی چۆڵی بێ خەڵکیان داگیر کرد. خاکی بێ خەڵک هیچ بایەخێکی نییە. ئێمە دەمانزانی ئەوان خۆیان بۆ هێرش و پەلاماری ناوچەکە ئامادە دەکەن. ڕۆژی ٩ی ئەم مانگە یەکەم هێرشیان دەستی پێ کرد. هێرشەکەیان بە نزیک لە سەد تانک و ژمارەیەکی زۆر فڕۆکەوە دەست پێ کرد. ئامانجیان ئەوە بوو ئەم شاخە داگیر بکەن. پێشمەرگەی ئێمە ئامادە بوون و هێرشەکەیان بە چەکی تانکشکێن پووچەڵ کردەوە. ئێمە ١٤ تانک و ژمارەیەکی زۆر مەکینەی تری دوژمنمان تێک شکاند. بەڵام شەڕێکی زۆر گران و دژوار بوو. شەوی دواتر هێرشی دووەمیان دەست پێ کرد. بۆ ئەم مەبەستە گشت هێزی زەمینی، تۆپخانە و چەکی تریان خستە کار بەڵام ئەم هێرشەشمان پەک خست. لەم هێرشەدا

ئەوان زیاتر لە ۲۰۰ کەسیان لێ کوژرا و زۆر تانکیان لێ تێک شکێنرا. دەستکەوتی ئێمە ۳٦ چەک، ۲۰ دەزگای بێتەل و ۲۰ هێستر بوو. ئەوەتا من یەکێک لە بێتەلەکانی دەستکەوتی ئەو شەڕەم پێیە.

بێتەلەکە پێشانی من دەدات، سازکراوی رووسیایە و بڵندگۆ و ئانتێنێکی درێژی هەیە، کە دەچەمێتەوە. مستەفا درێژەی دەدات:

- بەڵام ئەوان وازیان نەهێنا و پێش دوو رۆژ دیسان هێرشی سێیەمیان دەست پێ کردەوە و ئەمەش گرانترین پەلامار بوو. ئەم هێرشەیان بەیانی زوو دەستی پێ کرد و شەڕ بۆ ماوەی ۱۲ ساتان درێژەی کێشا. ئەوان هەر وا هێزیان هەڵدەڕژاندە مەیدانی شەڕ بەڵام پێشمەرگەی ئێمە ئازایانە راوەستان و شێرانە بەرخۆدانیان کرد. ئێمە زیاتر لە ۳۰۰ سەربازی دەوڵەتمان کوشت، بەشێکی زۆریان لە مەیدانی شەڕدا بەجێ مان و ئێستەش لەوێن. راستی بینینی ئەو تەرمانە دیمەنێکی زۆر ترسێنەرە. ئێمە ۱٤ چەکی گەورە ٤ نارنجۆک هاوێژ، ۳ تۆپی سووک و کەلێک تەقەمەنیمان کەوتە دەست. ۳ کەسیشمان بە دیل گرتن و یەکێکیان ئەیوت فەرماندەی ئەم بەرەیەی شەڕیش کوژراوە.

ئەم پێشمەرگە کۆنەکارە لەمێژە خەریکی خەبات و تێکۆشانە. ئەو هەر لە سەرەتاوە کە کورد لە عێراق دەستیان بە سەرهەڵدان بۆ بە دەستهێنانی مافەکانیان کرد تا ئێستە لەگەڵدا بووە. بەڵام بە قسەی خۆی ئەم شەڕەی دوایی دژوارترین شەڕ بووە ئەو تێیدا بەشدار بووبێ. ۱۳ سات شەڕی بێ پسانەوە لەگەڵ دوژمنێکی چەندین قات بەهێزتر لە باری ژمارە و چەکوچۆڵیشەوە. دوژمن هێرشی سات نۆی شەو دەست پێ کرد و تا سات دەی شەوی رۆژی دوایی شەڕ درێژەی کێشا. من لێی دەپرسم، کە ئاخۆ ئەو چاوەڕوانە دوژمن پەلاماری تری لە بەرنامەدا بێت؟

- ئەگەر ئەوان هێندێک هەستی مرۆڤانەیان هەبوایە نەدەبوو هێرشی تر

بکەنەوە - ئاخر ئەوان زیاتر لە ٥٠٠ کەسیان لێ کوژراوە - بەڵام ئەوان گوێ بەم شتانە نادەن و بێگومان لە ماوەی چەند ڕۆژی تردا هێرشی تر دەکەنەوە. ئەوان هیچ ڕێز و بایەخێک بۆ گیانی سەربازی خۆیان دانانێن و ئێمەش ئامادەی بەرپەرچدانەوەی هێرشی ئەوانین و ناچارین بیانکوژین.

مستەفا بێتەلە تاڵکی - واڵکییەکەی هەڵدەگرێ، هێندێک پەیام دەنێرێ و هەواڵی شوێن و پۆستە جیا جیاکان وەردەگرێ. لەتیف، وەرگێڕەکەم کاتێک گوێی لە قسەکانی مستەفایە دەڵێ:

- بە ڕاستی زۆر جوانە، ئێمە لە زمانی خۆماندا لە کوردستان گەلێک ڕستە و وشەی تایبەتیمان هەیە، کە کاتی پێکەوە ئاخافتن وەک نیشانەی پایە و ڕێز لێنان بەکاریان دەبەین، من دەبینم ئەمانیش لێرە، لەم شوێنە حاستەمەشدا بەو شێوەیە بە حورمەتەوە قسە لەگەڵ یەکتریدا دەکەن. مستەفا لە کاتێکدا بێتەلەکەی لەولاوە داناوە، ڕوو لە من دەڵێ:

- من دەمەوێ، کە تۆ بە خەڵکی سوێد بڵێی ئێمە پێویستمان بە هاوکاری و یارمەتیی ئەوانە. ئێمە خەڵکێکی ئاشتیخوازین، ئێمە تەنیا پارێزگاری لە خاک و خەڵکی خۆمان دەکەین. ئێمە لەم ڕێگەیەشدا سەردەکەوین، من لەمەدا دڵنیام چونکە ئێمە حەقخوازین. ئەوانن (عێراقییەکان)، گەرەکیانە ئێمە بە کۆیلە بکەن.

من بە درێژی لەبارەی کوردستان و دنیاوە لەگەڵ مستەفادا قسە دەکەم و ئەویش گەلێک جار ئەو پرسیارە دووپات دەکاتەوە، کە بۆچی دنیا گوێ نادات دۆخ و چارەنووسی کورد؟ بۆچی نەتەوە یەککگرتووەکان دەست وەرنادات کێشەکە؟ بۆچی ئێمە لە دنیا دابڕاوین؟ بۆچی... و... پرسیارگەلێک، کە منیش هیچ کات ناتوانم وەڵامێکی دەردخواردوویان پێ بدەمەوە.

کە سات خۆی لە دە نزیک دەکاتەوە مستەفا بە بێتەلەکەی چەند پەیامێکی تر ئاڵوگۆڕ دەکات، ڕادەسپێرێ، کە بەتانییەکی تر بدەنە من، دەڵێ من بێ

ترس و خەم دەتوانم لەم تاقجانە بەردینەدا بخەوم و بۆ خۆی مالاوایی دەكات و لەناو تاریكیی شەوەزەنگدا ون دەبێت.

شەوێكی پڕ لە سەفا و هەوایەكی لەبارە، مانگەشەو نییە بەلام بریسكەی ئەستێرە وا دەكات هیچ كات بە تەواوی تاریک دانایە. پێشمەرگەی كێشک، بەبێدەنگی لە هاتوچۆدان و من لە نێوان خەو و وەنەوزدا بیر لە شتێک دەكەمەوە، شتێكی سەیر: لەژێر ئاسمانی شیندا خەوتن، ئەویش لە ولاتێكدا بوونی نییە، لە تاق و دڕنالی بەردی شوێنێكدا، كە تازە مەیدانی شەڕێكی بێ رەحمانە بووە و مەودای نێوان مردن و ژیان تەنیا هەناسەیەكە، هەردەم دەتوانێ جەهەندەمێک دروست ببێ و بە منیش دەوترێ، كە بێ ترس و دڵەخورپە بخەوم.

من خەوم لێ كەوت و خەوێكی خۆشیشم كرد، هیچ خەونێكم نەبینی و تەنیا جارێكیش لە ماوەی شەودا وەخەبەر هاتم ئەویش بە هۆی گرمەی چەند تەقینەوەیەكی دوور بوو. دەزانم ئەم دەنگانە هی تۆپخانەی عێراقن، كە پشتی بەرەی شەڕ بە تۆپی دوورهاوێژ دەكوتن، بەلام تۆپخانەی كوردی گوێ ناداتێ و وەلام ناداتەوە.

بەیانییەكی ئارام و بێدەنگە. مستەفای فەرماندەی لەشكر هێندە دوور لە من نەخەوتووە، تۆزێک لەولاترەوە لە بن دڕنالی بەردێكی تردا. هەستاوەتە سەرپێ و خەریكی رێكوپێككردنی خۆیەتی، سەرەتا جامەدانییەكەی لەسەر دەنێ، شالە درێژەكەی، كە هەموو پێشمەرگەیەک دەبێت هەیبێت دەبەستێتە پشتی، رەخت و فیشەكدان دەبەستێ و كلاشینكۆفەكەی دەكاتە شانی. من و ئەو پێكەوە نانی بەیانی دەخۆین، جگەری برژاو، تەماتە، ترێ و دیارە چاش وەک هەر جارێكی تر ئامادە كراوە. من لە مستەفا دەپرسم، كە داخوا شتێكی تایبەت لە ماوەی شەودا رووی داوە؟

- نا. شەو هەموو ئارام تێ پەڕیوە.

پێشمەرگەیەک دێتە پێش و نامەیەک دەداتە دەست مستەفا، فەرماندە سەیرێکی نامەکە دەکات و دواتر دەیداتە دەست بەردەستێک تا بۆی بخوێنێتەوە. ئێستە ئیدی بۆ من دەردەکەوێ، کە فەرماندەی گشتیی کورد بۆ گرینگترین بەرەی شەڕ ناتوانێ بنووسێ یان بخوێنێتەوە. من پێشتر بە هیچ شێوەیەک هەستم بەمە نەکردبوو و ئێستە بۆم روون دەبێتەوە تێگەیشتن و خوێندەواری بۆ ئەرکی لەم جۆرە گرینگ، کە لای من هەردەم وەک پێویستییەکی ناچاری و حاشاهەڵنەگر بوو، چەندە بێ مانایە.

فازڵ ئەو گەنجە قوتابییەی، کە بەرپرسی گرووپی دژە تانکە لە دوورەوە دەگاتە جێ، هێندێک قسە لەگەڵ مستەفا، کە جاروبار خەریکی تاڵکی - واڵکییەکەیەتی، دەکات. بۆم دەردەکەوێ ئەم پیرە شەڕوانە کۆنەکارە نەخوێندەوارە و ئەو گەنجە قوتابییە کەم ئەزموونە هەریەکە لەبەر خۆیەوە رێزێکی تایبەت بۆ بەرانبەرەکەیان دادەنێن و ناگەدارییی یەک دەکەن. فازڵ روو لە من دەڵێ:

- ئێمە کێشەیەکمان هەیە. ئێمە دەبێت جێیێکی تر لە بری ئەو جێیەی دوێنێ سووتا بۆ گرووپەکەمان پەیدا بکەین، چونکە هەر ساتێک ئیمکانی هێرشی تانک بۆ سەر ئێمە لە گۆڕێدایە و ئێمەش پێویستە ئامادە بین.

من لەگەڵ فازڵدا دەڕۆمە خوار بۆ دەربەندەکە بۆ شوێنی حەسانەوەی وی، بەڵام پێش ئەوە بگەینە جێ، دەنگی فڕۆکە دێتە گوێمان و ئێمە ناچار دەبین، کە دوایین بەشی رێگەکەمان هەڵێین تا خۆمان بگەیێنینە پەناگە و لەژێری بەردەکاندا خۆمان بشارینەوە. مێگێک دەردەکەوێ و من دیسان تووشی ترس دەبمەوە و دەزانم، کە ئەوەی لەو سەرەوە لەناو فڕۆکەکەدا دانیشتووە لە دوای جووڵە و گیاندارێک دەگەڕێ تا بیکاتە نیشانە و هەردەم دەتوانێ وەک هەڵۆیەک راوی مشک بکات، سەرەوژێر بێتەوە و ئەم ناوە بە بۆمبا و شەستیر دابێژێ. بەڵام دوای تاوێک فڕۆکە ون بوو و رووی لە لای باکور کرد.

من داوا له فازڵ دەکەم به وردی باسی شەڕی خۆیان لەگەڵ تانکەکاندا بۆ من بکات و ئەمەش چیرۆکەکەی ئەوە:

– ئێمە پێنج جێبی دژە تانکمان هەبوون. هەر پێنجیان بە ڕۆکێتی دژە تانک تەیار کرابوون. ئەم جێب و ڕۆکێتانە ئەمەریکایی و گەلێک کاریگەرن. من نازانم شۆڕش چۆن و لە کام ڕێگەوە ئەم شتانەی دەست کەوتووە. بەڵام ئێمە مەشقی ئەوەمان کردبوو، کە چۆن ئەم چەکانە بە باشی بەکار بێنین، هەر جێبە و چوار کەسی لەسەرە یەکێکیان لە پشت فەرمانی جێبەکەیە، فەرماندەی گرووپ لە پێشەوە و لە تەنیشت شۆفێر دادەنیشێ. یەکێک لە کوڕەکان لە پشتی راکێتەکەوە خەریکی نیشانەگری و کەسی چوارەم ڕۆکتهاوێژەکە پڕ دەکاتەوە. ئێمە دەتوانین بە هەر چواردەوری خۆمان و لە مەودای یەک کیلۆمەتر و نیودا تەقە لە دوژمن بکەین. ئێستە دوو دانە لەو جێبانەمان وەک "ڕێزێرڤ" لە پشتی بەرەوە هەڵگرتبوون و ٣ دانەمان هێنابوونە پێش. هەستمان پێ کردبوو ئەوان بەیانی زوو هێرش دەکەن بۆیە ئێمە جێبەکانمان هێنابوون لە نزیک تەپۆڵکەیەکەوە، کە نزیکی مەبەستەکەمان بوو و دامان نابوون تا ئەو دەمەی تانکەکان لەوێوە دەرکەون لەژێر گەڵا و هەژگادا حەشارمان دابوون.

ڕاست سات پێنجی بەیانی، کاتێک خەریک بوو هەوا ڕووناک بێت بینیمان تانکەکان کەوتنە جووڵە. ژمارەی تانکەکان یەک ئارمادای (ئارماردا بۆ دەستەیەک تانک کە پێکەوە و هاوکات بەشداریی ئۆپەراسیۆنێک دەبن بەکار دێ – وەرگێڕ) تەواو بوو. ئێمە ئەوانمان لە دوورەوە دەبینی و دەشمانزانی هەموو شتێک بە کار و ڕۆڵی ئێمەوە گرێ دراوە، چونکە جگە لە ئێمە کەسی تر لەم بەرەی شەڕەدا چەکی دژە تانکی پێ نییە. نەدەبووا پێش ئەوەی دڵنیا بین، کە لە ئامانج دەدەین، دەست بکەینەوە. ڕاوەستاین تا گەیشتنە کەمتر لە نیو کیلۆمەتر و ئەوجا یەکەم ڕۆکێتمان هاویشتن و هەردووک گوللە لە ئارمانجیان دا. بە چاوی خۆمان بینیمان چۆن ڕاکێتەکانمان لەناو

تانکەکاندا تەقینەوە. گوللەی سێیەمیش هەروەتر، لە خاڵی خۆی دا.

دوای ئەمە ئیدی مایەوە ئێمە و ئەوان. پاش ئەم هەڵمەتەی ئێمە ئەوان راوەستان و نەیاندەوێرا کەمتر لە ٨٠٠ مەتر نێزیک ببنەوە. دیارە بۆ ئێمە هاسانتر بوو لە ئامانج بدەین کاتێک ئەوان بێ جووڵە راوەستابوون، بەڵام بۆ ئەوانیش هاسان بوو ئێمە بپێکن. ئەوان بە تۆپ و دەستڕێژ ئێمەیان داگرت بەڵام نەیانتەنگاوتین. ئێمە هەردەم و بێ پسانەوە شوێنی خۆمان دەگۆڕی و بە دەوری گردەکەدا دەسووڕاینەوە. بە تەواوی نازانم ئێمە چەند دانە تانکی ئەوانمان تێک شکاند، بەڵام پێم وایە ژمارەیان لانی کەم دەگەیشتە ١٣ دانە.

ئێمە لە جیپەکەی مندا تا گوللەمان هەبوو هاویشتمان و ئەو جێبەکەی تر لوولەکەی تووشی کێشە بوو، بۆیە ناچار بووین شوێنەکەمان چۆڵ بکەین. دیارە ئێمە پێشی بەرەوپێش هاتنی تانکەکانمان گرتبوو و ئەوان نەیانتوانی درێژە بە هاتنەپێش بدەن. یەکێکی تر لە جێبەکانمان هێنایە پێش، ژمارەیەکی زۆرتر رۆکێتمان هێنان بەڵام زەحمەت بوو بگەینەوە شوێنەکەی پێشوو و ناچار لەسەر رێگەکەوە تەقەمان دەکرد، کە جێگەیەکی خراپ و نالەبار بوو. بەو حاڵەش ئێمە لەم شوێنە تازەیەدا تانکێکی ترمان تێک شکاند و ویستمان هێندێک بچینە پێش بۆ جێگەیەکی باشتر لە پڕ جێبەکەی من بەرکەوت، شۆفێرەکەمان هەر لەوێ گیانی لەدەست دا و دووانەکەی تریش بە سەختی بریندار بوون. من بە ساغی دەرچووم، هەروەک چۆن لە هێرشەکەی دوێنێدا، وا دیارە جارێ نۆرەی مردنی من نەهاتووە. جێبەکەمان گواستەوە بۆ شوێنێکی تر، کە سێبەر بوو، لە ئاسمانەوە نەدەبینرا.

کاتێک فازڵ ئەم رووداوە بۆ من دەگێڕێتەوە دەگەمە ئەو بڕوایە ئەمە دەبێت یەکێک لە سەرنج ڕاکێشترین رووداوەکانی شەڕ بێت، کە راست رۆژی ٩ ئەیلوولی ١٩٧٤ رووی دا. ئەو دەم رۆژنامەوان یان وێنەهەڵگرێک لەو ناوەدا

نەبوو تا ئەم دیمەن و سینانە تۆمـار بکات، بەڵام زۆریش دژوار نییـە مرۆڤ بیهێنێتە پێش چاوی خۆی:

لەسەر شاخ و لەبن بەردەکانەوە چەند هەزار پێشمەرگەی شەڕوان ئامادە لە سـەنگەردا راوەسـتـاون، بەڵام کـاروانێک تانک و زرێپـۆشی سـازکـراوی رووسیی سەر بە دوژمن لە دەشتـایی و لای خوارەوە لە جموجـۆڵدان. چەکی پێـشـمـەرگـە لـە بەرانبـەر ئەم تانکانەدا بێ کـاریگەر و تەواوی پاراستن و بەرخۆدان کەوتووەتە سەر شانی ٨ کوڕی گەنجی کەم تەمەن، کە چەند مانگ پێشتر لە پشت مێزی زانستگەوە هاتوون.

ئەم شـەڕە، کە گەورەترین پەلاماری تا ئێستـەی دەوڵەت بوو یەکەم شـەڕی ئەم ٨ گەنجـە قوتابییەش بوو، کە راستـەوخۆ لەگەڵ دوژمندا بیکەن. لە پێش چاوی ئەو چەند هەزار پێشمەرگەوە، کە لە بەرزاییەکانەوە دامەزرابوون ئەم ٨ گەنجە چوونە شەڕی سوپای پڕچەکی دوژمن، زیانی گەورەیان پێ گەیاند و گەورەترین هێرشـی ئەوانیشـیـان تێک شکاند. روو لە فـازڵ دەکەم و دەڵێم بەڕاستی دژوارە بڕواکردنی.

– تێ دەگەم، منیش بۆ خۆم گەلێک جار بیرم لێ کردووەتەوە و هـێشـتاش دژوارە بڕوا بکەم. بڕواکردنی ئەم رووداوە بۆ منیش راست وەک تۆ سەختە. نامـومـکینە مرۆڤ لەمـە تێ بگات، ئەگـەر من بڕوای ئاینیم هەبوایە دەمگوت خوا بوو یارمەتیی داین، بەڵام من بڕوام بەو شتانە نییە.

ئێوە دەبێت زۆر ترسابن؟

– نا، هـەمـوو ئەو کـوڕانە زۆر بوێر و ئازا بوون، کـەسـمـان سـەری لێ نەشێوا، ئاخر تۆ دەبێت بزانی، کە ئێمە تێکڕا ئامادە بووین لەم رێگەیەدا بمرین، ئێمە ترسێکمان لە مردن نییە، ئەگەر ئێمە لەم شـەڕەدا تێ بشکێین شتێکمان بۆ درێژەدانی ژیان نامێنێ.

فازڵ کوڕێکم پێ دەناسێنێ، کە تازە گەیشتە لامان و لە پەناماندا دانیشت.

- ئەمە مەلا عەلی کەریمە، باشترین دۆستی من. ئەو لەم شەڕەدا سێ تانکی دوژمنی تێک شکاند، ئەو تەنیا ٢٤ ساڵی تەمەنە بەڵام لە ساڵی ١٩٦٥ەوە لەگەڵ شۆڕشە. فازڵ داوا لە عەلی دەکات هەموو کوڕەکانی گرووپی دژە تانک کۆ کاتەوە تا من وێنەیەکی تێکڕایان لەگەڵدا بگرم.
دەچینە دەر بۆ لای یەکێک لە جیبەکان، کە لە سێبەرێکدا رایان گرتووە و بە هەژگ و گەڵای دار دایان پۆشیوە. بەشی فرەی ئەو کوڕانە دێن بۆ لامان و هێندێکیان دەست دەکەن بە پیشاندانی رۆکێتەکان و نیشانی من دەدەن چۆن کار دەکەن. بەڵام ئێمە وێرا ناکەین وێنەکەمان بگرین دەنگی فڕۆکە دێت و ناچار دەست دەکەن بە داپۆشینەوەی جیبەکە. فڕۆکە مێگێکە لەو بەرزاییەوە خەریکی چاودێری و ناسینەوەی ئامانجە بۆ فڕۆکەکانی تر. دوای ماوەیەک فڕۆکە لە ئاسمان ون بوو و من لە فازڵ دەپرسم بڵێی جیبەکەی نەبینیبێ؟ ئاخر زۆر نزیکی رێگەکەیە و دەکرێ هاسان ببینرێ؟
- نا، بڕوا ناکەم چونکە ئەگەر دیتبای بێ شک هێرشی دەکردینە سەر. جیبەکە لە سێبەردایە و لەبەر چڕیی سێبەرەکان دژوارە لە ئاسمانەوە ببینرێ.
من لەگەڵ فازڵدا دەڕۆم تا شوێنی ئەم شەڕەم پیشان بدات و پێکەوە ئەو شوێنە، کە فازڵ و هاوڕێیانی پێشی هێرش تانکەکانیان گرت ببینین. ئێستە تانکەکان هەر لەو شوێنەی پێشیان پێ گیرا لەسەر گردۆڵەکاندا دامەزراون و خەریکی سەنگەر لێدانن. تا ئەو جێگەیە چەند کیلۆمەتر رێگەیە و دەکرا بە جیب بڕۆین، بەڵام من ترسی ئەوەم هەیە فڕۆکە بمانبینن و بە پێ رۆیشتنم لا باشترە و فازڵیش لەم بارەیەوە لێم تێ دەگات.
بە درێژاییی ئەم رێگەیەی ئێمەی پێدا دەڕۆین لوولە تۆپی شاراوە لەبن گەڵا و گژوگیادا دەبینین، کە لە لای هەر کامیان چەند کوڕێکی گەنج دامەزراون و ئامادەی ئەنجامدانی دەستوورن. لە خوارتر، لە نزیکی گەرووی دەربەندەکەوە رێگەکە مینڕێژ کراوە و ئێمە ناچارین بە تەنیشتیدا دابەزینە خوار و دەرباز بین.

لە ڕێگە کەسێک بە ناوی مام "بێجان" بەرپرسی یەکێک لە بەتالیۆنەکان دەبێتە هاوڕێمان. بە وتەی فازڵ مام بێجان لە سەفەری رووسیا لەگەڵ مستەفا بارزانیدا بووە. هەرکە بێجان تێ دەگات من سوێدیم زوو شەڕەکەی "پۆلتاڤا"ی کارلی دوازدەمی پادشای ئەو سەردەمی سوێدیی وەبیر دێتەوە و دەڵێ:

– بەڵام ئێوە ئەو شەڕەتان دۆڕاند وا نییە؟

مام بێجان تەمەنی ٦٠ ساڵانە و هێندێکیش دەشەلێ، بۆیە لە کاتی ڕۆیشتندا گۆچان بەکار دێنێ، بەڵام بەو حاڵەش گورج و گۆڵ دێتە بەرچاو. بە گوێ جۆگەیەکی ناو دۆڵەکەدا درێژە بە ڕێگە دەدەین، لە لای هەندێک سندووقی خاڵی جێگەی چەکوچۆڵ، کە لەو ناوەدا فڕێ دراون بۆ پشوودەرکردن رادەوەستین و من هەلێکم دەست دەکەوت تا لەبارەی ئەو دەمەی بێجان لە رووسیا ژیاوە پرسیاری لێ بکەم.

بێجان دوای ئەوەی کۆماری مەهاباد لە ئێران رووخا یەکێک بوو لەوانەی لەگەڵ بارزانیدا پەنایان بردە بەر سۆڤیەت و بۆ ماوەی ١٢ ساڵ لەوێ مایەوە. بۆ ماوەی دوو ساڵان لە خزمەتی سوپای رووسیادا بوو و دواتر کاری بۆ پارتی دیموکراتی کوردستان کرد، کە لەو سەروبەندەدا دامەزرا و شکڵی گرت. لە شاری تاشکەند چووە قوتابخانەیەکی حزبی کۆمۆنیست. بارزانی لە قوتابخانەی بەرزی سوپادا دەیخوێند و لەوێ هەموو شتێک لەبارەی مارکس، لینین، هێگل و رێبەرانی تری کۆمۆنیستییەوە فێر بوو. بێجان لەم بارەوە دەڵێ:

– بەڵام ئەمە بەو مانایە نییە بارزانی بووبێ بە کۆمۆنیست. ئێمە کۆمۆنیست نین، ئێمە دیموکراتین.

ئەو گرووپەی چوونە رووسیا نزیکی ٥٠٠ کەسێک بوون و ٢٠٠ کەسێکیان لەگەڵ ژنی رووسی ژیانی هاوبەشیان پێک هێنا. دیارە ئەوانەی ژنیان دێنا

بۆیان نەبوو لە ناوچە کوردییەکانی سۆڤیەتدا بژین بگرە دەبووا بار بکەن بۆ تاشکەند. بێجانیش یەکێک بوو لەوانەی ژنی رووسیی هێنا.

بێجان ١٩٥٩دا گەڕایەوە بەغدا و لەوێ زمانی رووسیی فێری سوپای عێراق دەکرد. بەڵام ساڵی ١٩٦١ دیسان تێکەڵی شۆڕش بووەوە و هاوکاریی خۆی لەگەڵ بارزانیدا سەرلەنوێ دەست پێ کردەوە. ژنەکەی و دوو کچەکەی لە بەغدادا مانەوە بەڵام ١٩٦٣ بێ ئەوەی ئەو ئاگەدار بێت دەرکرانەوە و نێردرانەوە بۆ سۆڤیەت. ئێستە بێجان ژنێکی تری کوردی هێناوە و سێ کچ و کوڕێکی لەم ژنە تازەیەدا هەیە. مام بێجان روو لە من دەڵێ:

- هەروەک چۆن "روبێسپێر" و "ماوتسی تۆنگ" لە خزمەتی خەڵکی فرەنسا و چیندا بوون بارزانییش ئاوا لە خزمەتی کورداندایە. ئەو رێبەری مەزنی ئەم شۆڕشەیە.

مام بێجان وەک شارەزا پێشمان دەکەوێ و بە کوڵمز و سەرەتاتکێ دەورێکی کێوەکە دەدەینەوە. رێگە سەخت و ناهەموارە، تۆزێک لەولاترەوە وەک ئاسەواری شەڕەکانی پێشوو لۆرییەکی سووتاو لەو ناوەدا دەبینرێ. بسکەبسک لە پەنای بنچک و دەوەنەکاندا خۆمان دەگەیێنینە جێگەیەک، کە تانکەکانی عێراقمان لێیەوە دیار بن. تانکەکان بە لق و پۆپی دارەکان داپۆشراون بەو حاڵەش بە روونی دەبینرێ ئەوانە زرێپۆش و دەبابەن. لەو بەرزاییەوە، کە تانکەکانی لێ دامەزراون دەتوانن بەشێکی رێگەکە ببینن، بۆدیی سووتاوی لۆرییەکە نموونەیەتی. فازڵ و هەڤاڵانی توانییان سەرەتا لە هێرشی ئەوان تا نزیک رێگەکە بەرگری بکەن بەڵام دواتر هێرشی تانکەکان بەردەوام بوو تا گەیشتنە ئامانجی خۆیان و توانییان بەسەر بەشێکی ئەم رێگەیەدا زاڵ بن و پێشی هاتوچۆی ترافیک بگرن. جا لەبەرئەوەیە ئێستە هەر جۆرە هاتوچۆیەک بەرەو رۆژاوا ناچار دەبێت لەو رێگە دوورەوە بڕوات، کە من دوێنێ پێیدا هاتم. مام بێجان روو لە من دەکات و دەڵێ:

- ئەوان ئێمەیان نەدیتوە، چونکە ئەگەر ئێمەیان ببینیایە، بێگومان ئێستە ئەم ناوەیان دابووە بەر تەقە.

فازڵ دەڵێ:

- مام بێجان نیشانەشکێنێکی سەیرە، لەم ڕۆژانەدا لە مەودای ۳۰۰ مەتردا بە ۳ گوللە سێ عێراقیی خستن.

لە گەڕانەوەدا سواری یەکێک لە جیبی دژی تانکەکان دەبین و سەرەتا پەلەوەرێکیش بە ئاسمانەوە نابینرێ، بەڵام دوای ئەوە ئێمە لە پشت هێندێک بەردەوە دادەنیشین و خەریکی قسانین، فڕۆکە مێگەکە دیسان دەگەڕێتەوە و دوو نرکەی گەورەی لێ بەرز دەبێتەوە. فازڵ دەڵێ:

- ئێستە دەگەڕێتەوە، فڕۆکەکان نەریتییانە وا بکەن، جارێک دێن ناسیاری دەکەن، ئەم جار لێی دڵنیا دەبن و ئەگەرنا بۆمبەکانیان بەسەر بەرەی شەڕەکەدا هەڵدەڕێژن.

بەڵام فڕۆکەکە بۆ جاری سێیەم نەگەڕایەوە و ئێمە تەنیا گرمەی ئەو تۆپانە دەبیسین، کە بەسەر سەرماندا تێ دەپەڕن و ویزەیەکی سەیر و ناخۆشیان لێ دەبیسترێ.

محەمەد شەوقی، کە بەرپرسی بەشی دژە تانکی هەموو ئەم بەرەیەی شەڕە، کتێبێکی ئینگلیزی، کە باسی فڕۆکە دەکات دەردێنێ و جۆری ئەو فڕۆکانە پێشانی من دەدات، کە دەوڵەتی عێراق دژی کورد بەکاریان دێنێ و بریتین لە تۆپۆلۆفی ۲۲، فڕۆکەیەک، کە مەودایەکی زۆر دەفڕێ و کاری ناسینەوەیە. سوخۆی ۱۱ کە یەک کەس هەڵدەگرێ و بۆ هێرش بەکار دێ. سوخۆی ۷ ئێس - یو - ئێم، کە بۆ هێرشە. فڕۆکەی مێگی ۱۷ و ۱۹ و ۲۱، کە هەموو بۆ هێرش بەکار دێن و هەلیکۆپتەرێکی گەورە، کە هەر لە سەرەتای شەڕەوە هەیانبووە و ئێمە تا ئێستە دووانمان لێ خستووە.

شەوقی ۲۷ساڵ و ئەفسەری سوپای عێراق بووە. کاتێک لە سوپای

عێراق وەرگیراوە ٢٢ ساڵی بووە و بە وتەی خۆی نیازی بەشداریکردنیشی لە سوپای عێراق ئەوە بووە تا ببێتە خاوەن توانست و زانیاریی سەربازی بۆ ئەوە لە خەباتی رزگاریخوازانەی کوردستاندا بەکاری بێنێ. کاتێک لە مانگی ئاداردا شەڕ دەستی پێ کردەوە، شەوقیش وەک گەلێکی تر، خۆی گەیاندە شۆڕش و بوو بە پێشمەرگە.

ئەو لە هێرشی تشرینی یەکەمی ١٩٧٣ی عەرەبدا دژی ئیسرائیل بەشداریی کردووە، بەڵام بە قسەی خۆی بڕوایەکی وای بە ئەفسەرانی پلە بەرز نەبووە، کە چۆن ئەم شەڕەیان بەڕێوە دەبرد:

- ئێمە لە بەغداوە تا سووریا رێگەمان بڕی و بێ هیچ پلان و حەسانەوەیەک هێرشمان کردە سەر دوژمن. ئاکامەکەشی ئەوە بوو سەرجەمی "بریگاردەکە"ی من لە لایەن ئیسرائیلییەکانەوە دەورەی گیرا و تەنیا بەو شێوەیە رزگارمان بوو، کە "بریگاردەکەی تر"ی سوپای عێراق هاتنە مەیدان، گەمارۆیەکەیان تێک شکاند و ئێمە پاشەکشێمان کرد. لە راستیدا ئەمە سەرجەمی رۆڵ و جێگەی سوپای زەبەلاحی عێراق لەم شەڕەدا بوو، نیوەمان گیر کەوتین و نیوەکەی ترمان هاتن بە هەزار زەحمەت رزگاریان کردین.

شەوقی داوامان لێ دەکات بڕۆین بۆ جێگەی حەسانەوەی ئەو، کە هێندێک لەسەرترەوەیە و لەوێ بۆ خواردنی نیوەڕۆ مێوانی ئەو بین. خواردن لێرەش وەک شوێنەکانی تر برنج و لە لای برنجەکە کۆنسێرڤێکی "ساردینەر" دانراوە و بە وتەی شەوقی وەک دەستکەوت لە سەربازێکی عێراقی گیراوە.

- سەربازی عێراقی هەردەم شتانێکی لووکس و نایابیان پێیە، بەڵام پێشمەرگەی ئێمە وا نین. ئێمە ئەگەر هیچیشمان نەبێت بیخۆین بە نانی وشک و چای شیرین رازین. من لەم بەرپرسانە لەسەر شێوەی ژیانی پێشمەرگە دەپرسم بۆ نموونە دەپرسم داخوا ئێوە شتێک بە ناوی مووچە وەردەگرن؟ فازڵ دەبێژێ:

- راستـــەوخـــۆ نا. بۆ نموونە مـن ٢٣ دینـار وەردەگـرم بۆ ئـەو بیـــست پێشمەرگەیەی لەگەڵ مندان، بەو پارانە جگەرە، چا و شتی لەم بابەتەیان بۆ دەکڕم. ئەگەر کەسێکیش پێویستی بە کڕینی شتێکی تایبەت بێت دەتوانێ پارەکەی لە من وەرگرێ. دیارە پێشمەرگەیەک ژن و منداڵی هەبێ هێندێک پارە بۆ بەڕێچوونی ئەوانیش وەردەگرێ. هەڵبەت ئەمە پارەیەکی دیاریکراو و یەکسـان نیـیـە بۆ گـشت جـارێک، بگرە بە پێی پێـویست و توانست بڕی پارەکەش دیاری دەکرێ. پیاوێک کە ١٠ منداڵی هەیە زۆرتری بەردەکەوێ لە پیاوێک کە ٥ منداڵی هەبن.

من پرسیارێکم لا دروست بووە - راستی ئێوە چۆن دەتوانن بۆ ماوەیەکی وا درێژ، دوور لە ژن بن؟

فازڵ لەم بارەوە دەڵێ:

- راستـی ئەمـە گرفـتـێکی زۆر گـەورەیە. زۆرجـار روو دەدات، کـە ئەم پێـشمـەرگانە بۆ مـاوەی دوو مـانگی تەخت لە بەرەی شـەڕدان و چاویان بە ژنێکیش ناکـەوێ. ئەوانـەیان ژنیـان هەیە رەنگە بتـوانن دوو مـانگ جـارێک ژنەکانیـان ببینن، بەڵام بۆ پێشمـەرگە گەنجە بێ ژنەکان شـتێک لە ئارادا نییە. خۆت دەزانی لە لای ئێمە لە کوردستـان ئەم شتـانە زۆر سەخت و توند دەگرن و پێوەندیی کوڕ و کچ یەکجار دژوار و هێندێک جاریش زیاتر خەونە تا ڕاستی. دیارە ئەمە زۆر سەختـە و قبووڵیشمانە، کە ئەمەش بەشێک لە ئەرکەکانمانە بۆیە ناچارین لەگەڵیدا رابێین.

لەتیف، کە لەم سەفەرەدا وەرگێڕی منە دەڵێ:

- من جـارێک لەگـەڵ رۆژنامـەوانێکی ژندا، کـە پێم وایە ئەمـەریکایی بوو رۆیشتم بۆ بەرەی شـەڕ. زۆرم هەوڵ دا، کە هێندێک جلی گونجاو لەبەر کات و زۆر خـۆی لە پێش چاوی پێـشـمـەرگـەکـان دەرنەخـات بەڵام بۆم حـاڵی نەدەبوو.

ئەو بە شەرواڵێکی تەنگ، بلووسێکی ناسک و بێ سینەبەند بە ناو پێشمەرگەکاندا هەڵدەسووڕا. ئەگەر ئەو تێ دەگەیشت، کە کوڕ لەناو خۆیاندا چییان دەوت و چۆن بانگی ئەویان دەکرد. بە ڕاستی گوناح بوو، ئاخر ئەو پیاوانە بە مانگان ژنێکیان نەبینیبوو و لە پڕ ژنێکی رووتی جوانکیلە بێت و بە پێش چاویاندا هاتوچۆ بکات. ئەو هیچ تێگەیشتنێکی لەم بارەوە نەبوو نا.

لەو کاتەی کە ئێمە دانیشتووین و قسە دەکەین پێشمەرگەکان بە بەردەمماندا دێن و دەچن و هێندێکیشیان تاوێک دادەنیشن تا پشووێک بدەن و یەکێک لەو پێشمەرگانە لە لایەن فازڵ و شەوقییەوە جیاواز و زۆر بە گەرمی پێشوازیی لێ دەکرێ. فازڵ دەبێژێ:

– ئەمە کاک نوورییە. ئەو و پێشمەرگەکانی هاتوون بۆ یارمەتیدانی ئێمە. کاک نووری لەناو ئێمەدا بۆ ئازایەتی و قارەمانەتی بەناوبانگە. نووری نە جامەدانەی لەسەرە و نە لەو پشتوێنە درێژەش، کە پێی دەڵێن "شوتوک". سەراپای جەستەی بڕوا، هێز و توانایەکی لە بڕان نەهاتووی لێ دەبارێ. چاوی چکۆڵە، برۆی پڕ و ڕەش، هێندێک گرنج لە توێڵی کەوتوون و زنج و ڕوومەتی بە ڕدێنێکی ڕەش داپۆشراوە. فازڵ دەڵێ:

– کاک نووری بە ٩٠ پێشمەرگەوە کێوی "گۆڕا"ی لە دوژمن وەرگرتەوە. ئەمە سەرکەوتنێکی مەزن و لە ڕاستیدا بۆ خۆی شاکارێک بوو.

نووری تەمەنی ٣٣ ساڵە و خەڵکی سلێمانییە. دوای تەواوکردنی قوتابخانە و هەر لە ساڵی ١٩٦٢ەوە تێکەڵی شۆڕش بووە و تا ئێستە بەشداریی خەبات و خزمەتە. من داوای لێ دەکەم باسی چۆنیەتیی گیرانەوەی کێوی "گۆڕا" بکات بەڵام ئەو زۆر کەم قسەیە و حەز لە گێڕانەوە و تاریفکردنی شتێک ناکات، کە خۆی ئەنجامی دابێت.

ڕۆژی ڕوودانی ئەم پەلامارە ١٦ی ئاب بوو، دەوڵەت لە هێرشێکدا ئەو

شوێنەی داگیر کردبوو. لەبەر گرینگی و ستراتیجیەتی کێوەکە دەبووا بە هەر نرخێک بووە لە دوژمن بستێنرێتەوە. ئەم ئەرکە دژوارە بە کاک نووری سپێردرا. ئەو ٩٠ پێشمەرگەی بۆ ئەم مەبەستە هەڵبژاردن و چەکی ئەم پێشمەرگانەش تەنیا کلاشینکۆف بوو. هێرشی پێشمەرگە سات ٦ ی بەیانی دەستی پێ کرد. لەژێر یارمەتیی تۆپخانەی شۆڕشدا تا لووتکەی شاخ چوونە سەر و لەوێ شەڕێکی دەستەویەخە لەگەڵ سوپایەکی ٥٠٠ کەسیی دوژمندا دەستی پێ کرد. زیاتر لە ٢٠٠ سەرباز و ئەفسەری دوژمن کوژران و ئەوانی تریان سەرەنجام ڕێگەی هەڵاتنیان گرتە بەر. لەم شەڕەدا ١٣ پێشمەرگەش گیانیان سپارد و ٣٥یش برینداربوون. ئێستە کاک نووری بە دووسەد پێشمەرگەوە نێردراوە بۆ یارمەتیی ئێمە تا بەرگری لە کێوی گەرووی عومەر ئاغا بکەین. ئەو لە سلێمانییەوە هاتووە و لەو بەرەیەشدا شەڕی دژوار لە ئارادایە بەڵام بەرەی باڵەکایەتی گرینگترە بۆیە کاک نووری پێویستە لێرەدا بێت.

من لە کاک نووری دەپرسم دۆخی پێشمەرگەکانی چۆنە، ورەیان، بڕوایان؟

– هەموو پێشمەرگەیەک بۆ خۆی قارەمانێکە. هەمووان شەڕوانی ئازا و نەترسن. بەڵام من پێم وایە پێشمەرگە گەنجەکان باشتر شەڕ دەکەن تا بە تەمەنەکان، هەموو پێشمەرگەکانی هاوڕێی من گەنج و کەم تەمەنن.

دوای ئەمە نووری دەڕوات بۆ بینینی مستەفا و هەڵسەنگاندنی دۆخەکە. فازڵ لەم بارەوە دەڵێ:

– کاک نووری دەیەوێ بۆ پارێزگاری لەم بەرەیە هاوکاریی کاک مستەفا بکات. بەڵام من لام وایە نووری گەرەکیە پەلامارێک بباتە سەر دوژمن. ئێمە بە دڵخواز لەم هێرشەدا بەشداری ناکەین، ئاخر ئێمە خەریکی پاراستنی ئەم بەرەیەین و ناتوانین ریسک بە گیانی پێشمەرگەکانمانەوە بکەین. ئێمە دەزانین، کە هەردەم پیاو زیانی لە هێرشدا زۆرترە تا لە کاتی پاراستن.

بەڵام کاک نووری پێی وایە ئێمە دەبێت هێرش بکەینە سەر دوژمن و دۆڵی رواندز پاکیان کەینەوە. ئەو خۆی ئامادەیە پلانەکە دارێژێ و بۆ خۆشی فەرماندەیی هێرشەکە بگرێتە ئەستۆ.

لەو ماوەیە ئێمە دانیشتووین قسە دەکەین هەوا تاریکی کردووە. پێشمەرگە بە هێندێک پەلوپووش ئاگرێک دادەگیرسێنن و زیاتر لەبەر رووناکییەکەی تا بە مەبەستی گەرمبوونەوەیان. ماوەیەکی زۆر لەبەر رووناکاییی ئاگرەکەوە دادەنیشین و قسە دەکەین. من لە دوورەوە رووناکیی چرا لامپاکەی بنکەی فەرماندەیی لە بەرزاییەکەوە دەبینم و دوای ئەوە ئاگرەکەمان بە تەواوی دامرکا منیش لەوێ بە مەبەستی خەوتن هەر لە شوێنی خۆمدا درێژ دەبمەوە.

ئێمە دەبووا ئێوارە بگەڕێینەوە بۆ چۆمان بەڵام ئۆتۆمۆبێلێک، کە بڕیار بوو بێت و بمانباتەوە هیچ کات نەهات، نازانم رەنگە لەبەر ئەوە بووبێت، کە شۆفێرەکەی نەوێرابێت جارێکی تر ئەو رێگەیە ببڕێ. لەتیف بەم بۆنەوە زۆر نیگەرانە بەڵام لە راستیدا بۆ من زۆر گرینگ نییە چونکە من حەز دەکەم لەم شوێنە، لە لای ئەم پیاوانە و لەم بەرەی شەڕەدا بمێنمەوە.

نیوەشەوێکی درەنگ لەتیف من هەڵدەستێنێ و ئۆتۆمۆبێلێکی سەربازی، کە چەکوچۆڵی بۆ بەرەی شەڕ هێناوە دەگەڕێتەوە و ئێمەش دەبێت لەگەڵیدا بڕۆینەوە. لەتیف دەڵێ:

– ئەگەر پێت خۆش بێت دەتوانی جارێکی تر بێیتەوە بۆ بەرەی شەڕ. منیش دەڵێم چووزانم، رەنگە وا بێت.

## من دەمویست ببمە هاوولاتیی سوێد

من هەرکە گەڕامەوە چۆمان، بیری بەرەی شەڕ و ئەو کوڕانەم دەکرد، کە تازە بەجێم هێشتبوون. بەلام ناچار بووم چونکە پێویست بوو چەند رۆژ لە چۆمان بمێنمەوە بەڵکو کەسانێک لە رێبەرانی کورد و ئەگەریش بکرێ جەنەراڵ بارزانی خۆی ببینم، خۆ زۆر باشتر دەبێت.

لە قەسرولسەلام، لەو جێگەیەی من دادەنیشم دەتوانیت سەیر و سەمەرەترین قیافە و روخساری دنیا ببینی. سروشتییە، کە دەبێت من بۆ خۆشم لەو جۆرە کەس و قیافانە حیساب بکەم.

من زیاتر تێکەڵاویم لەگەڵ وەرگێڕە گەنجەکان و شەماڵ و سیامەنددا هەیە، کە دوای سالانێک خوێندن لە لەندەن گەڕاونەتەوە بۆ کوردستان تا خزمەت و ئەرکی خۆیان لە بەرانبەر شۆڕشدا ئەنجام بدەن. ئەم دوو گەنجە ئەزموونێکی باشیان لە سیاسەتی جیهانیدا هەیە و هەروەها دەتوانن بەرسڤی گشت پرسیارەکانی من لەبارەی کوردستان بدەنەوە. من هەوڵ دەدەم خۆم لەوە بپارێزم وەختی خۆم لە قسەکردن و تێکەڵاوی لەگەڵ رۆژنامەوانانی بیانیدا، کە ئەوانیش وەک من لێرەن بەفیڕۆ بدەم. بەلام بەو حاڵەش لە کاتی نانخواردندا تووشیان دەبم.

مرۆڤی کاری و پرۆفێسیۆنێل لەناو ئەم دەستەیەدا دەگمەنە. دوو کەسی ئەمەریکایی پەیدا بوون یەکیان لە ئەسۆشیەتید پرێسەوە بوو و ئەوی تر لە رۆژنامەی نیویۆرک تایمزەوە. ئەوان تەنیا ٣ رۆژە گەیشتوونەتە ئێرە بەلام بە توندی خەریکی کاری خۆیانن. شەماڵ و سولەیمان هەوڵ دەدەن هەواڵێک بدەنە ئەم دوو کەسە و لەبەر خۆیانەوە هیوادارن هەواڵەکە ببێتە سەردێری

ڕۆژنامە و میدیاکان و لە ڕۆژاوادا دەنگ بداتەوە. هەواڵەکەش، کە ئەمان دڵیان پێی خۆشە ڕۆڵ و بەشداریی زەق و بەرچاوی رووسیایە لەم هێرشانەی عێراقدا بۆ سەر کورد. بەڵام من خۆم هیچ کات ئاکامێک و (شتێکی بڵاوکراوەم) لەم بارەوە لە سەردانی ئەم دوو کەسە بۆ کوردستان نەبینی.

جگە لەم دوو کەسە تیمێکی تەلەڤزیۆنی هۆڵەندایش لێرەن و خەریکی سازکردنی فیلمێکن لەسەر شۆڕشی کورد و خاڵی دەستپێکی فیلمەکەش بەسەرهاتی بنەماڵەیەکە، کە بە دڵنیاییەوە فیلمێکی باش دەبێت. ئەم تیمە ئەگەرچی بە توندی و ڕێکوپێکی خەریکی کاری خۆیانن بەڵام نایانەوێ باسی گشت ڕووداوەکانی ئەم شەڕە بکەن. ڕۆژێک ڕۆیشتبوون سەردانی بەرەی شەڕ بکەن، کەوتبوونە ناو شەڕ و فڕۆکە بەرەی شەڕەکەی بۆمباران کردبوو. بە قسەی خۆیان لە مردنی بێ چەندوچۆن گەڕابوونەوە بۆیە هێندە ترسابوون ڕۆحیان لەبەر نەمابوو.

کوڕێکی گەنجی فەرەنسایش لێرەیە کەس بە تەواوی لێی تێ ناگات. شەش مانگە لێرەیە و بە قسەی خۆی خەریکی نووسینی تێزی دوکتۆرایە لەسەر کورد. بەڵام جگە لەم کارەی جاروباریش بە کامێرایەکی کۆنی ١٦مم- یەوە خەریکە و بۆ خۆشی دەڵێ، کە وتار بۆ ڕۆژنامەیەکی فەرەنسایی دەنێرێ. ئەو زۆر بێ مگێز و بێ خوڵک دیارە. هێندێک جار دەبینم لەگەڵ مێوانداره کوردەکانیدا تووشی دەمەقاڵە دەبێت و ڕاستییەکەی شێوەی هەڵسوکەوتی ئەم کابرایە بۆ منیش جێی سەرسوڕمانە و بە هیچ شێوەیەک لێی حاڵی نابم خەریکی چییە. سەرباری هەموو ئەم کەسانە گەنجێکی تورکە، کە بێ ئەوەی هاتنی خۆی بە کەس ڕاگەیاندبێ هاتووە. بە قاچاخ و نایاسایی سنووری بەزاندووە و بانگەشە دەکات، کە دەرهێنەری تەلەڤزیۆنە. شتی هەرە خۆش و جێی سەرنج ئەوەیە ئەم کابرایە جگە لە تورکی، بە هیچ زمانێکی تر نازانێ قسە بکات.

بۆ نموونە تەنانەت تاقە وشەیەکی ئینگلیزی یان فرەنسایی نازانێ. دیارە ئەو لەسەر کۆی زاڵ لە تورکیادا وای حیساب کردووە خەڵک، تەنانەت لە کوردستانی عێراقیشدا بە تورکی قسە دەکەن. بە هەر جۆرێک بووە مەبەستی هاتنەکەی لە بەرپرسان دەگەیەنێ و گوایا دەیەوێ فیلمێک لەسەر جەنەراڵ بارزانی ساز بکات. لەبەر ئەوە کەس لە زمانی تێ ناگات و ناتوانێ قسەی لەگەڵدا بکات، هەر بۆ خۆی خەریکی هاتوچۆیە و جاروبار بزەیەک دێتە سەر لێوی، کە بۆ دەوروبەر وەک شتێکی سەیر و نەشیاو دێتە بەرچاو.

کورد تێ دەگەن کە ئەم کابرایە دەتوانێ خەفیە و سیخوڕیش بێت بەڵام بەو حاڵەش وەک ئەوانی تر مامەڵە و میوانداریی دەکەن و لەولاشەوە خەریکی لێکۆڵینەوەن تا بزانن لە کوێوە و بە چ مەبەستێک هاتووە. ئەم گەنجە تورکە دە ڕۆژ لێرە ماوەتەوە، بەڵام سەرەنجام لێکۆڵینەوەکان دەری دەخەن ئەو ڕاست دەکات و بۆ کارێکی وا هاتووە، کە خۆی باسی دەکات، بۆیە بەرپرسە کوردەکان پێی دەڵێن ئێستە بڕۆوە و بەڵام جاری تر ویستت بێیتەوە دەبێت کەسێک لەگەڵ خۆتدا بێنیت فرەنسایی یان ئینگلیزی بزانێ تا ئێمەش بتوانین هاوکاریت بکەین.

دوو کەسی ئاوسترياییش لە سنووری تورکیاوە بێ مۆڵەت هاتوونەتە ناو، سەرەتا وەک تووریست کە سەری ئالپ دەدەن جلوبەرگیان پۆشیوە، خەڵکی بەرواریی باڵا بینیویانن، بردوویاننە لای ئەسعەد فەرماندەی هێزی ئەو ناوە و ئەویش بەڕێی کردوون بۆ ئێرە. ئەم دوو کەسە دوای حەفتەیەک بە ڕێگەی ئاساییدا لە ئێرانەوە گەڕانەوە بۆ وڵاتی خۆیان.

بەڵام پێش هەموو کەس و سەمەرەتر لە هەمووان دوکتۆر "ئالکساندرە".

کاتێک، کە من لە بەرەی شەڕ گەڕامەوە بۆ چۆمان نیوەی شەو بوو، بینیم دوکتۆر ئالکساندر لەو تەختەیدا، کە من بە هی خۆمم دەزانی خەوتووە. لە تەنیشتەوە تەختێکی بەتاڵم بینییەوە و نیازم بوو بۆ خەوتن بەکاری بێنم.

بەڵام هێندە ماڵەکە خرت و پرتی تێدا بوو دوکتۆرم وەخەبەر هێنا، لە پڕدا بەو نیوەشەوە و بە دەنگی بەرز دەڵێ:

- بەیانی باش، جگەرەیەکت هەیە بمدەیتێ؟

ناوی تەواوی ئەم کابرایە دوکتۆر - ئالکساندر ل ئارێنسۆنە و بە سواری ئۆتۆمۆبێلێکی مێرسێدیس، کە پشتەکەی کردووەتە جێگەی دەوا و دەرمان و وەک "عیادە" کەڵکی لێ وەردەگرێ لە رێگەی ئێرانەوە خۆی گەیاندووەتە ئێرە. ئەو بەم شێوەیە و هەر بەم ترۆمبێلەوە زۆر شوێنی تری دنیا رۆیشتووە و لە هەر جێگەیەک پێی وا بێت بوونی ئەو پێویست بێت ئەو خۆی دەگەیێنێت. دیارە هیچ پارەیەک لە کەس بۆ ئەم کارانەی جگە لە خواردن و جێ حەوانەوە، وەرناگرێ.

ئالکساندر زەلام، بەهێز و سمێڵێکی زەبەلاحیشی پێوەیە، کە تەنانەت لەناو کوردانیشدا دەتوانێ پێیانەوە بنازێ. ئەو زۆر زوو خۆی لە کاری نەخۆشخانەکەی چۆمانەوە وەردەدات، بەڵام زۆر ناڕازییە و گەلێک رەخنە و کۆمەڵێک گۆڕانکاریی گرینگ و ئاقڵانەشی پێشنیاز کردووە، کە چۆن کارەکان باشتر و کاریگەرتر بڕۆنە پێش. بەڵام کورد بە قسەی ناکەن و گوێی لێ ناگرن. ئەو خاوەن ئەزموونێکی فرەوانە لەم بارەوە، لە"بیافرا"، هیند و زۆر وڵاتی تری شەڕلێدراو و بەر کارەسات کەوتوودا کاری کردووە. لەم ماوەیەدا فێر بووە چۆن بە ئیمکاناتی ساکار و سادە کاری زۆر گەورە و بەکەڵک بکات، بەڵام دوکتۆرە کوردەکان، کە لە نەخۆشخانەی تەیار و نوێوە لە بەغدا و شارەکانی ترەوە هاتوون بە زەحمەت لەم کابرایە و رێگەچارەکانی وی تێ دەگەن.

کاتێک ئەو پێشنیاز دەکات، کە ژنان دەتوانن بە کوڵاندنی ئاوی برنج سکچوونی منداڵەکانیان چارەسەر بکەن بە جێگەی ئەوە کۆڵێک دەرمانی جۆرەوجۆریان بە زاردا بکەن، دوکتۆرە کوردەکان نایسەلمێنن و دەڵێن خەڵک

چۆن بەمە رازی دەبن؟ و هێندێکیشیان ئالکساندر بە شێت دەزانن. بە قسەی ئەم دوکتۆرانە خەڵکی بۆیە دێنە لای دوکتۆر دەرمانیان پێ بدات نەک...

بە کورتی هەر پێشنیازێکی دوکتۆر ئالکساندر دەگاتە لای دوکتۆرە کوردەکان و لە لای ئەوان نامۆیە، سەرێکی بۆ با دەدەن و لەبەر خۆیانە بە گەوج و کەری دەزانن.

هەموو ئێوارەیەک، کە من ئەو دەبینم وەک رۆژی پێشوو تووڕەیە و دەزانم شتێکی وتووە بە قسەیان نەکردووە. ئەو زۆر دژوار دەتوانێ لەگەڵ هاوکارە کوردەکانیدا رێک کەوێ و بیر لەوە دەکاتەوە بڕوا و ئەم ناوە بەجێ بێڵێ:

– کاتێک نەتوانم لێرە بە دڵی خۆم و بەو جۆرەی خۆم دەمەوێ کار بکەم گوێ نادەمێ، کوردستان بەجێ دێڵم و دەڕۆم بۆ هیند، بۆ من جیاوازیی چییە؟ کاری من خزمەتی لێقەوماوانە و دنیاش پڕە لەوانە.

کاتێک من لێی دەپرسم ئەو چۆن خەرجی ئەم سەفەرانەی دابین دەکات، لە وەڵامدا تەنیا دەڵێ:

– من هێندێک سەروەتم هەیە.

ئەو ژنێک و کوڕێکی ١٤ ساڵەی لە هۆڵەندا بەجێ هێشتووە و بێ هیچ شکێک ئەو یەکێک لە مرۆڤە جیاوازەکانی ئەم دنیایەیە، کە هەر کەس بیبینێ قەت لە بیری ناکات و رەنگە منیش لەو دەگمەن کەسانە بم، کە بە هاسانی دەتوانم لەگەڵیدا بسازم و هەڵبکەم.

ئەو رۆژەی من لەناو چادرەکان، لە بەشی زانیاریدا دوکتۆر کەمالم بینی تووشی کابرایەک بووم و لێمی پرسی داخوا من لە ئینگلیزەوە دێم؟

نا، من خەڵکی سوێدم.

– ئاها، ئەگەر وایە دەتوانین سوێدی پێکەوە قسە بکەین. سوێدییەکەی زۆر باش و مەیلەو بەبێ دەرکەوتنی زاراوەیە.

ئەم کەسە ناوی سەعید دزەیی و یەکێک لەو کوردانەیە لە سوێد خوێندوویە، من ئەوەدەم دەرفەتم نەبوو بە وردی قسەی لەگەڵدا بکەم بەڵام ئێستە لە دوای گەڕام و لە ماڵێکی نزیک بەشی راگەیاندن کە مەیلەو هیچ تەختێکی تێدا نییە دیتمەوە. ئەو بەهاتنی من زۆر خۆشحاڵە و لە راستیدا شتەکە بۆ منیش هەر وایە، چاو لە چارەنووسی مرۆڤ کە، من لێرە کەسێکی سوێدی - کورد دەبینمەوە، کە بە ساڵان لە سوێد ژیاوە و شارەزاییی لە زمان و ژیانی سوێدییەکاندا پەیدا کردووە بەڵام ئێستە لێرە لە ناوەڕاستی ئازارەکانی خەڵکەکەی خۆیدایە.

سەعید دزەیی یەکێک لەو کەسانەیە لە دوو دنیادا دەژی و لە هەردوو دنیاکەش باش تێ دەگات. سەعید تەمەنی ٣٥ ساڵە و رەنگە لە پێش چاوی من زۆرتر دیاری بکات، بەڵام لەم ماوەیەدا فێر بووم دژوارە لە رێگەی رواڵەت و رووخسارەوە بزانی کەس لەم وڵاتەدا تەمەنی چەندە. ناوبراو لە شاری هەولێر لەدایک بووە، شارێکی کۆن و دێرین و مێژوویی، کە لە راستیدا دەبووا پایەتەختی کوردستان بێت، بەڵام ئێستە شاری پڕ لە نەوتی کەرکووک کەوتووەتە پێشی و هەولێر لەم بارەوە پاش خراوە. من داوا لە سەعید دەکەم زیاتر باسی خۆیم بۆ بکات:

- باوکی من سێ جاران ژنی هێناوە و من ٢٠ خوشک و برای ترم هەیە. ١١ برا و ٩ خوشک. باوکی من خاوەن موڵک و زەوییەکی فراوان بوو، بەڵام دوای شۆڕشی ١٩٥٨، کە زەوی بەسەر جووتیاران دابەش کرا بنەماڵەی ئێمە زیانێکی زۆری بەرکەوت. لەبەر ئەوەش سەرجەمی زەوییەکە لەسەر ناوی باوکم تاپۆ کرابوو، ئێمە هیچ قەرەبوویەک نەکراینەوە، تەنیا تیکەیەک زەوی، کە بەشی بنەماڵەیەکی ئاسایی بوو بەر ئێمەش کەوت و تەواو. موڵکدارەکانی تر لەبەر ئەوە پێشتر زەوییەکانیان لە نێوان منداڵەکانی خۆیاندا دابەش کردبوو وەک ئێمە زیانیان نەکرد بگرە هەر کامەیان هێندەی سەرجەمی بنەماڵەکەی ئێمەیان زەوی بۆ مایەوە. بەڵام باوکی من لەم فێڵە

تێ نەگەیشتبوو و تازە هەموو شتێکیش لە دەست چوو و پەشیمانی کەڵکی نەبوو.

مەبەست لەم چاکسازیی زەوییەکە ئەوە بوو، کە زەوی لە دەستی ئاغا و موڵکدار بێتە دەر و جووتیاران بۆ خۆیان سەربەخۆ بەرهەمی بێنن و ئەمە بۆ خۆی کارێکی باش بوو بەڵام جێبەجێکردنەکەی بە تایبەتی هەڵە بوو. جووتیار هەر کامەی بووە خاوەن زەویی خۆی، بەڵام ئەوان هەژار و بێ دەرەتان بوون. هیچ ئامراز یان پارەی کڕینی ئەو ئامرازانەی بۆ کێڵانی زەوی پێویستە لە دەست ئەم خەڵکەدا نەبوو. بۆیە ناچار بوون بڕۆنە شار و لە لای دەوڵەمەندان پارە قەرز کەن تا بتوانن شتێک بەرهەم بێنن و بە هۆی بێ ئەزموونی و نەزانیشەوە بەرهەمەکان تەنیا بەشی دانەوەی قەرزەکان بوون و شتێک بۆ بەرهەمهێنەکان نەدەمایەوە، کە ئەمە خۆی بە کارەسات بەکۆتایی هات. پێشتر زەوی هی ئاغا و دەرەبەگ بوو و ئێستەش بە کردەوە هی سەرمایەدارانی شارنشینە و شتێک لە حاڵی جووتیار نەگۆڕاوە و ئەگەریش گۆڕابێت بە باری خراپیدایە نەک باشتر.

ساڵی ١٩٥٨، کاتێک هێشتا ئێمە خاوەن سامان بووین منیان نارد بۆ بەغدا تا لە یەکێک لە باشترین زانسگەکاندا بخوێنم. دوای ئەوە چووم بۆ لەندەن و لە بەشی زانستی سیاسیدا دەستم بە خوێندن کرد. ساڵی ١٩٦٤ گەڕامەوە هەولێر.

زیاتر لە ساڵێک لە هەولێر بێکار گەڕام و دواتر ساڵی ١٩٦٥ نیازم بوو تێکەڵی شۆڕش بم بەڵام بە هۆیەک پەشیمان بوومەوە، دەمزانی بوونی من لە شۆڕشدا زۆر گرینگ نییە، نزیکەی ٤٠٠٠ هەزار کرۆنی سوێدی پارەم هەبوو، بەو پارانەوە رووم کردە ئەوروپا بێ ئەوەی ئامانجێکی روونم هەبێت. چوومە ئەڵمانیا، سویسرا، ئیتاڵیا و سەرەنجام سەرم بە دانیمارکەوە دەرچوو. لەوێ تووشی کچێکی ئەمەریکایی بووم و پێی وتم من پێم وایە بۆ تۆ باشترە بچیت بۆ سوێد.

بەم شێوەیە سەعید گەیشتبووە سوید. لە عێراق بە پاسپۆرتێکی دەسکار دەرکەوتبوو. لە سوید خۆی دایە دەستی پۆلیس و، دوای ماوەیەک مافی پەنابەریی پێ درابوو و دەستی بە خوێندن لە زانسگەی ستۆکهۆلم کردبوو. دوای پێنج ساڵ خوێندن کەوتبووە دوای کار و بە تەمای مانەوە لە سوید. بۆ خۆی درێژە بە بەسەرهاتەکەی دەدا و دەڵێ:

- من دەمویست ببمە هاووڵاتیی سوید و بەڕاستیش هەوڵم بۆی دا. من لەناو کارگەدا کارم کردبوو بەڵام ماندوو بووبووم و دەمویست لە شوێنێکدا کار بکەم، کە بۆیم خوێندووە. دەمویست ژنێکی سویدی بێنم بەڵام ئەمە کارێکی نامومکین بوو، من بە سویدییەکانم دەوت ئێوە پێنج ساڵ یارمەتیی منتان داوە تا بخوێنم و ئێستەش، کە من گەرەکمە کار بکەم تا ئەو قەرزانەی ئێوە پێتان داوم بدەمەوە کەچی کارم دەست ناکەوێ. بۆیە زۆر ناڕەحەت و دڵشکاو بووم، لە کچە هاوڕێیەکەم ماڵاواییم کرد و گەڕامەوە بەغدا.

ئەمە ساڵی ١٩٧٢ بوو و سەعید هەرکە گەڕایەوە لە بەغدا لە وەزارەتی دارایی بەشی بیانییەکاندا کارێکی شایانی خوێندن و شەهادەکەی وەرگرت. لە سەرەتای ١٩٧٤ەوە کرایە بەرپرسی کۆمپانیایەکی نوێ لە هەولێر. شەریکەکە هێشتا بە تەواوی لە هەولێر دانەمەزرابوو شەڕی نێوان دەوڵەت و شۆڕش دەستی پێ کردەوە. سەعید بۆ خۆی لەم بارەوە دەڵێ:

- ١١ی ئادار من لە سەرۆکی کۆمپانیاکەوە تەلگرامێکم پێ گەیشت، کە هەرچێک زووترە بگەڕێمەوە بەغدا. کە چوومە ئەوێ لێم پرسین بۆ منتان بانگ کردووە؟ لە وەڵامدا وتیان بۆ ئەوە نەچیت تێکەڵی شۆڕش بیت. من دوو حەفتەیەک لەوێ مامەوە، دوایە گەڕامەوە هەولێر، تاکسییەکم گرت و بە شۆفێرەکەم وت تا چۆمان ڕانەوەستی. دیارە ئەو ڕۆژانە هەزاران کەسی تر لە هەولێرەوە ئەم ڕێگەیەیان بەرەو شۆڕش گرتبووە بەر، زۆربەیان بە پێ و دوای حەفتەیەک سەخڵەتی گەیشتبوونە جێ، چونکە هەواکەی زۆر ناخۆش

و باران و ساردی بوو. من کە بە تاکسی هاتبووم کارێکی شێتانە و پڕ مەترسی بوو بەڵام ڕاستی تاقەتی بڕینی ڕێگەیەکی وا دوورم بە پێیان نەبوو. شتی سەیر ئەوەیە من لەم ڕێگەیەدا بەناو ئەو هەموو سەیتەرەدا هاتم و کەس هیچی نەوت و ئێستەش کە باسی دێتە پێش و دەڵێم من لە هەولێرەوە بۆ چۆمان بە تاکسی هاتم، کەم کەس بڕوام پێ ناکات.

هەر لەو کاتەوە، کە وەک قوتابی لە ئینگلیزدا بوو سەعید لە گەلێک بواری جیاوازی بزاوی کورددا چالاک بوو، لە سوێدیش درێژەی بەو کارەی دا و بە نووسینی وتار، پێکهێنانی کۆڕ و کۆبوونەوە خزمەتی خۆی درێژە دا و یەکێک بوو لە ئەندامانی ئەو کۆمیتە کوردییە، کە لە ستۆکهۆڵمدا کاری دەکرد.

ئەو هەر لەمێژەوە بڕیاری دابوو ئەگەر ڕۆژێک بێت و شەڕ دەست پێ بکاتەوە، چالاکانە بەشداری شۆڕش بێت و کاتێکیش گەیشتە چۆمان ئامادە بوو لەو بوارەدا، کە زیاتر بەسەریدا زاڵ بوو دەست بەکار بێت. ئەم ڕۆژانە، کە من لە چۆمانم ئەو بەرپرسی بەشی ئینگلیزیی ڕادیۆی کوردستانە، کە ڕۆژانە بەرنامەکانی بڵاو دەبنەوە و جگە لە هەواڵی ڕووداو گشت ڕۆژێک وتارێکی سیاسیش بڵاو دەکاتەوە، کە لە لایەن سەعید خۆیەوە دەنووسرێ.

من گوێ لە یەکێکی ئەو وتارانەی ڕادیۆی کوردستان دەگرم، کە بە ئینگلیزی لە لایەن سەعیدەوە نووسراوە باس لە بێدەنگیی نەتەوە یەککگرتووەکان لە حاست بارودۆخی خراپی کورددا دەکات:

کۆمەڵکوژی، هەڵاواردنی ڕەگەزی و شەڕێکی بێ ڕوحمانە، کە لە کوردستاندا لە ئارادایە و ئامانجی ڕیشەکێشکردنی کوردە و هەروەها تیرۆر و تۆقاندن لە عێراق تاوانی حاشا هەڵنەگر و پێشێلکردنی ئاشکرای پێڕەوی نەتەوە یەککگرتووەکانە.

تیرۆری ڕێژیمی بەعس لە کوردستان بێ بایەخگرتنی سەرجەمی

پرەنسیپەکانی یو ئێنە و پێشێلکردنی تەواوی ئەو مافە مرۆیی و نەتەوەییانەیە، کە هەردەم لە لایەن گەلانی دیموکرات و خاوەن شارستانییەوە رەوابوونیان سەلمێنراوە.

دەسەلاتدارانی رژێمی بەعس بێباک لە لێپێچینەوە و لێپرسینەوەیەک، خراپترین تاوان لە کوردستان ئەنجام دەدەن و نەتەوە یەکگرتووەکان و گشت ئۆرگان و ناوەندەکانی ژێر چاودێریی ئەو رێکخراوە جیهانییە، لەم بارەیەوە بێدەنگن. ئەم شەرە چەپەڵ و بێ روحمانەیە و هەڵواسینی بە کۆمەڵی کورد و عەرەب لە لای بەعسەوە بووەتە بیانووی ئۆقرەیی و ئارامی لە ولات. بەو حاڵەش تاقە ولاتێکی ئەندامی ئەم یەکەتییە ئامادە نییە دەنگێک هەڵبڕێ. بەلام بۆ ئەوانەی رێز لە مافەکانی مرۆڤ دەگرن دەبوا هیچ بیانوو و پاساوێک بۆ ئەم بێدەنگییە جێی پەسند نەبوایە.

لە شوێنەکانی تری دنیادا بە هاسانی یو ئێن دەست لە کاروباری ناوەخۆیی ولاتانی ئەندام وەردەدات و رێگەچارە بۆ کێشە دەبینێتەوە بەلام کاتێک دەگاتە لای ئێمەی کورد نەتەوە یەکگرتووەکان و سکرتێری گشتییەکەی گوێ خەواندن و خۆلادان هەڵدەبژێرن.

تاقمی بەعس ئیزنی پێ دەدرێ کۆمەڵکوژی بکات و درێژە بە شەرێکی دژی خەڵکی لە بەرانبەر سەرجەمی نەتەوەیەک لە کوردستاندا بدات، ئەمەش سەرەرای ئەندامبوونی عێراق لە یو ئێن و ئیمزاکردنی ئەم بەڵگەنامەیە لە لایەن ئەم رژێمەوە:

١ – بەڵگەنامەی پێشگری و سزادانی کۆمەڵکوژی.

٢ – بەڵگەنامەی ناونەتەوەیی لەسەر لەناوبردن و سڕینەوەی هەموو شێوەکانی هەلاواردنی رەگەزی.

٣ – بەڵگەنامەی ناونەتەوەیی لەبارەی مافە ئابووری، کۆمەلایەتی و رۆشنبیرییەکانەوە.

٤ – بەڵگەنامەی ناونەتەوەیی مافی هاوولاتیبوون.

ئێمە لەم بارەیەوە تەنیا ڕژێمی فاشیستی بەعس بەم کارانە تاوانبار ناکەین، بگرە زۆر و کەم نەتەوە یەکگرتووەکانیش بە تاوانبار دەزانین، کە دەستی ئەم ڕژێمەی ئاواڵە کردووە تا شەڕی توانەوە و سڕینەوەی خەڵکی سیڤیلی کوردستان دەست پێ بکات و بێ ترس لە لێپرسینەوەش درێژەی بدات. فاشیستەکانی بەعس لە بەغدا کاتێک بێدەنگیی یو ئێن دەبینن لە شەڕی چەپەڵیاندا دژی ئێمە پشت ئەستوور دەبن. هەمان ئەم پشت ئەستوورییانە لە دەیەی ۳۰دا درایە هیتلەر و بینیمان، کە چیی لێ شین بوو. هەروەها ئێمە باش دەزانین، کە بەعس هەمان ئامانج و نیازی فاشیستییەیان هەیە و ئێستە، کە شەڕەکەیان لە کوردستاندا دەست پێ کردووە بێ شک لە داهاتوودا کارەساتێک بۆ سەرجەمی ڕۆژهەلاتی ناوین دەهێنێتەوە.

## ئازادی لە هەموو شت گرینگترە

سێ حەفتە بەسەر گەڕانەوەی من لە کوردستان رادەبڕێ. هەر ئەمڕۆ یەکەم نامەم لەوێوە پێ گەیشتووە و لە لایەن سەعدوڵڵاوە نووسراوە تێیدا دەڵێ:

"گەلێک شت دوای تۆ گۆڕانیان بەسەردا هاتووە، دەوڵەت گەورەترین هێرشی خۆی بۆ سەر "گەرووی عومەر ئاغا" لە بەرەی باڵەکایەتی دەست پێ کرد و لە لایەن ئێمەوە ناچار بە پاشەکشێ کران. لە رووداوەیلی شەڕ و کشانەوەیاندا هێزەکانی رێژیم نێزیک ٥٠٠ کەسیان لێ کوژرا و سەد لاشەیان کەوتە دەستی ئێمە. رۆژی دوایی فڕۆکەکانی دەوڵەت وەک تۆڵەکردنەوە چۆمانیان بۆمباران کرد و لە ئاکامدا کوڕێک بە ناوی ئازاد کوژرا. جێی ئاماژەیە تۆ وتووێژت لەگەڵ بنەماڵەی ئەم کوڕەدا کردبوو تا وەک نموونەی ئەوانە لە کەرکووک وەدەر نراون نیشان بدرێ. هەروەها ژمارەیەکی زۆریش لەم بۆمبارانە بریندار بوون."

بە دەفتەری یاداشتەکانمدا دەچمەوە، بنەماڵەیەکی خەڵکی شاری کەرکووک... ئەرێ، ئەوەتا، من تایبەتی ئەوانم لە بەرچاو گرتبوو تا باسیان بکەم. لاپەڕەی دەفتەرەکەم دەدەمەوە... دەبینم ئەوەتا ناوەکەی لێرەیە، ئازاد... ئەو تەمەنی ١٢ ساڵ بوو.

پیاوەکە ناوی کاکەڕەش و ژنەکەی ناوی "خونچە"یە. دیارە ئەوان شتێکی دەگمەن و جیاوازیان لەگەڵ خەڵکەکەی تردا نەبوو. ئەوان لە گەڕەکی رەحیماوای کەرکووک دەژیان، بنەماڵە و خزمانی ئەوان پشتاوپشت لەوێ ژیابوون، کۆزێک منداڵیان هەبوون، دوکانێکی بچکۆلە بۆ بەڕێوەچوونی

خۆیان هەبوو و بە هەبوونی دوو دەستە ماڵ لەو شارەدا لە سەریەک ژیانیان خۆش و حاڵیان ئاسوودە بوو.

١٩٧٢ کوڕە گەورەکەیان تێکەڵی شۆڕش بوو، رووی لە شاخ کرد. کاتێک لە ئاداری ١٩٧٤دا شەڕ دەستی پێ کردەوە باوکی بنەماڵەش رێگەی شاخی گرتە بەر و بە قسەی خۆی کاتی ئەوە بوو خەبات بۆ رزگاریی خۆیان بکەن.

دوای ئەمە خونچە، بە تەنیا لەگەڵ چوار منداڵدا مایەوە. ئازاد ١٢، فەرهاد ٩ شێرزاد ٧ و قوبادیش ٤ ساڵانە بوون. بەو حاڵەش نەدەبوا گرفتێکی گەورە بێتە سەر رێگەی بەرێوەچوونیان چونکە هەم لە ماڵی خۆیاندا دەژیان و هەمیش دوکان و ماڵێکی زیادیشیان هەبوو، کە دەکرا لە کاتی پێویستدا بیدەنە کرێ.

بەڵام ئێستە من خونچە لە چۆماندا دەبینم. ئەو لە دیوێکدا لەسەر ئەرد دانیشتووە کە نۆ کەسی تێدا دەژین. ژنێکی گورجوگۆڵ و پڕ لە وزە و کاتێک من دەمەوێ قسەی لەگەڵدا بکەم، بە پێچەوانەی ژنانی تری کورد، کە لە کاتی بینینی کەسێکی نەناسراودا هێندێک شەرم و شوورەیی لە خۆیاندا نیشان دەدەن، ئەو باکێکی نییە لەوەی باسی خۆی و بەسەرهاتی بنەماڵەکەیم بۆ بکات:

- من لە کەرکووک دەترسام. دیارە کاتێک پیاوانی رژێم بیانزانیایە کەسێکی هەر بنەماڵەیەک - کوڕیان یان باوکیان - لە لای شۆڕشە، پاشماوەی بنەماڵەکەش شاربەدەر دەکران. بە شەوانە درەنگ پۆلیس بەسەر خەڵکیان دادەدا، خەڵکەکەیان دەبردە دەرەوە و دەستیان بەسەر ماڵەکەدا دەگرت. ئەم دۆخە بۆ ژمارەیەکی زۆر لە دۆستەکانی من رووی دابوو. رۆژێک لە دۆستێکەوە هەواڵم پێ گەیشت، کە کاربەدەستانی میری زانیویانە مێرد و کوڕی منیش پێشمەرگەن و بڕیارە شەو بێنە سەرمان. لە چارەنووسی خەڵکی ترەوە دەمزانی مانای چاوەڕوانیی ئەو شەوە سامناکە چییە، بۆیە

من نەوێستام تا شەو بەسەردا بێت و ئەوان بواریان بێت بگەنە سەرمان. بە پەلە ئۆتۆمۆبێلێکم بەکرێ گرت، هەر چوار منداڵەکەم تێ خست و داوام لە شۆفێرەکەی کرد بمانگەیەنێتە تەق تەق لەسەر ڕێگەی کۆیە. شۆفێرەکە نەیدەویست لەوە زیاتر لەگەڵمان بێت، بۆیە ڕۆژی دوایی دوو هێسترم بەکرێ گرت، پاش پێنج ڕۆژ بە سواری و هێندێک جاریش بە پێ تا گەیشتینە پێنجوێن. دیارە ئەمە نزیکترین ڕێگە نییە بۆ ئەوەی خەڵک بێت بۆ چۆمان، بەڵام ئێمە ناچار و بۆ ئەوەی نەکەوینە دەست پیاوانی ڕێژیم دەبووا لە پێشدا بڕۆینە ناو خاکی ئێران و لەوێوە دیسان جارێکی تر بگەڕێینەوە بۆ لای چۆمان.

من لە پێنجوێن چوومە نووسینگەی پارتی و داوام لێ کردن تەلگرامێک بۆ چۆمان بنێرن و بڵێن ئێمە بە ڕێگەوەین بۆ ئەوێ.

ڕێگەی تەق تەق بۆ پێنجوێن زۆر دژوار بوو. هەوا زۆر گەرم و ئێمەش وەک پێویست ئاومان پێ نەبوو. دوای سێ ڕۆژ گەیشتینە "شەدەڵە" بەڵام نەمانوێرا لەوێ بمێنینەوە و ڕۆیشتین بۆ "سەرگەڵوو". لەوێ دوو شەو ماینەوە، من هەموو پارەکەم لە ڕێگە خەرج کردبوو و نەمدەتوانی هێستر بەکرێ بگرم بۆ درێژەی ڕێگە. بەڵام چاک بوو لەوێ تووشی چەند پێشمەرگەیەک بووین و ئەوان لەم بارەوە یارمەتییان داین. نیوەی شەو ئەوان بە سواری لۆرییەک دەڕۆیشتن بۆ پێنجوێن و ئێمەشیان لەگەڵ خۆیاندا برد. جگە لە ئێمە کەلێک بنەماڵەی تری هاوچارەنووس لەگەڵدا بوون و هەموو ڕێگە ترسی ئەوەمان هەبوو بکەوینە داوی بنکە و سەیتەرەکانی ڕێژیم، کە لەو ناوە نێزیک بوون.

لە پێنجوێن پارتی ٥٠ دیناری دا بە من و بە پێ لە سنووری ئێرانەوە چووینە ئەودیو و ڕۆیشتین بۆ شاری سنە. لەوێشەوە چووین بۆ مەهاباد و سەرەنجام گەیشتینە خانێ لەسەر سنووری چۆمان.

لەم ڕێگە درێژەدا گەلێک ماندوو بووین و تا گەیشتینە ئێرە دوو حەفتەی تەواوی کێشا. کاتێک گەیشتینە چۆمان پیاوەکەم سەری سووڕمابوو، چونکە هیچ کات ئاگەداریان نەکردبوو ئێمە لە ڕێگەداین. بەڵام من ئێستە خۆشحاڵم، پیاوەکەم کار بۆ شۆڕش دەکات و هێندەشمان پارە لە شۆڕشەوە پێ دەدرێ ژیانمان هەڵسووڕێ. دیارە ئێستە وەک جاران خاوەنی ماڵی خۆمان نین، وەک دەبینی هەموومان لەم دیوەدا دەژین و جێگەکەمان زۆر تەنگە. تازە ئەو کەسەش ئەم ماڵەی پێ داوین خۆی پێویستی پێیەتی بۆ هێندێک خزمی نزیکی خۆی، کە ئەوانیش وەک ئێمە جێگەیەکیان بۆ ژیان نییە. هیوادارم ئێمە لێرە لە چۆمان بتوانین ماڵێک بۆ خۆمان ساز بکەین و تێیدا بژین تا کاتێک دەگەڕێینەوە بۆ کەرکووک. دیارە تا عێراقی لە کەرکووک دەسەڵاتدار بن من ئێرەم لا باشترە و تەنیا لە کاتێکدا دەگەڕێمەوە، کە شۆڕش سەرکەوێ و تێکڕا بگەڕێنەوە.

ئێمە ئێستە لێرە زۆر بێ دەرەتان و هەژارین، من کاتی هەڵاتن جگە لە هێندێک جلوبەرگ، نەمتوانی شتێکی تر لەگەڵ خۆمدا بێنم. هەموو شتێکمان لە کەرکووک بەجێ هێشت و ئێستە بە دڵنیاییەوە عێراقییەکان ڕۆیشتوون و هەموو شتێکی ئێمە و ئەوانەی تریش، کە وەک من رایان کردووە تالان کردووە و خەڵکی تریان بردووەتە ناو ماڵەکەمان. بەڵام ئەمانە زۆر گرینگ نین، تەنیا من بتوانم لەگەڵ بنەماڵەکەمدا بم هەموو شتێکە، ئازادی لە هەر شتێکی تر گرینگترە.

## ئێمە پلان بۆ ئاشتی دەکێشین

پاش نیوەڕۆیەک لەگەڵ شەماڵدا دەڕۆم بۆ گوندی "بەردانگە" کە لە دۆڵەکەی ئەوبەرەوەیە و لە شوێنەکەمان - قەسرولسەلامەوە -دەتوانین ببینین. شەماڵ کارێکی هەیە لە لای کاک حوسێن بەرپرسی ئەنجوومەن و کە گەیشتینە ئەوێ ناوبراو بۆ خواردنی ئێوارە لە ماڵەکەی خۆی، کە لە هەڵدێرێکدا سازی کردووە و بانجێڵەکەی دەڕوانێتە ناو دۆڵەکە، مێوانیمان دەکات. دیمەنی ئەم جێگەیە بە شێوەیەکی سەیر سەرنج ڕاکێشە. پیاو لێرەوە ئاوابوونی خۆر لە داوێنی کێوی "هەڵگورد" یەکێک لە بەرزترین لووتکەکانی کوردستانەوە دەبینێ، سەرەتا کێوەکە بە تیشکی خۆر سوور هەڵدەگەڕێ، دوایە ڕەنگێکی شین دای دەگرێ و دیسان ڕەش دەبێت و دواجار خۆرەکە بە تەواوی ون دەبێت و ئینجا کاتی هەڵبوون و ڕووناکیی ئەستێرەکان دەست پێ دەکات.

ڕۆژی دوایی لەگەڵ سەعدوڵلا دەڕۆم بۆ ئاوایی "وەڵزێ"، ئەم شوێنە گوندێکی ئاساییە و لە ڕاستیدا من گەرەکمە لەم بەشەی کوردستاندا دێیەکی "ئاسایی"ش ببینم.

دەکرێ بە سواری لاندرۆڤێر بڕۆین بۆ ئەم گوندە، بەڵام ڕێگەکەی زۆر خراپە. نزیک ١٠٠ بنەماڵە لەم گوندەدا دەژین و لەبەر ئەوە هەر ماڵە و ٦ - ٧ منداڵیان هەیە مانای ئەوەیە، کە بە ساڵداچووانیشی لەسەر حیسێب کەیت دانیشتوانەکەی دەبنە نزیک ٨٠٠ - ٩٠٠ کەس. بەڵام کاتێک دەڕۆینە ناو گوند دەبینین مەیلەو چۆڵوهۆڵە و تەنانەت ماوەیەک کات دەبات تا دوو پیاوی گەنج دەکەونە بەرچاومان و پرسیاریان لێ دەکەین. ئەم دوو کەسە هەردووکیان مامۆستای منداڵانی گوند، حەسەن ئەنوەر و ئیبراهیم غەفوورن

و ئەوان دەبنە یارمەتیدەرم تا تێگەیشتنێک لەسەر ژیانی خەڵک لەم دێیەدا بە دەست بێنم.

ئەم دوو مامۆستایە چوار ساڵە لەم گوندەن و بە وتەی ئەوان لەم ماوەیەدا ھەژماری دانیشتوانی گوند زیادی کردووە، چونکە خەڵکی تر، کە لە شوێنەکانی ترەوە لە دەست شەڕ و بۆمبارانی دەوڵەت ھەڵاتوون لێرە گیرساونەتەوە:

- دانیشتوانی ئێستەی ئێرە زۆرتر ژن، منداڵ و پیاوی پیرن. ھۆیەکەشی ئەوەیە زۆربەی پیاو پێشمەرگە و لە بەرەی شەڕدان. دیارە ھەر ئێرە وا نییە، ئێستە زۆربەی ھەرە زۆری گوندەکانی تریش وان.

لە ١١ی ئادارەوە، کە شەڕ دەستی پێ کردووەتەوە تا ئێستە ئەم گوندە حەوت جار بۆمباران کراوە. بۆ ماوەی چەندین مانگ زۆربەی خەڵکەکەی لە ترسی فڕۆکە بە ڕۆژ دەچوونە بنی ئەشکەوتان لەو کێوەی سەرەوە تا گیانی خۆیان بپارێزن. تەنیا شەو، ئەو دەمانەی فڕۆکە بە ئاسمانەوە نەبوو دەگەڕانەوە ناو ماڵەکانیان. ئێستەش ھەموو دەترسن لە ھێرشی ھەوایی و دەزانن ھەردەم دەشێ کارەساتێک لێرە روو بدات. بەڵام ئەوان چارەیەکی تریان نییە، لە لایەکەوە دەبێت بێن و ئاگایان لە مووچە و مەزرا و کشتوکاڵیان بێت تا شتێک بۆ بژێویی خۆیان پێکەوە نێن، لە لایەکی ترەوە مانەوە لە ئەشکەوت و بنی بەردان بە ھۆی ھاتنی سەرماوە دژوار و نامومکین بووە. ئەوان نایانەوێ گوندەکەشیان بەجێ بھێڵن.

سەرجەمی دانیشتوانی گوند موسڵمان و گوندەکەیان مزگەوتێکی لێیە. مزگەوتەکە بینایەکی ساکاری لە کوچک ساز کراوە، کە دوو حەوزی جیاوازی ھەیە. یەکیان پیاوان کاتی نوێژکردن ھەموو جارێک دەستنوێژی لێ ھەڵدەگرن، دەست و لاقیانی تێدا دەشۆن و حەوزەکەی تر بۆ خۆشۆردنە، واتا ھەموو لەشیانی تێدا دەشۆن. رەسم و نەریت وایە ھەر کات پیاوان

لەگەڵ ژنەکانیاندا بخەون، دەبێت بەیانی زوو خۆیان لەم حەوزەدا بشۆرن.

قوتابخانەیەکیش لە ئاواییدا هەیە کوڕ و کچ پێکەوە تێیدا دەخوێنن و دەوروبەری ١٠٠ منداڵ، لەوانە ٣٠ کچ تێدا خەریکی وانەن. ئەم قوتابخانەیە بەر لە شەش ساڵ لە لایەن شۆڕشەوە ساز کرا و هەوڵ دراوە بەردەوام کارەکانی بڕۆنە پێش بەڵام لە کاتی بۆمبارانداا ئەویش دادەخرێ و منداڵەکانیش وەک سەرجەمی خەڵکەکە دەڕۆن بۆ خۆشاردنەوە. شەش مامۆستا لەم شوێنە خەریکی دەرس وتنەوەن و ڕۆژانە سات هەشتی بەیانی دەست پێ دەکەن. لێرە جگە لە کوردی، ئینگلیزی و عەرەبییش بە منداڵەکان دەخوێنرێ. بۆ بەشداربوون لەم قوتابخانەیە پارەیەک لە کەس وەرناگیرێ و تەواوی خەرجی لەسەر شۆڕشە. نزیک دە لە سەدی منالانی گوند نایەنە قوتابخانە و ئەمەش زیاتر لە هەژارترین بنەماڵەن کە پێیان وایە پێویستترە منداڵیان لە مەزرا کار بکەن نەک بڕۆنە بەر خوێندن. مامۆستا حەسەن لەبارەی ئەم ناوچەیەوە دەڵێ:

– ئەم بەشەی وڵات لە ساڵی ١٩٦١ەوە هیچ کات لە بەردەستی ڕێژیمدا نەبووە. پێشتر دەوڵەت گوێیان بەم ناوچەیە نەدەدا و نێزیکەی تەواوی نەوەی پێش ئەمانە لەم ناوچەیە نەخوێندەوارن. بەڵام ئێستە ئێمە پۆلی شەوانەشمان بۆ گەورەساڵان داناوە و ژمارەیەکی زۆریشیان فێری نووسین و خوێندن بوون.

پێشی ١٩٥٨ هەموو خاک و موڵکی ئەم ناوە هی زەویدارانی دەوڵەمەند بوو، کە بۆ خۆیان لە شاردا دەژیان، نوێنەریان هەبوو بەسەر جووتیارانەوە دەگەڕا و بەروبوومەکەی بۆ کۆ دەکردنەوە و جووتیارانیش کاریان بۆ ئەوان دەکرد. دوای ریفورمی زەوی، کە شۆڕشی کوردیش بە تەواوی پشتیوانیی لێ دەکرد و تا دوا ساتیش بەشەکەی خۆی خستە بواری کردارییەوە، هەر جووتیارێک بوو بە خاوەنی پارچە زەویی خۆی و دوور لە دەسەڵاتی موڵکدار توانی بۆ خۆی بەرهەمی بێنێ.

مامۆستاکان دوای ئەوە ئێمە بۆ خواردن میوانی دەکەن، دەورێکی گوندەکەشمان لەگەڵ دەدەنەوە. لە دوورەوە گرم و هۆڕێک دەبیستین، کە لە بەرەی شەڕەوە دێت، هەروەک ئەو گوندانەی من پێشتر لە بادینان بینیمن ئەم دێیەش لە لای جۆگەیەکدا ساز کراوە ئاوێکی خاوێن و زوڵاڵی پێدا دەڕوات و لە خوارەوەی گونددا دوو ئاش بە هێزی ئاوی ئەم جۆگەیە دەگەڕێن. لە لای یەکێک لە ئاشەکانەوە ئاوەکە دەڕواتە ناو کەناڵێکی دیوارین و لەوێشەوە دەڕواتە ناو لوولەیەک، کە لە بۆشکەیەکی جۆشکار ساز کراوە. ئاشەکان بە چەرخی ئاوی هەڵناسووڕێن بگرە بە "توربین" کار دەکەن "هارەی" زەبەلاحی بەردینیان هەیە و هەموو ئامرازێکی میکانیکی ئەم ئاشە لە دار ساز کراوە.

دەگەینە لای ژنێک خەریکی نانکردنە و من تا ئێستە هەستم بەوە کردووە لە کوردستان دوو شێوە نان هەیە. جۆرێکیان نانێکی ئەستوور و پڕە و جۆرەکەی تری ناسک و تەسکە. لێرە نان بناخەیە بۆ ژیان و ئەم ژنە ئێستە ئێمە دەیبینین خەریکی سازکردنی نانی تەنک و ناسکە...... (نووسەر زیاتر لە لاپەڕەیەکی تری لەسەر چۆنیەتیی نان و شێوەی سازکردنی نووسیوە، کە من وەرگێڕانی بۆ خوێنەری کورد بە پێویست نازانم. - وەرگێڕ) ئەم نانە تەنکە دوای وشکەوەبوون دەکرێ ماوەیەکی زۆر هەڵی گری و بێ ئەوەی خراپ بێت. ئەگەر هیچ پێخۆریش نەبێت دەکرێ نانی وشک و چا بخورێ و ئەمەش ئاساییترین خواردنی پێشمەرگە لە بەرەکانی شەڕدایە.

دیارە کوردستان ناسراوە بە شتی تریش بۆ نموونە پەنیر، خەڵک لە شیری ئاژەڵەکانیان گەلێک شت و لەوانە پەنیر ساز دەکەن. جگە لەمەش گوێز و هێندێک شتی تر وشک دەکرێنەوە و بۆ زستان، کە میوە و خواردنی تر دەست ناکەون، خەڵک بەم شتانە ساڵ دەبەنە سەر.

ئاژەڵی خەڵک تێکڕا لە لەوەڕگە گشتییەکاندا بەخێو دەکرێن و بۆ هەر ڕانەمەڕێک شوانێک یان دووان هەیە ئاگەداریی ئاژەڵی گشت خەڵکەکە

دەکات. گوندێکی وەک وەڵزێ دوو سێ "مێگەلی" هەیە، کە زۆربەیان مەڕ و بزنن و هێندێکیش گا و مانگا. ئاژەڵی هەموو ماڵەکان دەڕۆنە ناو هەمان "مێگەل" و هیچ کامیشیان دیاری و نیشانە نەکراون بەڵام خاوەنەکانیان دەیانناسنەوە.

ئەو ژنەی خەریکی نانکردنە زۆر جوانە، ناوی ژیان و تەمەنی ٢٥ ساڵە. مێردەکەی ناوی حوسێنە پێشمەرگەیە و ئەوان پێکەوە ٣ منداڵیان هەیە، دوو کوڕ و یەک کەنیشک، کە تەمەنیان پێنج، سێ و یەک ساڵەیە. ژیان قەت بۆی نەلواوە بڕواتە قوتابخانە بەڵام هیوادارە منداڵەکانی ئەو دەرفەتەیان هەبێت و بتوانن بخوێنن. ئەو لە بەختی خۆی رازییە و ئاواتەخوازە ئەم شەڕە هەرچییەک زووتر تەواو بێت و مێردەکەی بۆ هەتایە بێتەوە ماڵ لای ئەو و منداڵەکانی.

خاکی کوردستان زۆر بە پیتە و لە ماوەی ساڵدا دووجار بەرهەمی لێ هەڵدەگیردرێ. تووتن، پەمۆ و برنج لە بەهار و گەنم و گەنمەشامی لە پایزدا دەکێڵدرێن. لە کاتی ئاشتیدا کوردستان زۆر زیاتر لە پێویستییەکانی خۆی بەروبووم و بەرهەمی کشتوکاڵیی هەیە کە دەکاتە گەنم و جۆ تەنانەت بەرهەمی کوردستان بۆ هەموو عێراقیش گرینگترین رۆڵیان هەیە. بەڵام گەنم و جۆ زیاتر لە پێدەشتەکاندا بەرهەم دێت، کە ئێستە لەژێر چنگی رێژیمدایە. ئەوەی هەموو ئەم شتانە بۆ من باس دەکات کەسێکە بە ناوی حەسەن حوسێن، کە جێگری بەرپرسی دایەرەی دابەشکردنی زەوی و ئاودێرییە و ئێستە لە چادرێک لە تەنیشت بەشی راگەیاندن دادەنیشێ. ناوبراو درێژە بە باسەکەی دەدات و دەڵێ:

- لێرە مێوەی جۆرەوجۆر بەرهەم دێ و سێومان تەنانەت لە سێوی لبنانیش باشترن. تەنیا لە دەڤەری دهۆک ساڵانە دە هەزار تۆن سێو بەرهەم دەهات و کاتی خۆی ئێمە بەرهەممان بۆ بەغدا و ناوچەکانی خوارووی عێراق دەنارد.

زیاتر له ٢٠٠٠ کەس له بەشی کشتوکاڵ دامەزراون و سەرەڕای بەردەوامیی شەڕ، خەریکی باشترکردنی بەرهەمهێنان و سازکردنی ئاودێریی دەستین تا جووتیاران لەم ڕێگەیەوە بتوانن بەرهەمیان زیاتر بکەن. حەسەن حوسێن له درێژەدا دەڵێ:

– ئێمە بۆ بەکارهێنان و خستنەگەڕی میتۆد و شێوەی نوێ هیچ گرفتێک نابینین، بەشەرتێک ببێتە هۆی باشتربوونی کارمکەمان. کوردستان هەردەم باوەشی بە ڕووی داهێنانی نوێدا ئاواڵەیە. ئێمە پلان و بەرنامەی دوای شەڕ دادەڕێژین، ئێستە گرینگترین شت ئەوەیە وەک پێویست خۆراک بۆ بژێویی خۆمان ئامادە بکەین، بەڵام دوای شەڕ کشتوکاڵ پەرە دەستێنێ و گەلێک باشتر دەبێت.

من دەڕۆم بۆ خانەقا، کە لە لای ڕێگەکەی لای خوارەوە و لە نزیک بەرەی ڕەواندزدا هەڵکەوتووە. دوو پزیشکی فەرەنساییش بۆ هەڵسەنگاندنی ئاستی پێویستییەکانی خەڵک هاتوون بۆ کوردستان دەڕۆن بۆ ئەوێ و منیش لەگەڵیاندا دەڕۆم. من بۆ خۆم هێندێک لەم تاقم و دەستانە، کە ئەمسەر و ئەوسەری دنیا دەگەڕێن تا دیاری بکەن لە کوێ دەرد و ئازار زۆرترینە، دڕدۆنگ بووم بەڵام ئەم پزیشکانە بە ڕاستبێژی و تێگەیشتنی دروستی خۆیان، کە لە دەرخستنی هاودەردییان لەگەڵ ئەم خەڵکەدا دەردەکەوێ، کاریگەرییان لە من کردووە تا پێچەوانە بیر نەکەمەوە لەبارەیان. ئەمانە سەر بە ئۆرگانێکن بە ناوی "پزیشکانی بێ سنوور". ژمارەی ئەندامانی ئەم ڕێکخراوە چەند سەد کەسێکە و لە هەر شوێنێکی ئەم دنیایەدا یارمەتیی ئەوان پێویست بێت ئەوان ئامادەن بگەنە جێی مەبەست.

ئێمە سەردانی نەخۆشخانەی خانەقا دەکەین، دەردەکەوێ تەنیا کەپرێکە و لە هەڵدێر و لالێژێکەوە ساز کراوە. دوکتۆر" فەیسەڵ نەقشبەندی"، کە ڕاستەوخۆ لە زانسگەی بەغداوە هاتووە و تێکەڵی شۆڕش بووە لێرەدا خەریکی خزمەتە. دوکتۆر فەیسەڵ تەنانەت کورسی یان مێزێکی نووسینی

نییە. " نەخۆشخانەی ئەم دوکتۆرە بۆ پێشوازی و تیماری بریندارانی بەرەی شەڕ، کە لەوبەری کێوەکەوەیە، تەرخان کراوە. ڕۆژانە دە بریندارێکی بەرەی شەڕ، دوای شەش حەوت سات بە سواری هێستر دەگەنە ئێرە و دەبێت تیمار و چارەسەر بکرێن. دوکتۆر فەیسەڵ کارە سەرەتاییەکانی ئەم بریندارانە، وەک خاوێنکردنەوەی برین، پێشگری لە خوێن و پێچانی برین دەکات و دوایە بەرێیان دەکات بۆ نەخۆشخانەی چۆمان.

لە کاتێکدا ئێمە لەژێر کەپرەکە دانیشتووین، بریندارێک، کە پێشمەرگەیەکی گەنجە بە سواریی هێسترێک دەگاتە لامان، لاقی بە بەر پارچەی تۆپ کەوتووە و بە توندی خوێنی لەبەر دەڕوات. نەقشبەندی برینەکەی بۆ دەشوا، پەڕۆیەکەی دەگۆڕێ و دواتر بریندارەکە بە یارمەتیی هاوڕێیەکی و گۆچانێک دەست بە ڕێگە ڕۆین دەکات.

لە خوار شوێنەکەی دوکتۆر نەقشبەندییەوە، تاقمێک پێشمەرگە ڕاوەستاون و دەردەکەوێ لە بەرەی شەڕەوە دێن، تەرمی پێشمەرگەیەکی کوژراویان پێیە سواری هێسترێکە. هێندێک ڕادەوەستن، دوایە چەند پیاو تەرمەکە هەڵدەگرن، زۆر ئارام و بە سەرنجێکی تایبەتەوە دەیگوازنەوە و دەیخەنە ناو لاندرۆڤێرێک و بەڕێی دەکەن.

لە ڕێگەی گەڕانەوە لادەدەینە گوندی "واوسان"، کە دوو سائێک لە ڕێگەکەمانەوە دوورە. بە شەتاوێکدا هەڵدەگەڕێن، جاروبار گرم و هۆڕی چەکەکانی بەرەی شەڕ و دەنگی فڕۆکەی دەوڵەتی عێراق دەبیستین. لەم گوندە تووشی کۆمەڵێک هونەرمەند دەبین لەناو باخەکانی ئەم ئاواییەدا خەریکی کاری مۆسیقان و گرووپێکیان پێک هێناوە بە ناوی "گرووپی مۆسیقای شۆڕش". هەموو ئەمانەش دوای دەست پێکردنەوەی شەڕ لە ١١ی ئاداردا تێکەڵی شۆڕش بوون. من لەگەڵ یەکێک لەم هونەرمەندانە بە ناوی "خالید ئەحمەد؟" کەمانچەژەن و خەڵکی سلێمانی قسە دەکەم:

- کەسی پسپۆڕ و تازەکاریش لەم گرووپەی ئێمەدا بەشدارن و ئێمە هەموو جۆرێکی مۆسیقا، مۆدێرن و کلاسیک لێ دەدەین. هەروەها گشت ئالەتێکی مۆسیقاش وەک، کەمانچە، فلوت، گیتار، شمشاڵ، کە ئامێرێکی تایبەتی کوردییە بەکار دێنین. مۆسیقای کوردی ریشە و ریتمی تایبەت بە خۆی هەیە، زۆر هاسانە مۆسیقای کوردی لە عەرەبی جیا بکەیتەوە، چونکە لە راستیدا هیچ لێکچوونێکیان نییە. خەڵکی کورد زۆر تێکەڵاوی مۆسیقان و لە راستیدا دەکرێ هەموو کورد بینە مۆسیقار!. مۆسیقا لای ئێمە زۆر گرینگە، رەنگە لەبەر ئەوە بێت لەو رێگەیەوە دەتوانین هەستی خۆمان دەربڕین، شتە نەوتراوەکان باس بکەین، یەکەتی و یەکپارچەیی لەناو خۆماندا پێک بێنین و بە ڕاستی من پێم وایە مۆسیقا بەشێکە لە سروشتی خەڵک لێرەدا، وڵاتی ئێمە زۆر جوانە و مۆسیقاش تێکەڵاوی جوانییەکانە.

من دواتر، کاتێک لە قوتابخانەی گوندەکەدا خەریکی پرۆڤەن گوێیان لێ دەگرم، ئێستە ناتوانم باسی چۆنیەتیی مۆسیقای ئەوان بکەم بەڵام تێ دەگەم ئەم جۆرە مۆسیقایە هەڵقوڵاوی ناخی ئەم وڵاتەیە کە لاواندنەوە، باسی جوانی و شادی و خەم، پێکەوە دەکات.

من بە تەنیا ئەم رێگەیە دەگرمە بەر و دەگەڕێمەوە، ئەوانی تر بڕیارە دواتر بێنەوە. لەزەت لەم رێگەبڕینە دەبەم، کە جارجار لەبن سێبەرێکدا بۆ حەسانەوە لادەدەم، بە ئاوێکی سارد خۆم فێنک دەکەمەوە و تا نێزیک یاڵەکە لە دوورەوە دەنگی مۆسیقاکەی ناو گوند دێتە گوێم. هاوکات گرم و هۆڕی بەرەی شەڕیش تێکەڵی ئەم دەنگە خەیاڵییە دەبێت. لە کۆتایی رێگەکەمدا سەگی لای رانەمەڕێک دەبینم، کە لە بەرزاییەکەوە هەموو دەر و دۆڵی خستووەتە ژێر چاودێری و کاتێک چاوی بە من دەکەوێ بە ئارامی و بە راوەشاندنی دووی بە روانینێکی وردی "سەگانە" بەخێرهاتنم دەکات.

## ئەوڕۆ ئێمە سەری مارەکەمان پان کردووەتەوە

سەرهەڵدانی چەکدارانەی کورد ١١ی ئەیلوولی ١٩٦١ دەستی پێ کرد و ئەوەش کە بوو بە هۆی تەقینەوەی ئەم سەرهەڵدانە دیکتاتۆری سەرکوتکارانەی جەنەراڵ عەبدولکەریم قاسم بوو.

بەڵام سۆنگە و هۆی سەرهەڵدانی کورد بۆ گەلێک دواتر دەگەڕێتەوە. ساڵی ١٩٢١ بەریتانیا دەوڵەتی عێراقیان لە ئەیالەتی مووسڵ و باشووری میزۆپۆتامیا ساز کرد، کە پێشتر بەشێک بوو لە ئیمپراتۆری عوسمانی. ساڵی ١٩٢٥ چارەسەرییەکی دڵخوازیی خۆیان بۆ کێشەی کورد سەپاند و کورد لەبەر ئەوە هیچ پرسێکیان لەم بارەوە پێ نەکرابوو بەم کارە ناڕازی بوون. دیارە هەر ئەو کات دەوڵەتی عێراق بەڵێنی بە "کۆمەڵەی نەتەوەکان" دابوو کە مافی کورد و داخوازیی ئەوان بۆ خۆبەڕێوەبەری بپارێزێ و قبووڵ بکات. بەڵام هیچ کام لەم بەڵێنانە نەچوونە بواری کردارییەوە و بە پێچەوانە کورد هەر لە سەردەمی شێخ مەحموودی حەفیدەوە ١٩١٩ - ٢٣ تا سەرهەڵدانی بارزانی ١٩٣١ - ٣٣، کە لە لایەن سوپای عێراق و بە هاوکاریی هێزی هەواییی ئینگلیزەوە سەرکوت کرا، بە توندی لەژێر وشاری دژواردا بوون. سەرهەڵدانێکی تر ساڵی ١٩٤٣ لە بارزان دەستی پێ کردەوە و تا ساڵی ١٩٤٥ بەردەوام بوو، دیسان دەوڵەتی ئەو کاتی نووری سەعید بەڵێنی دا، کە پێشوازی لە داخوازییەکانی کورد بکات، بەڵام دیسان ئەمەش بە کوشتار و وەڕێخستنی گۆمی خوێن کۆتاییی پێ هات.

لە ئەیلوولی ١٩٤٦دا پارتی دیموکراتی کوردستان، بە نیازی هەوڵدان بۆ ڕزگاریی کورد و گەیشتنیان بە مافەکانیان پێک هات. هەر زوو ئەم پارتییە

نوێیە لە لایەن دەوڵەتی عێراقەوە قەدەغە کرا و بە ناچار درێژەی بە خەباتی ژێرزەوینی دا. شۆڕشی ١٤ی تەمووزی ساڵی ١٩٥٨، کە لە لایەن هێندێک ئەفسەرەوە بەڕێوە چوو و بوو بە هۆی رووخانی دەسەلاتی مەلیک فەیسەڵ و سەرەک وەزیرەکەی نووری سەعید، سەرەتا سەرکەوتنێک بوو بۆ کورد و داخوازییەکانیان. لە پەرەگرافی سێیەمی یاسای بنەڕەتیی عێراقدا هاتبوو "دەوڵەتی عێراق لە لایەن عەرەب و کوردەوە دامەزراوە" و وەک دوو گەلی یەکسان باسی کورد و عەرەب کرابوو. بەلام هاوکات لە پەرەگرافی دووەمی ئەم یاسایەشدا دژی پەرەگرافی سێیەم دەوترا، کە "عێراق بەشێکی جیانەکراوەی دنیای عەرەبە". هەر لە سەرەتای ساڵی ١٩٥٩ەوە کورد تێ گەیشتن، کە "کودەتا" ئەوەی لێ شین نەبووەوە ئەوان چاوەڕوانی بوون. لە دەسەلاتی نوێدا هیچ جێگە و نوێنەرایەتییەک بۆ ئەوان دیاری نەکرا، نە لە دەوڵەت، سوپا یان بەڕێوەبەرییەکانی تردا و دیسان وەکو پێش وەک گەل و نەتەوەیێک حیسێب بۆ داخوازییەکانیان نەکرا.

پارتی دیموکراتی کوردستان لە رێگەی راگەیەندراو، خۆپێشاندان و کاری تری ئاشتییانەوە هەوڵی دا جەنەراڵ قاسم بێنێتە سەر ئەو بڕوایە، کە مل بە داواکانی ئەوان بدا، لانی کەم بەشێکیان، کە زۆریش سادە و ساکار بوون بکا، بەلام کەڵکی نەبوو و بە پێچەوانەوە لەژێر رێبەریی جەنەراڵ قاسمدا نەک هەر ئەم گرفتە بە چارەسەرنەکراوی مایەوە بگرە عێراق رێگەی وێرانی و رووخانی گرتە پێش.

ریفۆرمی زەوی، کە یەکێک لە بەرنامە سەرەکییەکان بوو و بە پێی بڕیار دەبوو لە سەراسەری عێراقدا بەڕێوە بچێ، خراپ رێک خرا و ئاکامی پێچەوانەی لێ کەوتەوە. بەشێکی زۆری خەڵکی لە دەسەلات نارازی کرد و بە پیت و بەرەکەتترین شوێنەکانی ولات بە نەکێڵدراوی و بێ بەهرە مانەوە و ناچار عێراق دەبووا شتی وەک، گەنم، جۆ و گەنمەشامی کە پێشتر دەناردانە دەرەوە ئێستە لە دەرەوە بکڕێ.

هەمــوو هەوڵـی قــاسـم ئەوە بوو بـە هـەر نرخــێک بـێ لەســەر کــورســیـی دەســـەڵات بمێنێــتـــەوە. نـاوبراو گـــشـت نەیارانی خـــۆی وەک بـەعــسـی، ناسیـۆنالیسـتی عـەرەب، ناسری و سـەرەنجـام کۆمۆنیسـتـەکانیشی، کە سـەرەتا لـە دژی بزاڤی کورد هاوکـاری بوون سـەرکوت کـردن. دوای هـەمـوو ئەمـانە بە گشت هێز و توانایەوە هێرشی کردەوە سەر کورد. بە هاوکـاریی نیـشـتمـان فرۆشـانـی کـورد دەسـتی بـە پڕوپاگەندە و کـڕینی خـەڵک کـرد و گەلێک کەسی لە بەرانبەر پارەیەکی زۆر دا لە دژی شـۆڕش چەکدار کرد تا ترس و دووبەرەکی لەناو کـورددا سـاز بکات. هێـزە ئەمـنیـیـەکـانـی نـارد بۆ شارەکانی کـوردستان تا خەڵکیان پێ بترسێنێ و رووناکبیران، مامۆستا و قوتابیانی بە کۆمەڵ گرتن و رەوانەی زیندانی کردن.

لەو ماوەیەدا، کە دەوڵەتی قاسم خەریکی ئەو کارانە بوو، پارتی دیموکرات و جـەنـەراڵ بارزانی هـەوڵیـان دەدا قـاسم واز لـەم سـیـاسـەتانە بێنێ بەڵام ئاکـامـێکی دڵخـواز بە دەست نەهـات. دیکتـاتۆر بڕیاری دابوو بـزووتنەوەی کورد کە ئیدی وەک تاقە ئۆپۆزسیۆنی ئەو هێشتا درێژەی بە ژیان دەدا، تێک بشکێنێ. لە ئەیلوولی ١٩٦١دا هێـزی نارد بۆ بارزان و کـۆیە. کـورد یەکـەم هێرشـەکـانـی دەوڵەتیـان تێک شکاند و دوای ئەمـە قـاسم شـەڕی تەواوی لە دژی "سـەرهەڵداوان"دا راگـەیاند. دوو حـەفـتـە دواتر قـاسم رای گـەیاند، کە سـەرهەڵدانێک " لە لایەن ئینگلیز و ئیمپریالیستەکانەوە ساز کرابوو" تێک شکێنرا و بارزانی هەڵاتووە بۆ ئەو دیوی سنوور.

بەڵام شتـەکە بەم شێوەیە نەبوو، بە پێچەوانە لە سـاڵی ١٩٦٣دا دەوڵەتی قـاسم وا لاواز و سـوپای عێراق وا شپرزە بووبوون کە بەعس بە هاوکـاریی ژمـارەیەک ئەفسـەری ناسیـۆنالیست تـوانییـان کودەتای بەسـەردا بکەن و دەسـەڵاتەکەی بڕووخێنن. سـەردەسـتـەی کـودەتاچییـان کـەسێک بوو بە ناوی عــەبدولســەلام عــارف، کــە داوای ئاگــربەس و دیالۆگی لە کــورد کــرد و

دانوستاندنی لەگەڵ پارتیدا دەست پێ کرد بۆ گەیشتن بەجۆرێک ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان.

دیسانەوە ئەم هەوڵ و هەنگاوانەی دەوڵەتی نوێ لە دڵەوە نەبوو و دەرکەوت تەنیا بۆ تێپەڕاندنی کات بووە، چونکە لە سەرەتای هاوینی ئەو ساڵەدا سوپای عێراق تێکڕا و بە پشتیوانیی لەشکرێک سەرباز و تەواوی هێزی هەواییی سووریا، بە ئامانجی لەناوبردنی هەتا هەتاییی جووڵانەوەی کورد لە باکوری عێراق و بۆ ئەوە "عێراق بۆ ناوی راستەقینەی عەرەبی خۆی" بگێڕنەوە، هێرشیان بۆ سەر کوردستان دەست پێ کردەوە.

لە سەرەتای پیلانەکەدا وەزیری بەرگریی عێراق، جەنەراڵ ساڵح مەهدی عەماش (کە ئێستە باڵوێزی عێراقە لە پاریس) رای گەیاند:

سوپای ئێمە بە هێز و چەک و چۆڵی پێشکەوتوو و مۆدێرن، روو لە باکور دەکەین و هەموو چەتە و سەربزێوەکان لەنێو دەبەین. سوپای ئێمە وەک ئاوخواردنەوە لەم ئەرکەیدا سەردەکەوێ.

بەم شێوەیە بوو یەکێک لە رەشترین لاپەڕەکانی مێژووی کورد دەستی پێ کرد. لە یەکێک لە رۆژەکانی سەرەتای تەمووزی ئەو ساڵەدا لە شاری سلێمانی ١٨٣ پیاوی بێتاوان گیران. ئەم کەسانە کە لە تەمەنی جۆرەوجۆردا بوون گوازراونەوە بۆ جێگەیەک بە ناوی "گردی سەیوان" لە دەرەوەی شار، تێکڕا گوللەباران کران و فڕێ درانە ناو گۆڕێکی بە کۆمەڵەوە. ئەم گۆڕە شەش مانگ دواتر لە لایەن بنەماڵەی قوربانییەکانەوە هەڵدرایەوە و هەر کەسە ئازیزی خۆی بە جلەکانی ناسییەوە.

لە "کۆیە" و شوێنەکانی تردا خەڵکیان بە دارەوە هەڵدەواسی و کاتێک سوپای عێراق گەیشتنە گوندێکی نزیکی رانیە، مەلایەک بە چەند منداڵەوە، کە هەر کامەیان گوڵێکی بە دەستەوە بوو لە سەربازەکان پاڕایەوە خەڵکی گوندەکە نەکوژن. لەژێر فەرماندەریی کەسێکدا بە ناوی جەنەراڵ "تەها

شـەكەرچـی" خـەڵكەكە درانە بـەر دەسـتـڕێژی گـولله و ١٥ منداڵ و مـەلاكـە كوژران. بەعسییەكان شێوەیەكی بە تەواوی "نوێی شەڕكردنیان" لەم بارەوە داهێنا، ئەویش ئەوە بوو منداڵ و پیاوی پیریان دەبەستە تانكەكانیانەوە تا لە كاتی كەوتنە داوەوە پێشمەرگەی كورد نەتوانن هێرشیان بكەنە سەر.

بەلام لە تشـرینی دووەمـی ئەو سـاڵەدا، واتـا دوای نزیك بە شـەش مـانگ شـەڕ سوپای عێراق جارێكی تر لە هێرشـەكانیدا بۆ لەناوبردنی كورد تێ شكا. كـاربەدەسـتـانی بەغـدا هاتنە سـەر ئەو بڕوایە، كـە بەم شـێـوەیەش ناتوانن بەرخۆدانی كورد تێك بشكێنن. دیارە سوپا لەم ماوەیەدا توانیبووی هێندێك سـەركەوتن بـە دەست بێنێ و گەلێك نـاوچە لەوانە بارزان و ئامێدی بخـاتە دەست خـۆی، بەلام بەربەرەكـانێ و خـۆڕاگـری هـەر بـەردەوام بوو و دەركەوت ورەی بەرز و شێلگیریی پێشمـەرگە لەسەر خۆپاراستن گرینگترین فـاكتـەرە لەم بارەیەوە. سـوپای عێراق جارێكی تـر زۆر لەوە نزیك بووبوویەوە بە تەواوی تێك بشكێ، بۆیە ناچـار دیسـان ڕێگەی دانوسـتـاندنیـان گـرتەوە پێش و بەڵێنی چارەسـەری كێشەكانیان بە كورد دایەوە. كورد كە دوو ساڵ بوو لە شـەڕەوە گلابوون ئامـادە بوون، وەلامی هـەر بانگەوازێكی ئاشـتـیـیـانە بدەنەوە.

دیسـان دەركـەوت دانیشتنەكانی نێوان میری و كورد بێ ئاكام بوون و جـەنـەراڵ عـارفـیـش وەك دەسـەلاتدارانـی پێش خـۆی تەنیـا مـەبەسـتی خۆڕێكخستنەوە و تەیاركردنەوەی سوپاكەیەتی بۆ هێرشێكی بەربلاوتر بۆ سـەر كـورد. بۆیە دوای مـاوەیەك دیسـان شـەڕ لە كـوردسـتـان دەسـتی پێ كـردەوە و تا سـاڵی ١٩٦٥، كـە جـەنەراڵ عـارف لە ڕووداوێكی گـومـاناویی داكەوتنی هەلیكۆپتەر، لە نزیك شاری بەسرەدا كوژرا، درێژەی كێشا.

دوای مـردنی عـارف دەسـەلات كـەوتە دەست بـراكـەی واتا مـوشـیـر عەبدوڕەحمان عارف، كە بوو بە سەركۆمار و سەرەكی ئەنجوومەنی شۆڕش.

سەرەک وەزیری دەوڵەتی نوێی عێراق نەقیب تالب (یەکێک لەو ئەفسەرانەی، کە پلانیان بۆ شۆڕشی ١٩٥٨ دانا) دەستی کرد بە وتووێژی نوێ لەگەڵ کورددا بێ ئەوەی مل بە هیچ کام لە داواکانیان، تەنانەت ساکارترینیشیان بدات. شەڕ دیسان دەستی پێ کردەوە و دوای ماوەیەک و بۆ جارێکی تر سوپای عێراق لاوازتر لە جاران ڕێگەی دانوستاندنی بۆ کورد پێشنیاز کردەوە.

لە مانگی حوزەیرانی ساڵی ١٩٦٦ عەبدوڕەحمان بەزاز، پرۆفیسۆرێکی دەرسخوێندووی ئینگلیز و تاقە سەرەک وەزیری سیڤیلی عێراق دوای ساڵی ١٩٥٨ دەستی بە گوتوبێژ لەگەڵ کورددا کرد و لەگەڵیاندا گەیشتە ڕێککەوتنێک، کە بە ڕێککەوتنی دوازدە مادەی حوزەیرانی ١٩٦٦ ناسراوە. بەزاز لەم ڕێککەوتنەدا ملی بە هێندێک لە داخوازییە بنەڕەتییەکانی کورد دا بێ ئەوەی وشەی "خۆبەڕێوەبەری"ی باس بکا.

سوپای عێراق پارەیەکی فرەوانی لەم شەڕە دەست کەوتبوو. هەروەها سوپا هەر لە سەرەتاوە گرینگییەکی زۆری دەدا بە هاوکاریی هێندێک لە عەشیرەتە کوردەکان کە لەگەڵ شۆڕش، پارتی دیموکراتی کوردستان و مستەفا بارزانی لە دوژمنایەتیدا بوون. ئەم عەشیرەتانە لە لایەن دەوڵەتەوە چەکدار کران تا وەک چاوساغی سوپا لە شەڕی دژی پێشمەرگەدا کار بکەن و بۆ ئەم خزمەتەشیان لە دەوڵەت پارەی چاکیان وەردەگرت. ئەم دیاردەیە لە درێژەی شەڕدا پەرەی گرت و لە هەر ناوچەیەکدا فەرماندەی سوپای ناوچەکە بە مەیلی خۆی لیستێکی لە ناوی (ساختەی) خەڵک ئامادە دەکرد و بۆ کاربەدەستانی دەنارد و بە پێی ژمارەی ناوەکانیش پارە و خۆراکی لێ وەردەگرتن. ئەم لیست و ناوانە، کە هیچ کات کۆنترۆڵ نەدەکران و لە ڕاستیدا گەلێک جار هەر بوونیشیان نەبوو، بۆ خۆی بووبووە سەرچاوەیەکی گرینگی دارایی بۆ ئەفسەر و جەنەراڵەکانی سوپا کە لە نێوان خۆیاندا دابەشیان دەکرد.

بۆیە لەناو سوپادا گەلێک لایەن خوازیاری درێژەدانی شەڕی کوردستان بوون بۆ ئەوەی دەرفەتی چەپاو و تالآنیان بمێنێ. بەشێکی زۆری بەرپرسانی سەرەوە، بۆ نموونە بنەماڵەکانی تاهیر یەحیا، عەبدوڕەحمان عارف و عەبدولسەلام عارف بۆ خۆشیان لەم گەندەڵییەوە گلا بوون.

لەبەر ئەمە بەشێک لە ئەفسەرانی سوپا دژی ئەو رێککەوتنە بوون، کە "بەزاز" لەگەڵ کورددا کردبووی و بووبووە هۆی راوەستانی شەڕ، کەوتنە بیری لابردنی ناوبراو و کەسێکی نێزیک لە خۆیان لە جێگەکەی دانا، کە ناوی عارف عەبدوڕەزاق بوو و بەڵێنی دا شەڕ لە کوردستان دەست پێ بکاتەوە. جەنەراڵ فەیسەڵ ئەلئەنساری و ئیبراهیم ئەلعوقەیلی، کە هەردووک لە ئەوروپا خوێندبوویان، لەبەر خۆیانەوە پیلانێکیان بۆ نەهێشتنی "ئەفسانەی بارزانی" داڕشت. سوپا بە چەکی نوێ پۆشتە و پەرداخ کرا و بڕیاری سیستەماتیکی وێران و چۆڵکردنی هەموو گوندەکانی کوردستان کەوتە بواری کردارییەوە. پێش لە هەر هێرشێکی سوپا هێرشی تۆپخانە و بۆمبارانی فڕۆکە دەستی پێ دەکرد. پلانەکە ئەوە بوو ناوچە کوردییەکان لێک داببڕێن و خاڵی لەتکردنیش جادەی هاملتۆن لە رەواندزەوە بۆ حاجی ئۆمەران دانرابوو.

بەڵام شەڕە گەورەکەی هەندرێن لە سەرەتای بەهاری ١٩٦٦ەوە بوو بە خاڵی وەرچەرخان و سوپای عێراق زیاتر لە ١٥٠٠ کەسی لێ کوژرا، کە بوو بە هۆی رووخانی ورەیان و تا کەرکووک و لەوێشەوە بۆ بەغدا پاشەکشەیان کرد.

ئەم تێکشکانەی دەوڵەت دەورەیەکی بۆ ئاشتییەکی لەرزۆک خوڵقاند، شەڕ بەردەوام مایەوە بەڵام نەک لە ئاستی پێشوو. میری جارێکی تر بەڵێنی چارەسەری کێشەکەی دا و رای گەیاند ئامادەیە هێندێک لە داخوازییەکانی کورد قبووڵ بکات. جەنەراڵ عەبدوڕەحمان عارف، سەرکۆماری عێراق بۆ

خـۆی هـات بۆ کـوردسـتـان، جـەنەراڵ بارزانیی بینی و کـۆمـەڵێک ڕێککەوتنیـشیـان پێکەوە مـۆر کـرد. بەڵام دیسـانـەوە ڕێبـەرانی سـوپا دژ دەرکـەوتن و بـوونە هۆی سـەرنەگـرتنی ڕێککەوتنەکـان. بۆیە هیـچ کـام و تەنانەت تاقە یەک دانە لە بەڵێنەکانی دەوڵەت جێبەجێ نەکران، بە پێچەوانە هەوڵ درا برازاقی کورد پارچە بکرێت و ئاژاوە لە کوردستاندا ساز بکرێ، تا بیانوویێک بێت بۆ دەست تێوەردانی سوپا.

دیارە لەم مـاوەیەدا دەوڵەت زۆر لاواز بووبوو و نەیدەتوانی هیـچ کـام لە داخوازی و پێویستییەکانی خەڵک جێبەجێ بکات، بەعس، کە ساڵی ١٩٦٣ مـاوەیەکی کـورت دەسـەڵاتدار بوون و کـردەوەیـان بووبووە مـایەی بێـزاریی خـەڵک، توانیـیـان لە ١٧ی تەمـووزی ١٩٦٨دا دەسـەڵات بگرنـەوە دەست و دیارترین کەسیان، ئەحمەد حەسەن بەکر، کە لە ١٩٦٣ سـەرەک وەزیر بوو، ئێستە وەک سەرکۆمار هاتەوە سەر حوکم.

ڕاستی حزبی بەعس چی شتێکە لەو دەمەوە تا ئێستە بووەتە گەورەترین دوژمنی کـورد؟ ناوی ڕەسـمـیی ئەم حـزبە "حـزبی بەعـسی سۆسـیـالیـسـتی عـەرەب"ە و گەلێک "کارناسی دەرەوە" و لەوانە لە سوێد پێیان وایە حزبێکی سۆسیالیستە. پێم وایە هیـچ شـتێک لە دنیادا ناتوانێ لەم بۆچوونە هەڵەتر بێت، چونکە ڕاسـتی حـزبی بـەعس بە تـەواوی نـاسـیـۆنالیـسـت و سەرچاوەکەشی بۆ تاقمێکی فەناتیکی ناسیۆنالیستی عەرەبی دەگەڕێتەوە. ئەم حـزبە بناخەی کرداری لەسـەر پیلانگێڕی دامـەزراندووە و بە توندی دژی دیموکراتییە. بە ئاشکرا و بێ شەرمانە لە هەر شێوەیەک کەڵک وەردەگرێ تا دەسـەڵاتی خۆی بەسـەر خەڵکدا ڕاگرێ و نەیارانی خۆی بە کوشتن، گرتن و تیرۆر بێدەنگ بکات.

ئیـدیۆلۆجیی حـزبی بەعس لە نازیزم و فـاشـیزمـەوە سـەرچاوە دەگـرێ، دژایەتیی ئەم حزبە لەگـەڵ کۆمـۆنیـزم لەو سـەرچاوەوەیە، بەڵام هـەروەک چۆن

هیتلەر ساڵی ١٩٣٩ بۆ پێشخستنی پلانی خۆی، پەیمانی لەگەڵ ستالیندا بەست، بەعسییەکانیش خۆیان گۆڕیوە و خۆیان کردووەتە هاوپەیمانی یەکەتیی سۆڤیەت. بەعسی هەوڵێکی زۆر دەدەن تا لە دەرەوە پێگەی خۆیان بەرنە سەر و هەر بۆ ئەو مەبەستەش بنکەیەکیان لە بەیرووتی لبناندا داناوە تا لەو بارەوە کار بکات.

حکوومەتی تازەی بەعس پێشنیازێکی نوێی بۆ ئاشتی خستە بەردەستی کورد، کە سەرەڕای دوودڵی و بێ باوەڕییان بەم دەوڵەتە، بە ناچاری قبووڵیان کرد. شەڕ کەلێک وێرانیی لەگەڵ خۆیدا هێنابووە کوردستان و گەمارۆی ئابووریی دەوڵەتەکانی عێراق کوردی تووشی برسیەتی کردبوو، دوکتۆر و دەرمان و نەخۆشخانە پێکەوە پێچرابوون و بەشی هەرە زۆری قوتابخانە لە ترسی شەڕ و لەبەر نەبوونی پێداویستی داخرابوون. ئەوان ساڵ دوای ساڵ تووشی شەڕێکی ناهاوسان بووبوون بێ ئەوەی دنیای دەرەوە بچووکترین گوێ بداتە چارەنووسیان.

بەڵام ئەم جارەش هەروەک سەردەمی دەسەڵاتدارانی بەرێ، کارەکە تەنیا بۆ کاتکڕین و فریودانی کورد بوو. نیەت و مەبەستی گەیشتن بە ئاشتی و چارەسەرێکی ئاشتییانە لە لای دەوڵەتەوە بوونی نەبوو. پاش تێپەڕینی ٣ مانگ و دوای ئەوە دەرفەتیان دەست خست سوپاکەیان رێک خەنەوە و درێژەدانی شەڕ لە خۆیاندا ببینن، دیسان دەستیان کردەوە بە لەشکەرکێشی بۆ سەر کوردستان. دڕندەیی و بێ رەحمیی هێرشی ئەم جارە سنووری هەموو تاوانەکانی تری دەوڵەتی عێراقی بەزاند. لە مانگی ئەیلوولی ساڵی ١٩٦٩ دەستەیەک سەربازی عێراقی، دوای ئەوە لە شەڕێکی هێزی پێشمەرگەدا تێک شکابوون گەیشتنە گوندی "داکان" لە نزیک شاری دهۆک. هەموو ژن و منداڵی ئەم گوندە بۆ خۆشاردنەوە پەنایان بردبووە بەر ئەشکەوتێک لە نێزیک گوندەکە. سەربازە عێراقییەکان هاتن لە پێش ئەشکەوتەکە ئاگریان کردەوە و هەر کەسێک لەم خەڵکە بێ دەسەڵاتە

دەیویست خۆی لە بە زیندوویی سووتان رزگار بکات دەکەوتە بەر گوللەی ئەم سەربازانە و گیانی لێ دەسەندرا. لە ئاکامی ئەم کردەوەدا ٦٥ کەس ژن و منداڵی ئەم گوندە بەم شێوەیە کوژران.

لە سەرەتای ساڵی ١٩٧٠دا دەسەڵاتی بەعس هاتە سەر ئەو بڕوایە، کە بەم شێوەیە سەرکەوتنێک بەدی نایە و بە نیازی ملدان بە داخوازی ئۆتۆنۆمیی خەڵکی کورد دەستی کرد بە گوتوبێژ لەگەڵ شۆڕش، پارتی دیموکراتی کوردستان و جەنەراڵ بارزانی.

١١ی ئاداری ١٩٧٠ رێککەوتنێک لە لایەن هەردووک لاوە ئیمزا کرا، کە لە ١٤ خاڵ پێک هاتبوو و بە پێی ئەو رێککەوتنە دەبووا ئۆتۆنۆمیی کوردستان لە ماوەی چوار ساڵدا رابگەیەنرێ، کورد دەبووا ئازاد بن لە کاروباری خۆیاندا، بەڕێوەبەری خۆیان هەڵبژێرن، نەخۆشخانە، قوتابخانە و. . . خۆیان هەبێ و دەوڵەتی ناوەندیش بڕیار لەسەر دەرهێنان و فرۆشتنی نەوت، سیاسەتی دەرەوە و پارێزگاری لە وڵات بدات.

کورد ئەم جارەش زوو بۆیان دەرکەوت کە ئەم رێککەوتنەش لە لایەن دەوڵەتی بەعسەوە تاکتیکییە. گەلێک بەڵگە بۆ ئەم بانگەشەیە لە بەردەستدان بۆ نموونە:

- چوار حەفتە دوای مۆرکردنی ئەم رێککەوتنە، بنکەی ناوەندیی پارتی دیموکراتی کوردستان لە مووسڵ کەوتە بەر هێرش و ژمارەیەک لە ئەندامانی ئەو پارتە کوژران. هیچ لێکۆڵینەوەیەک لەم بارەیەوە نەکرا و هیچ کەسیش لەسەر ئەم کارە نەگیرا و دادگایی نەکرا.

- پێنج کورد دیاری کران بۆ بەشداری لە دەوڵەت بەڵام هیچیان بۆ ئەندامەتی لە ئەنجوومەنی بەڕێوەبەری شۆڕش، واتا بڕیاردەری راستەقینەی وڵاتدا رێگەیان پێ نەدرا. ئەنجوومەنی بەڕێوەبەری شۆڕش لە سەریەک ١٧ ئەندامی هەبوون، کە تێکڕایان ئەندامی حزبی بەعس بوون. دەوڵەت لەم

ناوەدا تەنیا ئەرک و کاری ئەوە بوو گوێ لە ئەنجوومەنی ناوبراو بگرێ و بڕیارەکانی جێبەجێ بکات.

- لە پەیمانەکەدا دەوڵەت بەڵێنی دابوو یارمەتیی ئاوەدانکردنەوەی کوردستان بدات و قەرەبووی ئەو زیانانە بکاتەوە کە لە شەڕدا بەر خەڵک کەوتوون. بەڵام هیچ کام لەم بەڵێنانە نەبوونە کردار. لە هەزاران بنەماڵەی ئاوارە و زیان بەرکەوتووی کورد تەنیا هەژمارێکی زۆر کەم قەرەبوو کرانەوە.

دیارە دەبێ ئەوە بوترێ، کە ئەم هەنگاوانە لە باری ڕێگەدان بە داوا کولتوورییەکانی کورد باشتر چوونە پێش، لە بەغدا ئەکادیمییەکی کوردی کرایەوە، ڕۆژنامەیەکی ڕۆژانە بە ناوی، "برایەتی" وەک ئۆرگانی ڕەسمیی پارتی دیموکرات ڕێگەی پێ درا، گەلێک کۆڕ و گرووپی مۆسیقای کوردی یارمەتی دران و بە گشتی دەرفەت بۆ گەشە و پەرەپێدانی کولتووری کوردی ڕەخسا. دیارە ئەمە خۆی هەنگاوێکی بەکەڵک بوو بەڵام زیادە لە ڕادە لە لایەن دەوڵەتەوە وەک پڕوپاگەندە بەکار دەبرا و لەژێر سێبەری ئەم هەنگاوەدا هەم داواکانی تری کورد لە بیر دەکران و هەم لە لای دنیای دەرەوەشدا وا نیشان دەدرا، کە ئاشتی بۆ کوردستان گەڕاوەتەوە و ڕێژیمی بەعس هەموو بەڵێنەکانی خۆی بەجێ هێناون.

لە ڕاستیدا حزبی بەعس هەمەکارەی وڵات بوو. جگە لەوان هیچ حزب و کەسێکی تر هەلی نەبوو بڕیارێک بۆ سوپا، دەزگا جاسووسی و ئاسایشییەکان، پۆلیس و هێزی هەوایی دەربکات، بگرە هەمووان دەبوو ملکەچی بڕیاری دەوڵەت و دەوڵەتیش ملکەچی بەعس بێت. دەگمەن کوردێک ڕێگەی پێ دەدرا تەنانەت لە ئەکادیمیای تایبەت بە سوپادا بخوێنێ.

بەعس بەڵێنیان دابوو سیستەمی جاشایەتی لە کوردستان هەڵوەشێننەوە و چەک لەو کەسانە وەرگرنەوە، کە دژی پێشمەرگە و شۆڕش شەڕیان کردبوو. بەڵام قەت ئەم کارەیان نەکرد، بە پێچەوانە ئەو تاقمانەیان هان

دەدا هێرش بکەنە سەر کوردی بێ تاوان و ئاژاوە بنێنەوە.

لە سەرەتای ساڵی ١٩٧١دا بارزان چەندین جار بۆمباران کرا و تاوانی ئەم کارەشیان خستە ئەستۆی جەنەراڵ سەعید سیکاڵی فەرماندەی بنکەی هێزی هەوایی لە کەرکووک. هەر لە سەرەتای ئەو ساڵەوە پیلانێک بۆ کوشتنی "ئیدریس بارزانی" بەڕێوە چوو و دوای ئەوەش هێرشێکی ناسەرکەوتوو کرایە سەر جەنەراڵ بارزانی خۆی. هەردووکی ئەم پیلانانە لە لایەن حزبی بەعس خۆیەوە داڕێژرابوون. ساڵێک دواتر دیسان پیلانێکی تر بۆ کوشتنی جەنەراڵ بارزانی ئاشکرا بوو. رۆژنامەوانێکی سەر بە هەواڵدەری رەسمی دەوڵەت هاتبوو بە بیانووی گوتوبێژ لەگەڵ بارزانی، جانتایەکی لەگەڵ خۆی هێنابوو بۆمبێکی تێدا بوو، پلانەکە وا داڕێژرابوو، کە رۆژنامەوانەکە جانتاکە لە لای بارزانی دانێ، خۆی بە بیانووی "سەرئاو" دوور کەوێتەوە، بە دەزگایەک بۆمبەکە بتەقێنێ و لە نزیک شوێنەکەش ترۆمبێلێک ئامادە کرابوو تا تاوانبار لە رێگەیەوە دەرچێ. بەڵام هەر جۆرێک بوو ئەم کابرایە ئامادە نەبوو پیلانەکە تا دوا سات جێبەجێ بکات و خۆی و کارەکەی ئاشکرا کرد. ئاکامی لێکۆڵینەوەکان نیشانی دا، کە ئەم پیلانە گڵاوەش هەر لە لایەن بەعسییەکانەوە داڕێژراوە. بەڵام بەو حاڵەش هیچ کام لەم تاوانبارانە نەدرانە دادگە.

بەعس پارەیەکی فرەوانیان لە کوردستاندا خەرج دەکرد، بەڵام نە بۆ ئاوەدانکردنەوە و سازکردنی پرد و قوتابخانە، بگرە بۆ کڕینی بەکرێگیراو و زیادکردنی ژمارەی جاش.

سەرەڕای ئەوە عێراق ٨٠ باڵوێزگەی لە دنیادا هەیە تەنیا کوردێک کرا بە باڵوێز لە پراگ، "موحسین دزەیی"، کە دواتر بوو بە باڵوێزی عێراق لە کەنەداش. لەناو وەزارەتی دەرەوەشدا بە کردەوە کوردێک نابینرێ.

پارتی دیموکراتی کوردستان ئەوپەڕی هەوڵی خۆی دا تا بەڵکو ئاشتی

درێژەی هەبێت و بەعس رازی بکات بەڵکو گوێ لە داواکانی ئەوان بگرێ، بەڵام بە جێی ئەوە سیاسەتی بەعسییەکان لە هەمبەر کورددا سەخت و سەختتر بوو.

دوای ئەوە سەرۆک وەزیری سۆڤیەت سەردانی بەغدای کرد و لە ساڵی ١٩٧٢دا پەیمانی دۆستایەتی لە نێوان عێراق و سۆڤیەتدا مۆر کرا، ئیدی گەرێکی تر لەم بوارەدا دەستی پێ کرد. تا ئەو کات رژێمی بەعس تەریک کرابوو، بە تایبەتی لە دنیای عەرەبدا بەڵام بەستنی پەیمانی دۆستانە لە تەک وڵاتی سۆڤیەتدا بە کردەوە مانای تێکشکانی ئەم دیواری تەریکمانەوەیە بوو. کۆمۆنیستە عێراقییەکان لەژێر سێبەری ئەم رێککەوتنەدا هەموو قەتڵوعام و کوشتارێکی بەعسیان لە بیر کرد، لە بیریان کرد ئەوان ساڵی ١٩٦٣ زیاتر لە ٦٠٠٠ کەس لە باشترین کەسەکانی خۆیان بە دەست هەمان پیاو، کە ئێستە دەسەڵاتدارە، واتا ئەحمەد حەسەن بەکر لەدەست دان، تەنانەت ئەوەیان لە بیر کرد، کە ئەو ساتەی پەیمانی دۆستانەی رووس - عێراق ئیمزا دەکرا ژمارەیەکی زۆر لە ئەندامانی حزبی کۆمۆنیستی عێراق لەژێر لێدان و لە بەندیخانەکانی بەعسدا بوون و دارکاری دەکران.

حزبی بەناو شیوعیی عێراق، کە هەموو بڕیارێکی راستەوخۆ لە کرێملینەوە وەردەگرێ، دوای ئەم پەیمانە ئامادەیی خۆی بۆ بەعس دەربڕی تا بڕواتە ناو بەرەی بە ناو "پێشکەوتووی نیشتمانی" و شتێک کە بەعسییەکان لەمێژ بوو دەیانخواست، تێکڕای لایەنەکان بڕۆنە ناو ئەم "بەرەیە"وە و بەم شێوەیە بتوانن خۆیان وەک حزبێکی دیموکراتیک بە دەرەوە نیشان بدەن. بەڵام لەسەر بناخەی پرۆگرامی ئەم ئۆرگانە کە لە لایەن بەعسییەکانەوە دارێژراوە، دەبووا هەشت لە ١٦ ئەندامی ئەم بەرەیە لە حزبی بەعس بن، دوو کەسیان راسپێراوی حزبی بەعس، دوو کەسیان نوێنەری پارتی دیموکراتی کوردستان، دوو کەسیان کۆمۆنیست و دووانەکەی تر بۆ حزبەکانی تر دانرابوون. مەرجی بەشداری و بوونە ئەندام

لەم بەرمیەدا ئەوە بوو حزبی بەعس وەک "حزبی ڕێبەر" بە مافی کۆنترۆڵی تەواو بەسەر سوپا، پۆلیس و هێزە ئەمنیەتیەکاندا بناسی. پارتی دیموکراتی کوردستان ساز نەبوو بەم مەرجانەوە بچێتە ناو ئەم بەرمیەوە، بگرە پێشنیازی ڕێخستنێکی تری کرد، کە دەیتوانی بناخەیەک بێت بۆ عێراقێکی دیموکراتی. بەلام داواکەی پ. د. ک. رەت کرایەوە.

یەکەم حەفتەی تەمووزی سالّی ۱۹۷۳ نازم کزار هەولّی کودەتایەکی لە دژی ئەحمەد حەسەن بەکر و سەدام حوسێن تکریتی دا. بەلام ئەم هەولّە تێک شکا، وەزیری بەرگری "حامد شەهاب" لەم ناوەدا کوژرا و وەزیری ناوەخۆش "زەیدان رەهاب" بریندار بوو. نازم کزار لەگەل ۱۲۰ کەس لە هاوکارانی لە دەزگای ئەمندا گیران و بڕیاریان لەسەر درا. دوای ئەوە کودەتاکە دامرکایەوە سەرکۆمار ئەحمەد حەسەن بەکر دەرکەوتە پێشبەری خەلّک و بێ شەرمانە بەم شێوەیە دەستی بە قسە کرد:

گەلی خۆشەویستی عێراق، ئەمڕۆ ئێمە سەری مارەکەمان پان کردەوە. نازم کزار بەرپرسی هەموو ستەمکارییەکان، لێدان و کوشتنی زیاتر لە دوو هەزار مرۆڤ لە عێراق بوو. خۆشەویستان، من دلّنیاتان دەکەم، کە دەولّەت هیچ ئاگاهییەکی لەو تاوانانە نەبووە، کە نازم کزار خەریکیان بوو.

وێرایی لەم پەیامەدا سەرسوورهێن بوو، راستی ئەمە دەری دەخست کێ لە عێراقدا دەسەلاتی بە دەستە.

بڕیاردەری راستەقینەی عێراق، جێگری سەرکۆمار، واتا سەدام حوسێن تکریتی، پیاوێکە بێ پلە و پایەیەکی رەسمی لە خوێندندا. ئەو خەلّکی تکریتە و ئەو پلەیەش کە لە حزبی بەعس بەدەستی هێناوە تەنیا لە سێبەری دلّڕەقی و کرداری بێ رەحمانەیەوە بووە. سەدام وەک کەس بەرپرسی لێدان و مردنی ژمارێکی زۆر لە نەیارانی ناو حزبەکەی خۆیەتی. لە کۆبوونەوە و لەناو هاوکارانیدا باس لەوە دەکات حزبی بەعس لە سەرووی هەموو

یاسایەکەوەیە. سەدام بۆ خۆی نایشارێتەوە کە بە دەستی خۆی خاڵۆی خۆی لەبەرئەوەی دژی پارتەکەی بووە کوشتووە. (راستییەکەی ئەوەیە سەدام سەرەتای ساڵی ١٩٥٩ خاڵۆی خۆی کوشت و لەبەر ئەوەش نەبوو ناوبراو دژی حزب بوو بگرە مامێکی سەدام لە بری ئەوە کچەکەی بدات بە سەدام ئەم مەرجەی بۆ ناوبراو دانا و ئەویش بێ هیچ سڵکردنەوەیەک ئەم پیاوەی کوشت).

سەدام حوسێن تکریتی نوێنەرێکی راستەقینەی ئەو جۆرە رژێمەیە، کە لە ساڵی ١٩٦٨ەوە لە عێراق لەسەر کارە. رژێمێک کە ١٢٠ مرۆڤی لە مەیدانەکانی بەغدا و بەسرەدا تەنیا بە تۆمەتی جاسووسییەوە هەڵواسی. رژێمێک کە نە تەنیا لە عێراق لێدان و تاوان دەکات بگرە پیاوکوژەکانی دەنێرێ بۆ قاهیرە، بەیرووت و لەندەنیش تا گیانی نارازییان بستێنن.

ئەمانە تاقمێک پیاون هیچ هەستی مرۆڤییان تێدا بەدی ناکرێ، بەشی زۆریان خەڵکی شاری تکریتن، کە لە باکووری بەغدا هەڵکەوتووە و هەر کامەیان بە خەروار سەروەت و سامانی لە رێگەی پۆست و جێگەی دەسەڵاتەکەیەوە دەست دەکەوێ. لە ناوەندی هەموو ئەم تاوانبارانەدا سەدام و خزمەکانی راوەستاون، کە سەرجەمیان ئەندامی عەشیرەتێکی تکریتن. پیاوانی ئەم عەشیرەتە هەموو پۆستە گرینگەکانی ناو سوپا، ئەمن، هێزی هەوایی و وەزارەتی ناوخۆیان لەژێر چنگدایە. لە خوارەوەی ئەوانەوە هێندێک ئەفسەری سوپا و سەرۆک پۆلیس هەن خەڵکی شارەکانی "عانە، راوە، مووسڵ و بێجین". لە خوارەوەی ئەوانیشەوە ئەندامانی حزب و بەکرێگیراوانن، کە کاری لێدان و تاوان ئەنجام دەدەن.

تاکتیکی حزبی بەعس ئەوەیە دەست بخاتە ناو هەموو عەشیرەتەکان و لەناویاندا ئەندامی وەفادار بە حزب دەکاتە باندەست و دەسەڵاتی تەواوی دەداتێ تا بە مەیلی خۆی بڕیار لەسەر چارەنووسی خەڵکی بدات. ئاکامی

ئەم سیاسەتە ئەوەیە کەسانی خوێندەوار و سەرلەکار دەرچوو ناچارن ملکەچی کەسانی نەزان و نەخوێندەواری خزمەتکاری حزب بن. لە هەر گۆشەیەکی شارەکانەوە بنکەیەکی حزبی بەعس هەیە کاری کۆنترۆڵی خەڵکە و گشت هەڵسوکەوتێکی خەڵکیان لەژێر چاودێریدایە.

لە دوا ساتەکانی ساڵوەگەڕی ١١ ئاداری ساڵی ١٩٧٤دا ڕێبەرانی کورد هەوڵیان دا لەگەڵ ڕژێمی بەعس پێک بێن و بەڵێنەکانی چوار ساڵ پێش بخرێنە بواری کردارییەوە و خۆبەڕێوەبەریی کوردستان وەک پێشتر بەڵێن درابوو رابگەیەنرێ. ڕۆژی ٩ی ئادار ئیدریس بارزانی چوو بۆ بەغدا تا بەڵکو کاربەدەستانی ڕژێم رازی بکات مل بە داواکانیان بدەن. بەڵام هەوڵی کورد بێ ئاکام بوون.

ڕۆژی ١١ ئاداری ١٩٧٤جۆرە "ئۆتۆنۆمییەک" لە لایەن دەوڵەتەوە راگەیەنرا کە کورد نەیاندەتوانی پەسندی بکەن چونکە ئەم ئۆتۆنۆمییە گرینگترینی ئەو خاڵانەی، پێشتر هەردووک لا لەسەری ڕێک کەوتبوون لەخۆ نەدەگرت.

بۆچوونی ڕژێم لەم راگەیەندراوە تازەیەدا ئەوە بوو، کە دەوڵەتی ناوەندی دەسەڵاتێکی زیاتر لە پێشووی هەبوو، سوپا، پۆلیس، ئەمن دەکرانە مۆنۆپۆل (تاپۆ) و موڵکی تایبەتی حزبی بەعس و دەیانتوانی ئازادانە تەنانەت لە کوردستانیشدا چۆنیان پێ خۆشە ئاوا بجووڵێنەوە. سەرکۆمار دەسەڵاتی بەسەر ئەنجوومەنی بەڕێوەبەری و یاسادانانی ناوچەی ئۆتۆنۆمیدا هەبوو و بەشێکی زۆری ناوچە دەوڵەمەندەکانی کوردستان بۆ نموونە کەرکووک و سنجار بە تەواوی لە کوردستان دادەبڕان.

بە کورتییەکەی پلانی "ئۆتۆنۆمی"ی ڕژێم تەنیا هەنگاوێک بوو بۆ راگەیاندنی شەڕێکی تر دژی بزووتنەوەی رزگاریخوازیی کورد.

خاڵە جیاوازەکانی نێوان ئۆتۆنۆمیی دڵخوازی کورد و ئەو شتەی حکوومەت رای گەیاندبوو زۆر بوون بەڵام چوار خاڵیان زۆر گرینگتر بوون:

یەکەم گرفت پێوەندیی بە ئابووریی ناوچەی ئۆتۆنۆمییەوە هەبوو، پارتی دیموکراتی کوردستان هەردەم پێشنیازی ئەوەی دەکرد، کە بودجەی عێراق بە پێی سەرجەمی دانیشتوانەکەی دابەش بکرێ و بەشی دانیشتوانی ناوچەی کوردستانیش لەسەر ئەو بنەمایە جیا بکرێتەوە. کورد گەرەکیان بوو دوای جیاکردنەوەی بودجەی سوپا و ئەو بەشانەی، کە دەبوا دەوڵەتی ناوەندی بەسەریاندا رابگا، بە پێی مافی ناوچەکەیان بەشیان بەرکەوێ.

بە پێی بۆچوونی دەوڵەتیش دەبووا وەزیری دارایی عێراق، لە سەراسەری وڵاتدا بە ناوچەی ئۆتۆنۆمیشەوە مافی بڕیاردانی لەم بارەیەوە هەبێت و لە ئاکامدا مەترسیی ئەوە دەبوو کورد هێندێک ساڵ نەک هەر هیچیان لە بودجەی وڵات بەرنەکەوێ بگرە قەرزداری دەوڵەتیش ببنەوە. چونکە وەزیری دارایی ئەو دەسەڵاتەی هەبوو هەر کات بیویستایە بە مەیلی خۆی پسوولەیەک بنێرێ بێ ئەوە کەسێک مافی ملکەچی یان کۆنترۆڵکردنی هەبێ.

کێشەی دووەم لەسەر پۆلیس و دەزگای ئەمن بوو. پارتی دیموکرات هەردەم داوای ئەوەی کردووە کاروباری دەرەوە و بەرگری لە دەستی دەوڵەتی ناوەندیدا بێت بەڵام پۆلیس و دەزگای ئەمن، لە ناوچەی ئۆتۆنۆمیدا لە لایەن کورد خۆیانەوە بەڕێوە بچێت. ئەم داوایەش بە تەواوی لە لایەن بەعسەوە رەت کرایەوە و دەیانویست سنووری دەسەڵاتیان لە کوردستان زیاتر بکەن.

خاڵی سێیەمی جێ ناکۆکی، سنووری کوردستان بوو. لە رێککەوتنەکەی ساڵی ١٩٧٠دا هاتبوو کە لەم ناوچانەدا، کە هەردووک لا لەسەری ناکۆکن، لە ماوەی ساڵێکدا سەرژمێرییەک بکرێ و بزانن لە کوێ زۆربەی دانیشتوان کوردن. ئەم سەرژمێرییە هیچ کات نەکرا، بە جێی ئەوە رێژیم دەستی کرد بە دەرکردنی زۆرەملێی کورد لە گوندەکانی کەرکووک، سنجار و خانەقین و لە جێگەی ئەواندا عەرەبی هاوردەی دامەزراندن. ئامانجی ئاشکرای دەوڵەت

لەم کارەدا ئەوە بوو ژمارەی عەرەبان لەم ناوچە کوردییانە زیاد بکات تا ئەگەر کاتێکیش ملی بە سەرژمێری دا ئەوە ئاکام لە قازانجی خۆیاندا بێت.

دەوڵەت بۆ گەیشتن بەم مەبەستە لە هیچ کارێک خۆی نەدەپاراست، هەزاران کورد بە ڕۆژی ڕووناک لەو گوندانەدا وەدەر دەنران، کە پشتاوپشت تێیاندا ژیابوون. هاوکات لەگەڵ ئەمە ٤٠,٠٠٠ کوردی فەیلیشیان لە بەغدا و باشووری عێراقەوە دەرکرد. ئەم کوردانە بە ساڵان لەوێ ژیابوون، هاووڵاتیی عێراقی بوون و گەلێکیشیان سەربازییان بۆ سوپای عێراق کردبوو، بەڵام ٢٤ سات هەلیان پێ درا و دوای ئەوە دەرکران بۆ ئێران.

بەعسییەکان نەچوونە ژێرباری سەرژمێرییەک، کە پێشتر بەڵێنیان دابوو، لە بری ئەوە داوایان دەکرد بگەڕێنەوە بۆ ئەو سەرژمێرییەی، کە ساڵی ١٩٥٧ ئەنجام دراوە. کورد سەرەڕای ئەوەی دەیانزانی گەلێک ئاڵوگۆڕ لەو دەمەوە پێش هاتوون دیسان ساز بوون ئەمەش قبووڵ بکەن. بەڵام هەر زوو دەرکەوت، کە دەزگای ئەمنیی عێراق خەریکی سووتاندنی ناوی هەزاران کوردە کە ئەودەم دانیشتووی شاری کەرکووک بوون و لە جێگەی ئەوان بەڵگەی ساختە و ناوی عەرەبییان بۆ ساز دەکردن، کە مێژووی ساڵی ١٩٥٧یان لەسەر دەدان.

خاڵی چوارەم، کە کورد لەگەڵیدا ناکۆک بوون لەسەری، دەسەڵاتی سەرکۆمار بەسەر دەستەی بەڕێوەبەری ناوچەی ئۆتۆنۆمی بوو. بە پێی پێشنیازەکەی دەوڵەت دەبووا ئەنجوومەنەکە، کە وەک دەوڵەتی ناوچەی کوردستان کاری دەکرد هەشت ئەندامی هەبێ و لەلایەن ئەنجوومەنی یاسادانانی کوردستانەوە هەڵبژێردرێ، بەڵام دەسەڵاتی ئەم کۆمیتەیە زۆر سنووردار بوو و سەرجەمی وەزارەتەکانی دەوڵەتی ناوەندیش دەبووا لە هەر بارێکەوە تەنانەت ئاوەدانی و ئاودێریش بڕیاردەری بنەڕەتی بن. بە پێی ئەم حیسێبە هەردووک ئەنجوومەنی یاسادانان و کۆمیتەی بەڕێوەبەری لە

کوردستاندا ملکەچی بڕیارەکانی بەغدا بن. هەروەها سەرکۆماریش ئەو دەسەڵاتەی پێ درابوو، کە هەر کاتێک بیەوێ و پێی وا بێ پێویستە هەردووک ئەنجوومەن هەڵوەشێنێتەوە.

کاتێک ئیدریس بارزانی گەیشتە بەغدا بۆ ئەوە پێشنیازەکانی لایەنی کوردی بۆ کاربەدەستان باس بکات، ساز نەبوون گوێی لێ بگرن. سات ١٥:٢٠ی ڕۆژی ١١ ئاداری ١٩٧٤ سەرکۆماری عێراق ئۆتۆنۆمیی کوردستانی بە پێی پلانەکەی خۆیان ڕاگەیاند بەڵام ئەم ڕاگەیاندنە هاوکات بوو لەگەڵ هەڕەشە و هەڕەشەی سەدام تکریتی کە پارتی دیموکراتی کوردستان دەبێت لە ماوەی ١٥ ڕۆژاندا ئەم پلانە پەسند بکات دەنا. . . .

شیوعییەکانی عێراق ئێستە بە تەواوی پشتیوانییان لە هێرشی دەوڵەت بۆ سەر کوردستان دەکرد. دوای ئەوە رووس میسریان لە دەس چوو ئێستە عێراق گرینگترین شوێن بوو بۆ ئەوان و بڕیار بوو لە شاری بەسرەدا دوو بنکەی دەریایی بۆ هێزەکانیان ساز بکەن. سۆڤیەت بە هاوکاریی گرووپی شیوعی لە هەموو دنیادا لایەنگرانی خۆی ڕێک خستبوون تا جووڵانەوەی کورد وەک پلانی ئیمپریالیزم بناسێنن و لە دژیدا پڕوپاگەندە بکەن و هەمان کات هەوڵیان دەدا ڕێژیمی بەعس وەک دەوڵەتێکی پێشکەوتوو و سۆسیالیست بە دنیا بناسێنن.

یارمەتیی رووس بۆ عێراق، هەم مادی و هەم مەعنەوییەکەی لە ئاستێکی بەرفرەواندایە. هەناردنی چەکوچۆڵ بە شێوەیەکی بەربڵاو دەستی پێ کردووە و تا ئێستە دوو دەستە لە مۆدێرنترین فڕۆکەکانی سۆڤیەت، واتا "تی یو"، کە هێشتا ئەندامانی پەیمانی "وەرشۆ" نەیانتوانیوە وەری گرن بە عێراق دراون. لەگەڵ ئەم فڕۆکانەدا فڕۆکەوانی رووسیش نێردراون و جگە لەمە هەشت هەزار رووس لە عێراقن کە ٣٠٠٠ کەسیان خەریکی ئامادە و تەیارکردنی سوپای ئەو وڵاتەن و لە هێزی دەریایی، هەوایی و زەوینیدا کار

دەکەن. سوپای عێراق لەسەر مۆدێلی رووسیدا دابەش کراوە بەسەر سێ ناوچەدا و هەر ناوچەیەک بنکە و ناوەندی فەرماندەیی تایبەت بە خۆی هەیە.

کورد خۆیان بۆ شەڕێکی تر ئامادە دەکەن، لە کۆبوونەوەیەکدا، کە رۆژی ١٤ی ئادار لە گەلاڵە بەڕێوە چوو پلانەکەی رژێم رەت کرایەوە. لە نیوەی دووەمی ئاداردا کۆچێکی راستەقینە بەرەو کوردستان دەستی پێ کرد، کە نموونەی لە مێژووی جیهاندا دەگمەنە. نەک هەر خەڵکی ساکار، کە هیچ شتێکیان نەبوو لە دەستی بدەن، یان قوتابیان، کە لە دەست ستەم راکەن، یانکو پێشمەرگە، کە دیار و ناسراو بوون بۆ رژێم بگرە خەڵکی چینی ناوەنجی، کە بە ساڵان بێ خەم و بە ئاسوودەیی ژیابوون، ئەندازیار، دوکتۆر، مامۆستا، پیاو، ژن، منداڵ. . . هەموو رێگەی کوردستانیان گرتە بەر. لە ماوەی دوو حەفتەدا نزیکەی دووسەد هەزار کەس لە سەرانسەری عێراقەوە گەیشتنە کوردستان و تێکەڵی شۆڕش بوون.

رۆژی ١ی نیسانی ١٩٧٤ هێزێکی زەوینیی عێراق لە رێگەی سلێمانییەوە بەرەو دەۆک کەوتە رێ و لە رێگە لە لایەن هێزی پێشمەرگەوە پێشی پێ گیرا و شەڕێکی دژوار دەستی پێ کرد. رۆژی ٨ی نیسان فڕۆکەکانی عێراق هێرشیان کردە سەر گوندەکانی نزیک شاری رواندز. دیسان بۆ جارێکی تر شەڕ گەیشتەوە کوردستان.

## ئەگەر سوێد بیتوانیایە چەکی دژە تانک بۆ ئێمە بنێرێ

ئێستە، کە من خەریکی نووسینەوەی پێنجەمین و دوایین دەفتەری ریپۆرتاجەکەمم مانگێک بەسەر گەڕانەوەم لە کوردستان تێ دەپەڕێ و کتوپڕ وا هەست دەکەم نووسینەوەی ئەم رووداوانە کاتی فرەتری برد لەوەی من لەوێ بە چاو بینیمن.

ئەم پایزە باراناویترین پایز بووە من وەبیرم بێت و ئێستە، کە خەریکی نووسینەوەی ئەم شتانەم، نیوەشەوێکی درەنگە و باران بە توندی لە پەنجەرەکەم دەدات. هەموو ئەو ماوەیەی من لە کوردستان مامەوە تەنیا جارێک باران باری، بەڵام ئەمە خۆی هەواڵی هاتنی وەرزی سەرماوسۆڵە و کاتی هاتنی زستانە. شەوەکانی زۆر سارد بوون و گڤەبایەکی سارد لە دۆڵەکانەوە هەستی پێ دەکرا، کە ئەمەش نیشانەی ئەوەیە زۆر ناخایەنێ دۆڵ و شیوەکان بە بەفر دادەپۆشرێن.

لە ماوەی چوار حەفتەدا من تەنیا دوو هەواڵی کورتم لەسەر دۆخی کوردستانەوە لە رۆژنامە سوێدییەکاندا بەرچاو کەوتووە و هیچی تر. لەو ماوەیەدا کە شەڕەکە لە ١١ی ئادارەوە هەڵگیرساوەتەوە رەنگە نزیک بە ٥٠٠٠ هەزار کەس کوژرابن، بەڵام کوردستان دنیایەکی ترە و دەگمەنن ئەوانەی، کە دەزانن هەر جێگەیەک بەو ناوە بوونی هەیە.

لەم ماوەیەدا نامەیەکم لە "شەماڵ"ەوە پێ گەیشتووە و تێیدا دەنووسێ:

شەڕەکە لە کوردستان زۆر توندتر بووە لەم حەفتانەی دواییدا، وەک خۆت ئاگەداری لەم دوو مانگەی دواییدا عێراقییەکان پاڵەپەستیان بۆ سەر بەرەی "گەرووی عومەر ئاغا"، ئەو شوێنەی تۆ خۆت بۆی چووی و شاخی زۆزک

زیاد کردووە، بەڵام هێرشی وان لە لایەن هێزەکانی ئێمەوە شێرانە بەرپەرچ دراونەتەوە. ئاگـــری چەکی دوژمن زۆر بەرین و بەرفـــرەوانە بەڵام بە شێوەیەکی جێگەی ستایش لە لایان شەڕوانانی ئێمەوە، تێک شکێنراون.

تەلێگرامێک کە لە بەیرووتەوە گەیشتووە ئەمڕۆ لە رۆژنامەکانی سوێددا بڵاو کراوەتەوە:

"سوپای عێراق بە ٤٠٠ تانک لە سەرجەمی ١٠٠٠ تانکی سوپاکەیەوە خەریکی هێرشێکە لە هەولێرەوە بۆ رواندوز و بە نیازە بەرخۆدانی کورد تێک بشکێنێ و ناوچە کوردییەکان لێک دابڕێ. ئەم تەلگرامە لە لایەن وتەبێژی مستەفا بارزانی لە بەیرووتەوە گەیشتووە. بە قسەی ئەم نوێنەرە کوردە نزیک بە نیو میلیون کورد - زۆربەیان ژن، منداڵ و پیر - لە دەست شەڕی سوپای عێراق هەڵاتوون و گوازراونەتەوە بۆ شوێنی ئەمین تا لە ئاگری تۆپ و فڕۆکەکانی عێراق بە دوور بن، لەو دەمەی هێزەکانی پێشمەرگە خەریکی بەرخۆدان و بەرپەرچدانەوەی سوپای عێراقن.

من لە دەفتەری ریپۆرتاجەکەمدا نووسیومە:

من ئەم ماوەیە هەست بە بوونی کات ناکەم، وا دەزانم هەموو ژیانم لەم وڵاتەدا ژیاوم. بە یارمەتیی رۆژمێرەکەم هەوڵ دەدەم بزانم کام رۆژ ئەم دێرانەم نووسیوە بەڵام بێ ئاکامە.

شەوێکی درەنگ هەلی ئەوەم بۆ دەرەخسێ بتوانم ئیدریس بارزانی ببینم. ئەو رۆڵ و جێگەیەکی گرینگی لەم شۆڕشەدا هەیە و ئەوەی من بیستوومە ئەویش وەک باوکی خۆی، جێگەی رێزی خەڵکە و ئەگەر رۆژێک بێت و ئەم پیرە جەنەراڵە دوا کۆچ بکا، بێ شک تەنیا ئەو جێگەی دەگرێتەوە. مرۆڤ لێرەدا هەر جێگەیەک دەڕوا ناوی ئەوە:

ئێمە دەبێت لەگەڵ ئیدریسدا قسە بکەین ئەگەر بڕیارە کارێکی گرینگ بێتە پێش.

شۆڕشی کورد لە لایەن پارتی دیموکراتی کوردستانەوە ڕێبەری دەکرێ، کە هەرسێ ساڵ جارێک کۆنگرەیەک دەگرێ و دوایین کۆنگرەی پێش لە دەست پێکردنەوەی شەڕەکەی ئاداری ١٩٧٤ بەسترا. ئامانجە سیاسییەکانی ئەم پارتە لەم کۆنگرانەدا دیاری دەکرێن کە لە پرۆگرامەکەیدا هاتووە:

"ئێمە بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی هەڵبژێردراوی دیموکراتیی شۆڕشگێڕ خەبات دەکەین. هەروەها خەبات دەکەین بۆ پێکهێنانی ئاڵوگۆڕ لە بوارەکانی ئابووری و کۆمەڵایەتیی کۆمەڵگە و دابینکردنی ئازادیی ئاین، چاپەمەنی و سیاسی بۆ گشت هاوڵاتییان."

"ئێمە خەبات دەکەین بۆ بەهێزکردنی برایەتی و پێوەندیی نێوان نەتەوەی عەرەب و کورد و بناخەدارشتنی برایەتی لە نێوان کورد، عەرەب و کەمایەتییەکانی تری ناو عێراق. هەروەها هەوڵ دەدەین بۆ بەهێزکردنی پێوەندی لە نێوان گەلی کورد و هەموو گەلانی تری دنیا".

ئێمە هەوڵ دەدەین بۆ بەهێزکردنی پێوەندی و دۆستایەتی لە نێوان پارتیمان و گشت ئەو هێز و لایەنانەی ناو عێراق بڕوایان بە داخوازییە رەواکانی ئێمە و هەموو جووڵانەوەی دیموکراتیکی بەشەکانی تری کوردستان هەیە...

جەنەراڵ بارزانی سەرۆکی پارتییە و خۆشی وەک ڕێبەری جووڵانەوەکە ناودێر کردووە. بارزانی بنکەی سەرەکیی خۆی هەیە، بڕیارە گرینگەکان تەنیا لە لایەن ئەوەوە دەردەچن و نزیکەی رۆڵی سەرکۆمارێکی هەیە، کە کۆمیتەی ناوەندی وەک پەرلەمان و مەکتەبی سیاسی وەک دەوڵەت لە بەردەستیدا کار دەکەن.

من نیوەشەوێکی درەنگ ئیدریس بارزانی لە یەکێک لەو ڤیلایانەی کاتی خۆی بۆ توریست و گەشتیاران ساز کراوە، لە تەنیشت چادرەکانی بەشی راگەیاندندا دەبینم و لە دوورەوە و لە تاریکییەکەدا هەست بە بوونی

ژمارەیەک پێشمەرگەش لەو نزیکانەدا دەکەم. ژمارەیەک فەرماندەش لە دەوری مێزێک و لەژێر رووناکیی چرالامپایەکدا دانیشتوون، کە کەشوهەوایەکی شۆڕشگێڕانەی بە جێگەکە داوە.

ئیدریس کورتەبالا و لە هەڵسوکەوتدا زۆر پیاوانە و بەڕێز دێتە پێش چاو. زۆر وریا و ژیر دیارە و سەرەڕای ئەوە وەلامەکانی دیپلۆماتییانەن زۆریش رێک و راست باسی شت دەکات. ئەو هەوڵ دەدات هەموو ئەو کاتە خەریکی چاوپێکەوتنەکەی لەگەڵ من بێ بەلام هەر تاو نا تاوێک پیاوێک بە پەیامێکەوە دێتە ژوورەوە و دەبێت وەلامی پەیامەکەشی زوو وەرگرێتەوە بۆیە ناوبراو لەم بارەیەوە داوای لێبووردن لە من دەکات. ئیدریس سەرەتا روو لە من دەڵێ:

- ئێمە خۆشحاڵین دۆستێکی ترمان بۆ پەیدا بووە، دیارە من دەزانم ئێمە گەلێک دۆستی ترمان لە سوێددا هەیە. خەڵکی سوێد سۆزی زۆری بۆ شۆڕشی ئێمە هەیە و ئێمە بەڕێزەوە سەیری ئەم کارەی سوێد دەکەین. بە تایبەتی لەم رۆژە رەشانەی ئێمەی تێداین پێویستە ئەم دۆستایەتییە بەهێزتر بکرێ، سوێدییەکان دەتوانن یارمەتییەکی گەورە بن بۆ ئێمە.

من دەڵێم بەلام ئێوە ناتوانن چاوەڕوانییەکی زۆرتان لە سوێد ببێ، رەنگە هێندێک یارمەتیی مرۆیی، بەلام ئەوەی ئێوە زیاتر پێویستتانە چەک و تفاقی شەڕە، وا نییە؟

- بەڵێ، راست وایە تانکەکانی عێراق گەورەترین کێشەی ئێستەی ئێمەن. ئێمە وەک پێویست چەکی دژە تانکمان نییە، ئەگەر سوێد بیتوانیایە لەو چەکانەمان بۆ بنێرێ زۆر یارمەتییەکی بە نرخ دەبوو.

من لە وەلامدا دەڵێم بە داخەوە ئەم شتە ئیمکانی نییە و ئیدریسیش قبووڵی دەکات.

سوێد تەنیا چەک بەو وڵاتانە دەفرۆشێ، کە پێی وایە بەکاریان نایەنن و

چەک وەک یارمەتیی مرۆیی حیسێب ناکرێن.

له ترۆمبێلەکەی دەمانهێنێتەوە بۆ قەسرولسەلام، لەبارەی یارمەتییەکانی ئێرانەوە له سیامەند پرسیار دەکەم و دەپرسم بۆچی ئەوان ئەم چەکانە لە ئێران داوا ناکەن؟

– بەڵێ، بۆ؟ دیارە بۆ ئەم کارە ناکەین، یارمەتییەکانی ئێران بەو شێوەیەش نین کە دنیا باسیان دەکات. ماوەیەک لەمەو پێش، فڕۆکەکانی عێراق چەند گوندی ئێرانیان بۆمباران کرد و ٤٠ کەسیان کوشت کە زۆربەیان لەو کوردە ئاوارانە بوون خۆت بینیوتن. ئێرانییەکان نوێترین چەکی دژی فڕۆکەیان لە بەردەستدایە تەنانەت تەقەشیان لەم فڕۆکانە نەکرد و بە دەربڕینی نارەزایەتییەک بۆ بەزاندنی سنوورەکەیان وازیان هێنا.

شای ئێران دەزانێ چی دەکات. ئەو لێ دەگەڕێ تا کورد لەم شەڕەوە بگلێن و پێشی خۆشە هەرچییەک درێژتر بێتەوە، بەلام قەت نایەڵێ کورد بەهێز بن چونکە لەو حاڵەتەدا دەبنە مەترسییەک بۆ خۆشی.

ئێران و عێراق لە حاڵەتێکی نزیکی شەڕ لەگەڵ یەکدان، بچووکترین رووداو دەتوانێ چاڵە نەوتییەکانی ئێران لە عابادانا بخاتە ژێر مەترسییەوە و بە هۆی نێزیکیی ئەو شوێنە لە سنوورەوە بە هاسانی دەتوانن بکەونە بەر هێرشی تۆپخانەی عێراق. روونە کە شای ئێران دەیەوێ خۆی لەم مەترسییە دوور بگرێ و سەرەڕای زاڵیەتیی سوپای ئێران، شەڕێکی لەو جۆرە دەتوانێ زیانێکی قەرەبوونەکراو بگەیەنێتە ئێران.

هەر لەسەر ئەم بنەمایەشە، کە شا لێ دەگەڕێ کورد شەڕەکەی بۆ بکەن، تا ئەو کاتەی بەشێکی زۆری سوپای عێراق لە شەڕی کوردستانەوە گلابێ ئەوان دەستی دڵنیایی لەسەر سکیاندا دەنێن و لە دوورەوە چاوی لێ دەکەن. بەلام سەرکەوتنی هیچ کام لەم لایەنانەی شەڕ لە قازانجی شادا نییە، نە هی کورد و نە هی عێراقیش. ئەگەر کورد سەرکەون ئەوە ئیمکانی ئەوە هەیە

داوای ئۆتۆنۆمیی کوردی ئێرانیش ببێته راستییەک و سەرکەوتنی عێراقیش، کە لە تێکشکاندن و لاوازکردنی کورددا بەدی دێت لە قازانجی ئێراندا نییە چونکە ئەو کات ئەم کارە دەبێتە هۆی دەست پێکردنی شەڕێکی گەورەتر لە نێوان دوو وڵاتی ئێران و عێراقدا. بۆیە درێژدانی شەڕ لە کوردستانی عێراق زیاتر لە هەر شتێک بە قازانجی ئێرانە و بۆ ئەو مەبەستەش تا ئەو جێگەیە یارمەتیی کورد دەدات، کە خۆیان لە بەرانبەر سوپای عێراقدا راگرن و ترازووی دۆخەکە لە بەرژەوەندی خۆیان راگرن.

دیارە رێبەرانی کورد ریالیستن و دەزانن ئەم دۆخە وایە، بەڵام ئەوان هیچ کات وەک من بەم شێوەیە باسی شتەکە بۆ تۆ ناکەن. بە پێچەوانە بە هۆشیارییەکی زۆرەوە ناوی شا دێنن و ئەگەریش باسی هۆی ئەم یارمەتییانەیان لێ بپرسی دەڵێن هەمووی لەبەر هەستی مرۆڤدۆستییانەی شایە، کە یارمەتیی ئێمە دەدات.

ئەگەر ئەم شتە وایە ئەی بۆ ئەوان فڕۆکەکانی عێراق ناخەنە خوارەوە، کە ئاسمانی ئەوان دەبەزێنن، گوندەکانیان بۆمباران دەکەن و لەسەر خاکەکەی ئەوانیشدا خەڵک دەکوژن؟

## ڕەنگە ئەو دوایین ڕێبەری خەڵک بێت

دوای ساڵانێک ئاشتیی لەرزۆک و ناسەقامگیر لە کوردستانی عێراقدا، ساڵی ١٩٣١ بۆ جارێکی تر هەلومەرجێکی ئاڵۆز رووی لە ناوچەکە کردبووەوە و شێخ ئەحمەدی بارزان، کە بارێکی جێگیری دەروونیی هەبوو، لە ساڵی ١٩١٤ەوە دوای ئەوەی شێخ عەبدولسەلامی برای لە لایەن عوسمانییەکانەوە لە مووسڵ لەدار درا، سەرۆکایەتیی هۆزی بارزانیی گرتە دەست. شێخ رەشید ناوێک، کە ئەویش خەڵکی ناوچەکانی دەوروبەر بوو بە بیانووی ئەوەی ئەحمەد پشتی لە ئیسلامی راستەقینە کردووە "جیهاد"ی دژی هۆزی بارزان راگەیاند. سوپای عێراقیش دەستی لە کێشەکە وەردا و بە کاروانێک سەربازەوە رووی لە بارزان کرد. هاوکات ئەم هێزە کەوتە داوی بارزانییەکان و بە هەزار دەردی سەر و دوایی بە یارمەتیی هاتنی هێزی هەوایی ئینگلیز، توانیی لەم داوە رزگاری بێت. ئەو کەسەی ڕێبەرایەتیی هێزی کوردی لەم شەڕەدا کرد برای بچووکی شێخ ئەحمەد بوو، کە بە مەلا مستەفا ناسراوە.

مەلا مستەفا هەر هەمان ئەو پیاوەیە ئێستە دوای ٤٣ ساڵ تێپەڕین بەسەر ئەو رووداوەدا، ڕێبەری شۆڕشی کورد بۆ پاراستنی کێوەکانی کوردستان دەکات و بووەتە جەنەراڵ بارزانی.

بەهاری ساڵی ١٩٣٢ دیسان هێزێکی تری سوپای عێراق هێرشی کردەوە سەر بارزان و وەک جارەکەی پێشتر کەوتنە ناو داوی کوردەوە، هێزی هەوایی بەریتانیا هات بە هاواریانەوە، گوندەکانی بارزانی بە خەستی بۆمباران کرد. کورد ناچار بوون لە بەرانبەری هێزی زۆری دوژمندا

پاشەکشێ بکەن و شێخ ئەحمەد بە ناچار خۆی دایە دەستی تورکان، کە ئەوانیش دواتر بە عێراقیان دایەوە. مەلا مستەفا برایە سلێمانی و لەوێ نیشتەجێ بوو.

بەهاری ١٩٤٣ مەلا مستەفا هەڵات بۆ ئێران، لەوێوە گەڕایەوە بارزان، لە لایەن لایەنگرانیەوە بە گەرمی پێشوازیی لێ کرا و بوو بە ڕێبەری بێ ئەملا و ئەولای ئەو کوردانەی خوازیاری رزگاری بوون. دوای ئەم دۆخە تازەیە دەردەکەوت شەڕێکی تر لە ڕێگەدایە، چونکە هێزەکانی بارزان ڕۆژ لە دوای ڕۆژ لە پەرەگرتندا بوون و ڕێژیمی بەغداش کەوتبووە بیری سەرکوتینەوەیان. بۆیە هێزێکی فرەوانی بۆ گرتنەوەی بارزان بە ڕێ کردەوە، لە نزیک کێوەکانی ئاکرێدا تووشی شەڕی سەرهەڵداوان بوون و بە شپرزەییەکی زۆرەوە ناچار بە کشانەوە کران. لە نیسانی ١٩٤٥دا دیسان سوپای عێراق هێرشی دەست پێ کردەوە، تورکیا سنوورەکانی بەڕووی کورددا داخست و هێزی هەوایی ئینگلیزیش بێ رەحمانە گوندەکانی دەڤەری بارزانی بۆمباران کرد. بارزانییەکان لە هەمبەر هێرشەکاندا بەرخۆدانی مەزنیان کرد بەڵام دوای ئەوەی سوپای عێراق و ئینگلیز توانییان عەشیرەتەکانی تری کورد لە دژی ئەوان بەکار بێنن، مەلا مستەفا ناچار بوو لە بەرانبەریاندا پاشەکشێ بکات. تەنیا ڕێگەیەک بۆ دەربازبوون هەبوو ئەویش ڕێگەی ئێران. مەلا مستەفا بە ١٠٠٠٠ هەزار کەسەوە کە تەنیا دوو هەزار کەسیان پێشمەرگەی بە ئەزموونی مەیدانی شەڕ بوون و ئەوانی تر ژن و منداڵ بوون، رووی لە کوردستانی ئێران کرد.

ماوەیەکی کورت دوای گەیشتنی بارزانی، کۆماری کوردستان لە مەهاباد راگەیەندرا و بارزانییەکان بە گیان و دڵ ئامادەییی خۆیان بۆ خزمەت بەو کۆمارە دەربڕی. لە سەرەتای مانگی حوزەیرانی ساڵی ١٩٤٦دا وەک هێزێکی تۆکمە و بە ئەزموون بۆ پاراستنی ئەو کۆمارە کورتە تەمەنە دەستبەکار بوون. بەشی زۆری هێزەکانیان لە نزیک شاری سەقز نیشتەجێ

کران تا کۆنترۆڵی ئەو بەرەیە بگرنە ئەستۆ و لە بەرانبەر هێرشی سوپای ئێراندا بەرگری لە کۆمار بکەن. لێرە بوو بارزانی ناسناوی جەنەراڵی پێ درا.

سوپای ئێران و جەنەراڵەکانی، لەوانە سەرفەرماندارى ئەو دەمی سوپاکە جەنەراڵ رەزمئارا، بێدەنگی لەم بارەوە بە خراپ دەزانی و وەک زەبرێک لەناو و دەنگی سوپای ئێرانی لێک دەدایەوە. بۆیە رێگەی هێرشیان دژی شەڕوانانی کورد هەڵبژارد و رۆژی ١٥ حوزەیرانی ئەو ساڵە بە هێزێکی زۆرەوە و لەژێر ئاگری تۆپخانە پەلاماری سەنگەری پێشمەرگەکانی بارزانییان دا، کە لە بەرزاییەکانی کێوی "مامەشا"دا بەجێ کرابوون.

سەرنج ڕاکێشە مرۆڤ ئەو شەڕە لەگەڵ ئەم شەڕانەی ئێستە لە دژی کورد لە ئاراداں بەراورد بکات، هەروەک ئێستە ئەو دەمیش ژمارەیەکی کەم شەڕوانی پێشمەرگە لەناو دڕناڵە بەرد و لە پەنا دەوەناندا خۆیان حەشار داوە و خۆیان بۆ بەرخۆدانێکی مەزن لە بەرانبەر دوژمنێکی چەندین جار لە خۆیان بەهێزتر و خاوەن چەک و چۆڵی مۆدێرندا، ئامادە کردووە.

بە پێی سەرچاوە کوردییەکان سەرجەمی ئەو پێشمەرگانەی بەرخۆدانی کێوی مامەشایان کرد تەنیا ١٢ کەس بوون کە لە لایەن شەڕوانێکی بە ئەزموون و ناسراوەوە بە ناوی "خەلیل خۆشەوی" رێبەری دەکران. لە درێژەی شەڕەکەدا ٣٠ بارزانیی تریش بە ژمارەی ئەمانەوە زیاد بوون، بەڵام بە پێی سەرچاوە ئێرانییەکان نێوان ٥٠٠ - ٨٠٠ پێشمەرگە بەشداریی شەڕی ئەم بەرەیە بوون.

هێرشی ئێرانییەکان زۆر ورد و زیرەکانە دەستی پێ کرد بەڵام پاراستنی کوردیش هەر وا بوو. دەگێڕنەوە خەلیل خۆشەوی بە هەڤاڵانی خۆی وتبوو لە پشتوێن بۆ سەرەوە تەقە لە دوژمن بکەن. لە کۆتاییی رۆژدا دەوڵەتی ئێران توانی چیایەکە داگیر بکات بەڵام ٢٢ کوژراو و ٤٠ برینداریان هەبوو، لە

حالێکدا زیانی کورد تەنیا خەلیل خۆشەوی خۆی بوو، کە بە برینداری گوێزرایەوە بۆ نەخۆشخانەی رووسەکان لە تەورێز بەڵام بە هۆی ئەوە دە گوللەی بەرکەوتبوو، گیانی لەدەست دا.

مستەفا بارزانی، کە لە کاتی ئەم رووداوەدا لە تەورێز بوو، لە سەرەخۆی ناوی ئەو ١٣ پێشمەرگەیەی پارێزگارییان لە مامەشا دەکرد هێنایە سەر زمان و گوتی: خەلیل خۆشەوی بەزیندوویی ئەو کێوەی بەرنەدەدا.

دوای رووخانی کۆماری مەهاباد داوا لە بارزانییەکان کرا لە ناوچەی هەمەدانیدا نیشتەجێ ببن بەڵام ئەوان نەچوونە ژێر باری ئەم داوایە و بە درێژەدانی شەڕ لەگەڵ سوپای ئێراندا گەیشتنەوە سەر سنوور. لە ناوەڕاستی نیساندا تێکڕا چوونەوە دیوی عێراق و شێخ ئەحمەد، چوار ئەفسەری پێشووی سوپای عێراق و بەشی زۆری ژن و منداڵەکان، کە لەگەڵ کاروانەکەدا بوون خۆیان دایەوە دەستی سوپای عێراق. بەڵام مەلا مستەفا و بەشی زۆری شەڕوانانی هاوڕێی وی، نەیانویست خۆیان بدەنە دەست. سەرەتا بارزانی بە تەمای دانوستاندن بوو لەگەڵ دەوڵەتی عێراقدا بەڵام دەوڵەت زوو هەر چوار کۆنە ئەفسەرەکەی، کە خۆیان دابووەوە دەست هەڵواسی و ئەویش تێ گەیشت کە چارەنووسی لەوان باشتر نابێت چونکە بارزانی پێشتریش گەلێک جار شەڕی دەوڵەتی عێراقی کردبوو و دەیزانی مانەوە لە عێراقدا بێ مانایە.

سەرەنجام بارزانی خەڵکەکەی کۆ کردەوە و پێی وتن، کە بە پێی بۆچوونی وی تەنیا رێگە ئەوەیە بڕۆن بۆ سۆڤیەت و لەو وڵاتە داوای پەنابەری بکەن. هەروەها وتی ئەو ئامادەیە جگە لەوانەی دەبێت لە لای بنەماڵەکانیاندا بمێننەوە ئەوانی تر لەگەڵ خۆی بۆ ئەم رێیە درێژ و پڕ مەترسییە ببات. بەشی هەرە زۆری بەشداران ئامادە بوون لەگەڵیدا بڕۆن، بەڵام زۆرێکیان بە هۆی جۆرەوجۆر وەرنەگیران و سەرەنجام ژمارەیەکی نێوان ٥٠٠ - ٨٠٠

کەس دیاری کران و ئەم ڕێگە دوور و سەختەیان گرتە بەر.

ڕۆژی ٢٧ی ئایار ئەم کاروانە سنووری تورکیایان بەزاند و چوونە ناو خاکی ئەو وڵاتە، گەڕانەوە ناو خاکی ئێران و دیسان گەڕانەوە ناو تورکیا و دیسان بۆ ئێران. سوپای ئێران فەرمانی پێ درا پێشی ئەم هێزە بگرێ، بەڵام ڕۆژی ٣ی حوزەیران بە ناوەڕاستی دوو بەتالیۆنی سوپای ئێراندا تێ پەڕین. ڕۆژی ٩ی حوزەیران کورد هێرشیان کردە سەر ئەو سوپایەی ئێران، کە دوایان کەوتبوو و زیانی زۆریان پێ گەیاندن و ڕۆژی ١٠ی حوزەیران سەرجەمی ئەم هێزە گەیشتنە سەر سنووری سۆڤیەت لە لای چۆمی ئاراس و کاتێک ڕۆژی ١٨ی حوزەیران بەشێک لە سوپای ئێران گەیشتە ئەم شوێنە، مستەفا بارزانی و هێزەکەی توانیبوویان بڕۆنە ناو خاکی سۆڤیەت. ئەم گرووپە کوردە دوای تێپەڕینی ١١ ساڵ و ٤ مانگ بەسەر ئەم سەفەرەدا توانییان بگەڕێنەوە وڵاتی خۆیان.

شەوی یەکشەمە، ئەرێ پێم وایە شەوی یەکشەمەیە کە سیامەند دەڵێ:

– تۆ دەتوانی جەنەراڵ ببینی، من تازە هەواڵم لەم بارەوە پێ گەیشتووە.

لای سەعات هەشت و نیوی ئێوارە دەڕۆین بۆ بنکەی مەکتەبی سیاسی، لەو شوێنەی من پێشتر ئیدریس بارزانیم بینی، رادەوەستین تا لە دوایین بڕیار ئاگەدارمان کەن. سیامەند دەڵێ:

– جەنەراڵ بارزانی شوێنێکی دیاریکراوی بۆ مانەوە نییە. زۆر کەم کەس لە نزیکانی دەزانن ئەو ڕاست لە کام شوێنە بەڵام هەر کات گەرەکیان بێت دەتوانن پێوەندیی پێوە بکەن.

لەم ماوەیەدا من ڕاوەستاوم و چاوەڕوانی وەڵام دەکەم، لەگەڵ مەسعوود بارزانی – برای چکۆڵەی ئیدریس–دا خەریکی قسەم. ئەو سەر و شکڵی زۆر گەنجانە و ڕەنگە هەر دەوری ١٨ ساڵ بێتە بەرچاو، بەڵام تەمەنی ڕاستەقینەی مەسعوود ٢٨ ساڵە. ئەم دوو برایە لە ڕواڵەتدا زۆر لێک دەچن،

بەڵام بە شێوەی تر جیاوازن. ئیدریس دیپلۆماتە و قسەکانی زۆر ورد و حیساب بۆکراو هەڵدەبژێرێ. کەچی مەسعوود ئەوەی لە دڵیدایە بێ پەردە باسی دەکات، زۆر ئارام و لەسەرەخۆ دانیشتووە و ئامادەیە بۆ باس و وەڵامدانەوە. من هەلەکە بە باش دەزانم تا هێندێک پرسیاری لێ بکەم.

روو لە مەسعوود بارزانی دەپرسم ئاخۆ ئێوە گەرەکتانە دوای شەڕ چ جۆرە کۆمەڵگەیەک دامەزرێنن؟ ئاخر من کە گەڕامەوە خەڵک لە سوێد لە من دەپرسن، ئەمانە سۆسیالیست، کۆنەپارێز، چەپ یان راستن؟

– ئێمە لەمێژەوە خەریکی خەباتین، سەرەتا ئێمە هەوڵ دەدەین کێشەی ئاشتی لە ناوچەی ئۆتۆنۆمیی کوردستاندا چارەسەر بکەین. من دەتوانم بە تۆ بڵێم دوای ئەوە ئێمە سیستەمێکی دیموکراتیک لەسەر بنەمای پەرلەمان دادەمەزرێنین. ئێمە دەمانەوێ پێوەندییەکی نزیک و فرەوان لە نێوان دەوڵەت و خەڵکدا هەبێ، پێوەندییەک کە بە هیچ جۆر لە عێراقدا بوونی نەبووە. ئێمە خوازیاری کۆمەڵگەیەکین تێیدا هەموو هاووڵاتییان بتوانن بیر و بۆچوونی خۆیان بە ئازادی دەربڕن. کۆمەڵگەیەک کە ئازادی دەبێتە بەشی هەمووان و هەر کەس بەو شێوەیە هەیە ڕێزی لێ دەگیرێ. ئەمە ئامانجێکی بەرزە و من دەزانم گەلێک شۆڕشی تریش ئەم ئامانجەیان هەبووە بەڵام تێیدا سەرنەکەوتوون. بەڵام من بێ ئەملا و ئەولا دڵنیام ئێمە لەمەدا سەردەکەوین. دوای شەڕ ئێمە دادەنیشین و باس لە کێشەکان دەکەین و ڕێگەچارە بۆ گرفتەکان دەدۆزینەوە. تۆ بێگومان ئەم یەکگرتنە بەرینەت دیوە، کە ئێمە لە کوردستان پێی گەیشتووین. ئەم یەکەتییە قووڵ و ریشەدارە بە هیچ کەس نایەتە برین و هەڵوەشاندنەوە. بناخەی ئەم یەکەتییە تەنیا تێگەیشتنی سیاسی نییە بگرە سەرچاوەکەی لە یەکبوون و هاوچارەنووس بوونەوەیە.

من لە مەسعوود دەپرسم کێ پارەی شۆڕش دابین دەکات؟ ئەو لە وەڵامدا دەبێژێ:

– بەشی زۆری باری ئەم شۆڕشە لەسەر شانی کورد خۆیانە، دیارە ئێمە تۆمەتبار دەکرێین، کە یارمەتی لە دەرەوە وەردەگرین، بەڵام من دڵنیات دەکەم ئەگەر پێنج لە سەدی ئەو یارمەتییەی باسی دەکرێ بە ئێمە بگەیشتایە، لەمێژ بوو لەم شەڕەدا سەرکەوتبووین. تۆ دەبێت بزانی وڵاتی ئێمە زۆر دەوڵەمەندە، لێرە گەلێک کانگەی جۆرەوجۆر هەیە و هەروەها کشتوکاڵی کوردستان لە کاتی ئاساییدا گەلێک زیاترە لە پێویستی ئێمە. ئێمە سەروەت و سامانی خۆمان هەیە.

بەڵام چەک و تەقەمەنی، ئەمانە لە کێ وەردەگرن؟

– بەشی زۆری ئەمەش وەک دەستکەوتی شەڕ لە دوژمن خۆی بەدەست دێنین، ئەمە بە کردەوە وایە. دەشتوانین هێندێکی بکڕین و دەشکڕین. ئەگەر بمانەوێ زۆر زیاتریش دەتوانین لەم رێگەیەوە دابین بکەین. بەڵام پێشمەرگەیەک هیچ کات لەخۆڕا تەقەمەنییەکەی بەفیڕۆ نادا، ئێمە وەک نەریت دەڵێین هەزار فیشەکی سوپای عێراق لە بەرانبەری یەک فیشەکی ئێمەدا. رێژەکەی لە سەریەک وا حیسێب دەکرێ.

روونکردنەوەی تۆ بۆ ئەوە چییە کە تا ئێستە دنیا زۆری بایەخ نەداوە بەم بارودۆخەی لە کوردستاندا لە گۆڕێیە؟

– من دەتوانم ئەم پرسیارە تەنیا بە پرسیارێک وەڵام بدەمەوە کە چۆنە رووداوێکی تیرۆریستی، یان رفاندنی فڕۆکەیەک بەپەلە مانشێتی گەورەی هەواڵەکان ساز دەکات؟ بەڵام کاتێک گەلێک بە تەواوی خەریکە لەناو ببرێ، سەدان مرۆڤی بێتاوان رۆژانە بە پێش چاوی دنیاوە دەکوژرێن کەچی دنیا لە بەرانبەریدا بێدەنگە؟ من لەمە تێ ناگەم.

ئێوە تەنیا باسی خۆبەڕێوەبەری دەکەن، بەڵام مانای ئەمە لە کردەوەدا چییە؟

– مانای ئەمە خۆبەڕێوەبەری لەناو عێراقێکی دیموکراتیدا، ئێمە

نامانەوێ تاقمێک جەنەراڵ حوکمـمان بەسەردا بکەن، ئێمە بڕوامان بە دیموکراسی هەیە - ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان، دیموکراسی بۆ عێراق.

لە راستیدا ئەمە وا نییە، کە ئێوە سەربەخۆیی تەواوتان بوێ؟

- من ناتوانم بەرسڤی ئەم پرسە بدەمەوە. تەنیا خەڵکە دەتوانێ لەم بارەوە وەڵام بداتەوە. من تەنیا ئەوە دەتوانم بڵێم، کە جارێکی تر ئێمە بڕوا بە درۆیەکانی دەوڵەت ناکەینەوە.

بەڵام ئەگەر خەڵک خوازیاری سەربەخۆیی بن؟

- خەڵکی کورد ریالیستن، خەڵک و پارتی هەر هەمان شتن، - پارتی تەنیا داخوازییەکانی خەڵک دەخاتە ڕوو - ئێمە داوای شتی نامومکین ناکەین. ئێمە دەتوانین خەون بەسەربەخۆییەوە ببینین، بەڵام راستییەکە شتێکی ترە. کاتێک ئێمە باسی ئۆتۆنۆمی دەکەین بە جیدیمانە و لەم بارەیەوە راستبێژانە قسە دەکەین.

ئەی گەورەترین گرفتی ئێوە لەم کاتەدا چییە؟

- گەورەترین گرفتی ئێمە ئەوەیە چۆن بتوانین گەلانی دنیا لە دۆخی خۆمان تێ بگەیێنینە کە چۆن تەنیا بەهۆی داوا رەواکانی خۆمانەوە خەریکن لەناومان ببەن. کورد ناتوانن تەنیا بە هەوا بژین، ئێمەش گیان لەبەر و مرۆڤین. ئێستە خەلە و خەرمانی ئێمە دەسووتێ، خەڵکی بێتاوان دەکوژرێن، - تەنیا لەم حەفتەیەی دواییدا ١٣٦ کورد لە عێراق هەڵواسراون - من دەتوانم ئەگەر بتەوێ ناوی ٧٠ کەس لەوانە بدەم بە تۆ. بەو حاڵەش دنیا نقەی لێوە نایە، نەتەوە یەکگرتووەکان تەنانەت حازر نییە باسی کێشەکە بکات. یانی دنیا پێی وایە ئێمە هیچ نرخ و بایەخێکمان نییە؟ من دڵنیام ئەگەر بە جێگەی ئێمە ئاژەڵ بەم شێوەیە لەناو ببرایەن دنیا وەدەنگ دەهات، بەڵام تەنیا چونکە کوردین گوێی خۆیانی لێ دەخەوێنن. تۆ پێت وایە ئەمە رەوایە لە بەرامبەر ئێمەدا دەکرێ؟

من باسی سەفەرەکەی بادینانی خۆم بۆ مەسعوود دەکەم و ئەو بۆچوونەی لەگەڵدا دێنمە بەرباس، کە عێراق دەیەوێ ئەم دوو ناوچەیە لێک دابڕێ و خەڵکی ئەو دەڤەرە لە برسان قڕ بکات؟

- ئەوەی تۆ پێی گەیشتووی بە تەواوی راستە. زیاتر لە نیو میلیۆن کورد لە بادینان لەژێر هەڕەشەی مردندان، ئێمە بە تەواوی ئاگەداری ئەوەین. هەموو ئەوەی لە دەستمان بێت بۆ پێشگری لەو پیلانەی دەوڵەت دەیکەین، بەڵام بۆمباران و تۆپباران بارەکەیان زۆر دژوار کردووە. کارەساتەکە خەریکە رۆژ بە رۆژ نزیک دەبێتەوە. زیاتر لە نیوەی ئازووخەی کۆگاکانی خۆمان بۆ ئەو بەشەی وڵات ناردووە - بە شەو و بە رۆژ کار دەکەین تا کاری گواستنەوە و گەیاندنی ئەم پێویستییانە تەواو بکەین - بەڵام نازانین دواتر چۆن دەبێت، دەزانین تەنانەت ئەگەر هەموومان بمرین خاچی سووری ناوەدەوڵەتی بۆی گرینگ نییە و گوێ نادات بە ئێمە.

پێشمەرگەیەک دێتە ناو، شتێک بە کوردی بە مەسعوود دەبێژێ و ئەویش روو لە من دەڵێ:

- ئێستە تۆ دەتوانی بچی باوکم ببینی.

لاندرۆڤەرێک لە دەرەوە راوەستاوە. پێشمەرگەیەک بە تفەنگێکەوە لە پشتی فەرمان دانیشتووە و لە حاڵێکدا تەنیا چرای "پارکینگ"ی هەڵکردوون لە تاریکیدا بەرەو شوێنی مەبەست رێ دەکەوین.

هێندێک بە جادەی هامیلتۆندا دەڕۆین و من پێ رادەگەم پێش ئەوەی لابدەین بۆ جادەیەکی شاخاوی، ببینم کەوا حاجی ئۆمەران بەجێ دێڵین. ئەسڵەن تێ ناگەم بە کوێدا رۆیشتین بەڵام دەبینم دەزگایەکی "بەرزی پێو" لەپێش شووشەی ماشینەکەوە دانراوە و لە رێگەی ئەوەوە دەزانم کە پێش ئەوە لە کن ماڵێکدا دابەزین بەرزایی شوێنەکەمان دەگاتە ۱۹۰۰ مەتر. لەبەر تاریکی من دەوروبەر نابینم بەڵام هەست دەکەم لەسەر ملی

یاڵێکەوەین کە بە لووتکەی بەرزی شاخان دەورە دراوە.

ڕووناکییەکی سپیی تیژ، لە درزی دەرگەیەکەوە دەردەکەوێ، سیامەند چەند وتەیەک لەگەڵ پێشمەرگەیەکدا ئاڵوگۆڕ دەکات و دوایە ئێمە دەچینە ناو.

مستەفا بارزانی بە تەنێ لە ژوورێکدا چاوەڕوانیی ئێمە دەکات. ڕووناکییەکە هی دوو چرا فانۆسە، کە لە گۆشەیەکی ماڵەکەدا هەڵکراون. چەند تەختی جوان دانراون و یەک دوو مێزی کورتیش لەپێش تەختەکانەوەن. بارزانی داوا دەکات ئێمە لەسەر تەختەکان دانیشین، بۆ خۆشی ڕووبەڕوومان دادەنیشێ و پێشمەرگەیەکیش زوو بە سینییەک چاوە دێتە ژوورەوە.

من بە وردی لە بارزانی، ئەم شەڕوانە پیرەی ڕێی ئازادی، ورد دەبمەوە، نیگای تیژی لەژێر برۆیە پڕ و ڕەشەکانییەوە سەرنجم رادەکێشێ. جامەدانییەکەی شل پێچراوەتەوە و تۆزقاڵێک قژی ڕەش لە گۆشەیەکیەوە هاتوونەتە دەر. گران و سەنگین دانیشتووە و دەستەکانی لەسەر سکی داناون. تەمەنی ٧٤ ساڵە بەڵام زۆر چاک ماوە و بە هیچ شێوەیەک تێکشکان بە ڕوویەوە دیار نییە. خەنجەرێکی لەبەر پشتوێندایە و بە قامکی خەریکی سووڕاندنی دانەی تەسبێحەکەیەتی.

من دیارییەکم لە سوێدەوە بۆ بردووە، هێندێک سەرکی گوڵ، کە هەموو ساڵێک دەڕوێنەوە. من بیستوومە ئەم پیرە جەنەراڵە حەزی لە گوڵە و پێیان وتووم لەگەڵ خۆمدا ئەمانەی بۆ ببەم. من ئەو کیسەیەی کە سەرکە گوڵەکانی تێدان، دەدەمە دەست سیامەند و داوا دەکەم بۆی باس کات، کە ئەمانە چین.

بارزانی بە بایەخەوە گوێ دەگرێ، کیسەکان دەکاتەوە و دەردەکەوێ هیچ کات نەیبیستووە، کە بەم شێوەیەش دەکرێ گوڵ بچێنرێن.

من بۆی باس دەکەم، کە وەرزەکانی ساڵ لە سوێد و لە کوردستاندا

مەیلەو وەک یەکن، ئەگەر ئێستە لە پایز ئەم سەرکانە بخەیتە ژێرخاک بۆ بەهار دێنە دەر و سەوز دەبن. ماوەیەک بە حەوسەڵەوە سەیری دیارییەکەی من دەکات و بیری دەڕوا بۆ لای گوڵەکان.

من بە کورتی بۆی دەگێڕمەوە لەم ماوەیەی لە کوردستان بووم چیم کردووە. بۆی باس دەکەم کە سەردانی بادینان و بەرەکانی شەڕم کردووە. دەڵێم لەم ماوەیەدا ئەوەی لە کوردستان دیومە هەم کاری تێ کردووم و هەمیش بووەتە هۆی سەرسووڕمانم و هیوادارم ئەم شەڕە هەرچییەک زووتر کۆتای پێ بێت.

لە بارزانی دەپرسم داخوا هیچ ئیمکانێکی تر بۆ دانوستاندن نەماوە؟

- من پێم وا نییە جیاوازییەک لە نێوان خەڵکی کورد و خەڵکی تردا هەبێت، لە دنیا تەنیا رەگەزێک هەیە ئەویش رەگەزی مرۆڤایەتییە. تەنیا جیاوازی لە شێوەی هەڵسوکەوت و هەلومەرجێکە، کە خەڵکی تێدان. ئەوەی کە کورد بەم شێوەیە هەڵسوکەوت دەکەن و کاردانەوە نیشان دەدەن پێوەندیی بەوەوە هەیە ئێمە دوژمنێکی دڵڕەق و بێ بەزەییمان هەیە. ئێمە لە دنیا دابڕاوین، ئێمە مەیلەو هیچ دۆستێکمان لە دنیادا نییە، ناچار کراوین بچینە شەڕی دوژمنێک کە هیچ هەستێکی مرۆڤانەی نییە، دوژمنێکی دڕندە و بێ بەزەیی. لە بەرانبەر ئەم تاوانانە گەلی کورد ناچار بووە هێزی خۆی نیشان بدات. من دەزانم گەلێک خەڵکی تر هەن کە پیاو دەتوانێ بەراوردیان بکا لەگەڵ گەلی کورددا . هەر لە سەرەتای مێژووەوە مرۆڤ لە بەرانبەر هێرش و پەلاماری زۆرداردا بەرخۆدانی کردووە و ئەوەی ئێستەش ئێمە دەیکەین هەر ئەوەیە. ئێمە لە وڵاتی خۆماندا بەرگری لە خۆمان دەکەین، ئێمە تەنیا داوای ئەوە دەکەین لە وڵاتی خۆماندا مافی ژیانمان هەبێ. بەڵام رەنگە ئێستە دنیا وای لێ هاتبێت، تەنیا گەلی کوردە بێ کە خەبات بۆ ئازادی و دادپەروەری بکات.

من لەسەر سوید لێی دەپرسم، داخوا ئەو چی لەبارەی سویدەوە دەزانی؟

– من هەستێکی تایبەتیم بۆ سوید هەیە، من دەزانم سوید پێشکەوتنی باشی بە دەست هێناوە و هەنگاوی گەورەی لە ڕێگەی پێشکەوتندا ناوە. من سویدییەکان بە برای خۆم دەزانم. من گەرمکمە سوپاسی ئێمە بە دەوڵەت و خەڵکی سوید بگەیێنی بۆ ئەو یارمەتییانەی بە ئێمەیان کردووە.

بەڵام بەو شێوەیە نییە، ئێوە هیچ یارمەتییەکتان لە سویدەوە پێ نەگەیشتووە؟

ئەم پرسیارە هێندێک خوڵکی تێک دەدات و نازانێ بە تەواوی چۆن وەڵام بداتەوە، دوای تۆزێک دەڵێ:

– ئێمە سوپاسی ئەو هاودەردییانە دەکەین سوید نیشانی داوە لەگەڵ ئێمە و هیوادارم، ئێستەکە تۆ لە نێزیکەوە راستییەکانت بینیون، باسی ئێرە بکەیت بۆ سویدییەکان و داوایان لێ بکەیت لەم بارەیەوە کاری زیاتر بکەن. وەک وڵاتێکی مۆدێرن، دەوڵەمەند و پێشکەوتوو ئەوە ئەرکی سویدە شتێک بکات، کە ئەم شەڕە راوەستێ.

من زۆرم پێ خۆشە چەند رۆژێکی لەگەڵدا بم بەڵام لام وایە کە داوایەکی لەو جۆرە زۆر ژیرانە نەبێت.

ئێستە سات لە یەکی شەو تێ پەڕیوە و من کەمێک تێ گەیشتووم، ئەوە لە شەودایە ئەم شۆڕشەی کورد پلانی بۆ دادەنرێ و رێبەری دەکرێ. لەم کاتەدا بێدەنگی بەسەر گشت بەرەکانی شەڕدا زاڵە و چرای هەموو ماڵان و ئاگری گوندان کوژاوەتەوە و خەڵکی لە گەرمەی خەودان بەڵام ئەم پیرە جەنەراڵە هێشتا هۆشیارە و خەریکی ئەرکەکانیەتی.

– من زۆرم پێ خۆشە گوێم لێت بێت باسی ژیانی خۆتم بۆ بکەیت، بەڵام دەزانم ئێستە درەنگە و ئەم شتەش کاتی فرە دەگرێ. رەنگە من بتوانم جارێکی تر، دوای شەڕ تۆ ببینمەوە؟

- بەڵێ، تۆ هەر کات بخوازی بەخێر بێیت بۆ کوردستان.

لەبەر خۆمەوە دەڵێم بە راستی گەورەپیاوانی دنیا لە بەرانبەر ئەم پیاوەدا چین؟ شای ئێران، کیسنجەر، پالمە، ویلسۆن لە بەراورد لەگەڵ مستەفا بارزانیدا چ شتێکن؟ رەنگە ئەو دوایین رێبەری خەڵک و هەروەها تاکە رێبەری لەو جۆرە بێت.

شەو لە رێگەی گەڕانەوەماندا هەموو ئەو رک و دڵتەنگییەی لە گەرووی سیامەنددا کۆ بووبوونەوە تەقییەوە و منیش لێ گەڕام تا هەرچییەک لە دەروونیدایە هەڵی رێژێ و بیهێنێتە سەر زمانی، بۆیە نە گازەندە و نە پرسیارێکیشم لێی کرد:

- دەزانی، هەر لە ساڵی ١٩١٩ەوە، کە بۆ یەکەم جار لە مێژوودا کورد کرانە ئامانجی بۆمبارانی فڕۆکە، تا ئێستە ئێمە لە بەرامبەر شەڕێکی هێرشکارانەین. ئەمە راستییەکە. لەم ماوەیەدا بۆمان دەرکەوتووە کە "دەوڵەت" وەک لە سوێد و وڵاتانی ئەوروپایی مانای یارمەتی و خزمەت نییە بگرە ئەو شتەیە کە کوڕەکەت بوو بە ١٨ ساڵ دێت دەیبات، دەیکاتە سەرباز و بە مردوویی یان وەک پیاوێکی تێکشکاو بۆت دەنێرێتەوە ماڵ. "دەوڵەت" واتا پۆلیسێکی دڕندە و بێ هەست کە دێتە سەرت، وەبەر شەقانت دەدا و پوول و پارەکانت لێ دەستێنێ. "دەوڵەت" واتا کارمەندێک کە لە پشت مێزی نووسینەکەی دانیشتووە و ئیزن و قەباڵە دەردەکات بێ ئەوەی بچووکترین شت لە کارەکەی خۆی بزانێ، بگرە ئەوەی بۆی گرینگە ئەوەیە چۆن بەرتیلی زۆرتر وەرگرێ و گیرفانی خۆی پڕ بکات. "دەوڵەت" لای ئێمە مانای هەموو شتێکی خراپ، نەشیاو و ناحەقییە و ئەمەش وەک ئەزموون بۆ سێ بەرە و وەچەی ئێمە ماوەتەوە.

- کوردستان رەنگە وڵاتێکی هەژار بێت، ئەگەرچی پێویست نەبوو وا بێت. بەڵام بەو حاڵەش و دوای ئەم گشت وێرانییە دیسان ئێمە خۆمان لە لا

وڵاتێکی پێشکەوتووە، چونکە لێرە هەر کەس دەتوانێ بۆچوونی خۆی بڵێ بێ ئەوەی لە هیچ بترسێ. ئێمە لەم بارەوە بە شتێکی بە نرخ گەیشتووین. هیچ کەس لە کوردستان کڕنووش بۆ کەس نابات و لە داهاتووشدا ئەم کارە ناکەین. بەڵام لە ماوەی ١٢ ساڵدا ئێمە لە دژی دوژمنێک شەڕ دەکەین، کە خراپترینە لە هەموو دنیا و لە هیچ جێگەیەکی تر وڵاتێک نییە لە عێراق خراپتر بێت.

- ئێمە داوامان لە خاچی سوور کردووە، لە بەریان پاڕاوینەتەوە و دەست و پێمان ماچ کردوون. وتوومانە کەسێک بنێرن تا لە نزیکەوە دۆخی ئێمە ببینن، بەڵام لە وەڵامدا دەڵێن "ئێمە ناتوانین" دەبێت لە ڕێگەی یاسایی و دەوڵەتەکەتانەوە بێت" دیارە خوێنی کوردێک لە بەرمیلێک نەوت کەم بایەخترە.

- بۆ نموونە سەرەک وەزیری فینلاندا کە ناوی "سورسا"یە. سەرۆکی کۆمیتەی دۆستایەتیی کوردستان - فینلاند بوو. کاتێک بوو بە سەرەک وەزیر ئێمە چەندە خۆشحاڵ بووین، وتمان دەبێ کارێک دەکات. بەڵام هەرکە گەیشتە پۆستەکەی هەڵسوکەوتی گۆڕا و دەیگوت من پێش هەر شتێک لە بەرانبەر خەڵکی خۆمدا بەرپرسم و هێندێک شت هەیە من لەم پۆستەدا ناتوانم بیانکەم. دیارە فینلاندە هێندێک بەرژەوەندیی لە عێراقدا هەیە و ئەمەیە کە بۆ ئەوان گرینگە نەک چارەنووسی ئێمە. دیارە هەمان شت بۆ وڵاتەکەی تۆش ڕاستە. تۆ دەتوانی بە تەواوی دڵنیا بی، کە سەرەک وەزیرانەکەت، پاڵمە، زۆر چاک دەزانێ چی لە کوردستاندا ڕوو دەدات. ئەو دەزانێ ئێمە مافی خۆمانە بەڵام بەرژەوەندیی بازرگانیی سوێد بۆ ئەو گرینگترە - گرینگتر لە مان و مردنی سەرجەم خەڵکی کورد.

- هەر لەبەر ئەوە نییە، کە دنیا نازانێ چی بەسەر ئێمە دێت بۆیە گوێمان پێ نادات، نا، بگرە لە بەر ئەوەیە کە بناخەی دنیا لە سەر پرەنسیپی مرۆڤی

و یەکسانی دانەنراوە. لەبەرئەوەیە دنیایەکی نامرۆڤانە، چەپەڵ و گەنیوە. من بە تەواوی لەم دنیایە بێزارم و پێم خۆشە ژێروژوور بێت.

– بەڵام ئێمە دەبێت بە دنیا بڵێین بڕۆن چارەتان ون کەن، ئێمە بێ ئێوەش دەتوانین درێژە بە ژیان بدەین و کێشەکانی خۆمان چارە بکەین. ئێمە دەبێت دەرسێکتان فێر کەین، دەرسێک لە بیری نەکەن.

## داوا لە خەڵکی خۆتان بکە یارمەتیمان بدەن

من وردە وردە گەیشتوومە ئەو ئەنجامەی بەرەو ماڵ بگەڕێمەوە، بەڵام بڕیارم داوە بگەڕێمەوە دواوە بۆ بەرەی شەڕی باڵەکایەتی و ئەم دوا شەو و رۆژەم لە کوردستان لەوێدا ببەمە سەر.

هەموو ئەوەی من ئەم ماوەیە لە کوردستان بینیومە لەو شوێنە گیر بووە، لە کێوی گەرووی عومەر ئاغا. لەگەڵ سەعدوڵڵا قسەم کردووە و بە خۆشحاڵییەوە ئامادەیە لەگەڵمدا بێت بۆ ئەوێ.

بەڵام کتوپڕ دێینە سەر باسی مەترسییەکان، لەبەرئەوەی من پێشتریش جارێک دوو رۆژ لەو بەرەیەدا بووم - دەبێت جارێکی تر بگەڕێمەوە ئەوێ؟ سەعدوڵڵا پێشنیاز دەکات ئەگەر بچووکترین گومانم هەیە نابێت بڕۆم، هەروەها ئێمە وا درەنگ وەخت لە لای جەنەراڵ گەڕاوینەوە ئەگەر بشڕۆین نێزیک رۆژبوونەوە دەگەینە ئەوێ. - ئەمە زۆر گرینگە، چونکە من جارێکی تر نامەوێ بە رۆژ و لە بەرچاوی فڕۆکە مێگەکانەوە بگەڕێمەوە ئەو جێگەیە.

من دەڕۆم بۆ لای سەعید دزەیی بۆ ئەوەی ماڵاواییی لێ بکەم و شتێکیش، کە ماوەیەکە بیری لێ دەکەمەوە. دەمەوێ ئەو بۆم روون کاتەوە:

ئەو شتەش پێوەندیی بە نەوتەوە هەیە، راستی باری نەوت لە عێراق ئێستە چۆنە؟

- بەعسییە فاشیستەکان خەریکن خەڵک وا تێ دەگەیێنن کە ئێمە لەبەر ئەوە پێشنیازی ئۆتۆنۆمیی ئەوانمان پەسند نەکرد ویستوومانە دەست بەسەر چاڵە نەوتەکانی کەرکووکدا بگرین. بەڵام ئەمە بە تەواوی دوورە لە

راسـتـيـيـەوە. گـەلێک بەڵگەی مـێژوویی لە بەردەسـتدان کە کـورد زۆر پێش ئەوەی شـتێک بە ناوی نەوت لە عێـراقی ئێستـەدا بدۆزرێتـەوە، خـەباتیـان بۆ سـەربەستیی خۆیان کردووە، تەنانەت پێش ئەوەی نەوت لە هـەمـوو دنیاشـدا دۆزرابێتـەوە. بۆیە نەوت ئامـانج نییـە لـە خـەباتی ئێمـەدا. دیـارە بە شـێـوەی سـروشـتی کـەرکـووک خـۆی وەک بەشـێک لە کـوردسـتـان بۆ ئێـمـە گـرینگە. کاتێک باس دێتە سەر سنووری ناوچەی ئۆتۆنۆمی، ئێمە ئامادەین دەست لە هـێندێک جـێگـە لە رۆژاوا و رۆژهـەڵاتدا هـەڵبگرین، بەڵام لەسـەر کـەرکـووک دانوستاندن ناکەین، کەرکووک کوردستانە و هەردەمیش کوردستان بووە.

لێرە من یەکێک لەو تازە هاتووانە دەبینم، کە ئەو بەیانییە گەیشتووە، ئەو لـە سـۆڤـیـەتەوە هـاتووە، هـەمـوو ئەورووپـا و رۆژهـەڵاتـی ناوینی بـڕیوە تـا گەیشـتووەتە کوردسـتانی ئازاد. تەمـەنی ۲۸ سـاڵە و خزم و کـەسـی لە شـاری کەرکووکە و هەر لەبەر ئەوەش داوای لە من کرد بە ناوی خۆی باسی نەکەم. ئەو لە سـاڵی ۱۹۷۰ەوە لە سۆڤیەت دەرسـی خوێندووە و سـەرەڕای ماندوویی رێگە، خۆشحاڵە بۆ یەکەم جار لە ماوەیەکی زۆردا دەتوانێ سەربەست قسە بکات و لەم بارەیەوە دەڵێ:

– ژیان لە سۆڤیەت کـارێکی هاسان نییە، دەوڵەتێکی پۆلیسییە، قوتابییە بیانییەکان ئەگەر بیانەوێ زیاتر لە ۱۰۰کم بۆ دەرەوەی مۆسکۆ بڕۆن دەبێت ڤـیـزا وەرگـرن. ئێـمـە هـەردەم لەژێر چاودێریدا بووین و جـاسـووسـیـان بۆ دانابووین. کـام رۆژنامەمـان دەخوێندەوە، کـام رادیۆمـان گوێ لـێ دەگرت یان هەرچیمان دەکرد، دەیاننووسی.

کـاتێک خـوێندنەکەم تەواو بوو هێشـتـیـان بگەڕێمـەوە بەغدا، بلیـتـەکەم بۆ بەغدا بوو نەک شـوێنێکی تر. من چوومـە باڵوێزگەی سـوێد و داوای ڤـیـزام کـرد، هـاوکـات کـۆپیـیـەکی بڕوانامـەی خـوێندنەکـەم پـێ دان، بەڵام کاربەدەسـتـانی سـۆڤیـەت نەیانهێشت من لەسـەر ڤـیزای سـوێد راوەسـتم و بەنیـاز بوون بمنێـرنەوە عێـراق. من بە دزییـەوە چوومـە بەرلـینی رۆژهـەڵات،

لەوێشــەوە چوومــە ئاڵمــانیــای ڕۆژاوا و لە ڕێگەی لبنانەوە خـۆم گـەیاندەوە ئێرە.

ئەو خۆشحاڵە بەو شتە کەمەی تا ئێستە لە کوردستاندا دیویە و دەڵێ:

- ئێــرە وڵاتێکی ئازادە و خــەڵکی خــاوەن ورە و ورەیەکی بەرزن، لە ڕۆژنامـەی "پراڤدا"دا وەک شـتێکی دواکەوتووانەی راسـترۆیانە باسی ئەم شـۆڕشـەی کورد دەکرا گـوایا لە لایەن ئەمـەریکاوە پشـتگریی لێ دەکرێ. دیارە من دەمزانی ئەمە درۆیە بەڵام ئێستە لە نزیکەوە خۆم توانیومە ببینم دۆخـەکـە زۆر لەوەش باشـترە من پێم وا بـوو. من خۆشـحاڵم لێرەم و هەوڵ دەدەم ئەوەی لە دەستم دێ بۆ ئەم شـۆڕشەی بکەم. بەڵگەی خوێندنەکەم هەر ماوە فۆتۆکۆپییەکانی هێشتا لە باڵوێزگەی سوێدن لە مۆسکۆ.

سەعدوڵلا بڕیارە لەگەڵمدا بێت بۆ رەزائیە لە دیوی ئێران، بەڵام من داوای لێ دەکـەم لە حـاجی هۆمـەران راوەسـتێ، ئاخـر من هێـشـتـا ئەو شـوێنەم نەبینیـوە، کە سـاڵی ١٩٧١ تێدا هێـرش کرایە سـەر مسـتـەفـا بارزانی. من زۆرجـار ئەم داسـتـانـەم بیسـتـووە، بەڵام هێشـتـا بڕوام پێ نەکردووە. - ئەم داسـتـانە زیاتـر وەک داسـتـانە سـازکـراوەکـانی "جێـمس بـوند" دەچێ، کە لە لایەن چەند کەسی شێتەوە ساز کرابێ.

کوردیش لەوە تێ دەگـەن کە بڕواکردنی ئـەم داسـتـانە دژوارە و هـەر لەبەر ئەمـــەشـــە شـــوێنەکـــەیان هەروەک خـــۆی و وەک جـــۆرە مـــۆزەخـــانـەیەک هێشتووەتەوە. چیرۆکەکە بەم جۆرەیە:

بارزانی سـاز بووبوو مێـوانداریی هێندێک شێـخی عەرەب، کە خـوازیاری بینینی بوون بکات تا لە نزیکەوە باسی کێشەکان بکەن. شێخە عەرەبەکان کـە ٩ کــەس بوون بە دوو ترۆمــبـێل لە بەغـداوە گــەیشتن و کــورد وێڕای بەخێرهێنان بردیانن بۆ ئەم مـاڵەی جێی باسی ئێمـەیە لە حـاجی ئۆمـەران. یەکێک لە شێخەکان دوو کتێبی پیرۆزی وەک دیاری دایە بارزانی و تێکڕا بە

دەوری یەکتردا لەو ماڵەدا دانیشتن و پاڵیان بە دیوارەکانەوە دا. بارزانی دانیشت دەستی بە قسە لەبارەی ئاین و برایەتییەوە کرد. هاوکات شێخ "ئیبراهیم خوزاعی"، کە لە ڕووبەڕووی بارزانییەوە دانیشتبوو تەقییەوە و بوو بە دوو لەتەوە. ئێستەش پیاو دەتوانێ هێندێک لە ریخۆڵە و ناوسکی شێخ خوزاعی بەسەرمیچی ماڵەکەوە ببینێ.

جگە لەم شێخە هاوکات شێخێکی تر، کە لە تەنیشت بارزانییەوە دانیشتبوو و پێشمەرگەیەکیش ئەو چرکە ساتە خوار بووبووەوە تا چا بۆ شێخ خوزاعی دانێ و بە لەشی خۆی بووە هۆی ڕزگاربوونی بارزانی لە مردن. بارزانی خۆی بە تەنیا چەند برینێکی سووک ڕزگاری بوو.

شێخە عەرەبەکان لە پێوەندیدا بوون لەگەڵ دەوڵەتی عێراقدا، شێخ خوزاعی پێی سپێردرابوو کە لە رێگەی رێکۆردەرێکەوە کە لەژێر عەباکەیدا شاردبوویەوە هەموو گفتوگۆیەکە تۆمار بکات و دوایە بیداتە دەست کاربەدەستانی دەوڵەت، بێ ئەوەی ئاگەدار بێت ئەمە بۆمبە و هەرکە دەستی پێدا نا تۆماری قسەکانی بارزانی بکات، تەقییەوە و بۆ خۆشی بووە قوربانی.

دوای تەقینەوەکە هەرایەکی زۆر بەرپا بوو، شێخەکان هەوڵیان دا لە ژوورەکە بچنە دەرەوە و بە قسەی هێندێک تەنانەت نارنجۆکی دەستیشیان هاوێشت، کە لەژێر جلەکانیانەوە شاردبوونیانەوە. کوردیش دوای ئەمە هاتنە دەست و تا هەر نۆ مەلاکە و دوو شۆفێرەکانیان نەکوشتن دەستیان هەڵنەگرت. دیارە شۆفێرەکان ڕێبەری ئەم "کودەتایە" بوون.

دەستەی عێراقییەکان بە جێبێکی تویوتا و شێفرۆلێتێک هاتبوون. دوای نیو سات جێبەکە تەقییەوە و بە هۆی ئەوە کەسی لە دەورەوە نەبوو زیانی گیانیی لێ نەکەوتەوە. هەڵبەت ئێستەش لەتەکانی ئەم جێبە لەو ناوە کەوتوون. پێشمەرگەیەکی ئازا شێفرۆلێتەکەی لەو ناوە دوور خستەوە و

دوای پشکنین دەرکەوت سەروبنی بە تەقەمەنی پڕ کراوە. هەروەها هێندێک شتی تری تایبەتی لەم ماشێنەدا هەبوون بۆ نموونە جێگەی دامەزراندنی ڕۆکێت هاوێژ تا ئەگەر کەسێک دوایان کەوت بە هاسانی بتوانن تەقەی لێ بکەن.

لە ماڵەکەی حاجی ئۆمەراندا هێشتاش ئاسەواری ئەو ڕووداوە خوێناوییە دەبینرێ، ئەو کورسییەی کە "بۆمبە زیندووە"کەی لەسەر دانیشتبوو پان بووەتەوە و میچ و دیوارەکان خوێنیان پێوە دیارە. ئەم ڕووداوە ڕۆژی ۲۹ی ئەیلوولی ۱۹۷۱ ڕووی داوە و ئێستە من ئیدی بڕوا دەکەم، کە ڕاستە.

ئێستە لەسەر سنوور لە چاو پێشوو ئاوارە کەم بوونەتەوە و بەشی زۆریان بۆ کەمپ و چادرگە لەناو خاکی ئێران گوازراونەتەوە. بەڵام ئێستەش خەڵکی نوێ هەر دێن و ناچارن لەسەر سنوور ڕاوەستن تا نۆرەیان دەکات.

کاتێک من دەگەمە سەر سنوور هیچ کەس کۆنترۆڵی پاسپۆرتەکەم ناکات و بێ کێشە لەو دارچنارە، کە وەک کۆسپ و پێشگر لە ڕەتبوونی خەڵک دانراوە تێ دەپەڕین. دوای ئەوە دەڕۆین بۆ یەکێک لە چادرگەی ئاوارەکان، کە بەدیوی ئێران لە بەرزاییەکدا هەڵکەوتووە. شارێکی چادرین، کە لە پاڵ یەکتردا بەڕیز هەڵدراون و زۆربەی دانیشتوانەکەی ژن، منداڵ و پیرەپیاون.

لێرە من "زەکیە ئیسماعیل" سەرۆکی یەکێتیی ئافرەتانی کوردستان و ئەندامی کۆمیتەی ناوەندیی پارتیم بینی. ئەو نوێنەرێکی دیاری ژنانی کوردستانە، ژنێکی زۆر تێگەیشتوو، جوان و وریایە. ئەو هەر لە سەرەتاوە بەشداریی شۆڕش بووە، ساڵی ۱۹۳۹ لە بەغدا لەدایک بووە، ساڵی ۱۹۵۷ بڕوانامەی پارێزەریی وەرگرتووە و لەو دەمەوە تا ئێستە وەک پارێزەر کار دەکات. زەکیە لەو کەسانەیە، کە باش پێ گەیشتوون، بەڵام هەر لە ۱۹٦۳ەوە بە دڵ و گیان خەریکی کاری شۆڕش بووە و لە پێناو ئەوەش گیراوە. بۆ خۆی لەم بارەیەوە دەڵێ:

– من بە هەرسێ منداڵەکەمەوە ماوەی دوو مانگ لە گرتیگەدا مامەوە، بچووکترینی منداڵەکانم تەنیا ٤٠ شەو تەمەنی بوو و سەرەڕای نەخۆشیشی هیچ خەمخۆری و چارەسەریکیان بۆ نەدەکرد. چاک بوو باوکم سەرەنجام توانی لە ریگەی بەرتیل و پارەدانەوە من لەو چاڵە رەشە دەربێنێ.

زەکیە خۆی پێش دەست پێکردنەوەی شەڕ لە ١١ی ئاداری ١٩٧٤ بەغدای بەجێ هێشت و هات بۆ کوردستان، بەڵام منداڵەکانی هەر لەوێ مابوونەوە و لە سەروبەندی هەڵگیرسانی شەڕدا هەموو هەولێکی بۆ پێوەندی گرتن پێیانەوە بێ ئەنجام بوو. لە سەرەتای مانگی ئایاردا پۆلیس لە نیوەی شەو رژانە سەر ماڵەکەیان، منداڵەکان، مامێک و پوورێکیان لەگەڵ ٢٤ بنەماڵەی تری کورددا باری ئۆتۆمۆبێلیان کرد و هێنایانن بۆ هەولێر، لەوێش وەک زۆرجار و کەسی تر پێیان وتن: بڕۆن بۆ لای رێبەرەکەتان مەلا مستەفا.

ئەوانیش کە گرووپێکی گەورەی ژن و منداڵ بوون بە پێیان، دوای حەوت شەو و رۆژ گەیشتبوونە گەلی عەلی بەگ، کە دۆڵ و دەربەندێکی چۆڵەوانییە و لە حاڵێکدا لاقەکانیان لەبەر دژواریی رێگە ئاوسا بوون بێ گوێدانە مەترسی بەرەو بەرەی شەڕ هاتبوون. بێ ئەوەی بە خۆیان بزانن راست کەوتبوونە نێوان تەقەی پێشمەرگە و دوژمن. کاتێک دەستەیەک پێشمەرگە هەستیان پێ دەکەن لە دوورەوە بانگیان دەکەن و دەپرسن ئێوە کێن و لە کوێوە هاتوون؟ ئەوانیش وەڵام دەدەنەوە کە لە بەغداوە، پێشمەرگە دەڕۆنە نێزیکتر، لە پشتوێنەکانی خۆیان تەنافێک ساز دەکەن و دانە دانە لە دڕناڵی بەردێکەوە هەڵیان دەکێشنە سەر و بەم شێوەیە ڕزگاریان دەکەن. نزیک بە ١٢٠ منداڵ بەم شێوەیە گەیشتوونەتە کوردستان، کە ئاسەواری ئەو ساتە تاڵانەیان پێوە دیارە و لەباری دەروونییەوە ناڕەحەتیی گەورەیان بینیوە.

زەکیە لەگەڵم دێت تا پێکەوە دەورێکی کەمپەکە بدەینەوە، من لەگەڵ هێندێک کەسی تردا قسە دەکەم و سەرجەمی چیرۆکەکانیان وەک یەکە:

ناچار کراون ماڵ و حاڵیان بەجێ بهێڵن، ڕێگەی کوردستان بگرنە بەر و بە زەحمەتێکی زۆر گەیشتوونەتە ئێرە. یان کەسانێکیان لە ترسا و پێش ئەوە دەستی پیاوانی ڕژێمیان بگاتە سەر ماڵەکانیان بەجێ هێشتووە و ئێستە لەم کەمپەدا بەو هیوایەی ڕۆژێک شەڕ تەواو بێت و بگەڕێنەوە، ژیان دەبەنە سەر.

هەلومەرجی ناو ئەم کەمپە مەیلەو باشە، خەڵکەکە وەک پێویست نان و خۆراکیان پێ دەدرێ و هەست بە برسییەتییەکی تەواو ناکرێ، بەڵام بۆ زستان و وەرزی بەفر دۆخەکە دژوارتر دەبێت، بە دیوی ئێرانیش زستانی ئەم ناوچەیە سەخت و سەخڵەت دەرباز دەبێت. دوکتۆرێکی گەنج، کە خۆی لاقێکی بە لەفاف پێچراوە و بە یارمەتیی گۆچانێک دەڕوا بەڕێوە دێتە سەر ڕێگەکەم و پێشم پێ دەگرێ:

– تۆ دەبێت هاوکاریمان بکەیت بەڵکو لە دەرەوە یارمەتیمان پێ بگات، ئێمە وەک پێویست دەوا و دەرمانمان بۆ چارەسەری ئەم خەڵکە نییە و لەبەر ئەوەش هەموو ڕۆژ و شەوێک منداڵ بە پێش چاومانەوە دەمرن. داوا بکە لە خەڵکەکەت یارمەتیمان بدەن.

سەرنجم دەڕوا بۆ لای کوڕێکی بچووک، کە هەر کوێک دەڕۆم وەدوام دەکەوێ. هەوڵ دەدەم قسەی لەگەڵدا بکەم بەڵام وەک ئەوە سێبەرێک بە دوایەوە بێ بۆی دژوارە لە شوێنێکدا ڕاوەستێ و سەیری جێگەیەکی تایبەتی بکات. زەکیە لەم بارەوە دەڵێ:

– ئەم کوڕە دوای ئەوەی کەوتووەتە بەر بۆمبارانێکی خەست و پڕ مەترسی، تووشی جۆرێک شۆک و هەژانی دەروونی بووە، منداڵی لەو جۆرەمان زۆرن بەڵام هەست دەکەم ئەم کوڕە ڕوو لە باشبوونەوە بچێ.

لەگەڵ سەعدوڵڵا شەوەکەی چووینە هۆتێلێکی مۆدێرن و پێکەوە لە ساڵۆنی خواردنەکەیدا نانمان خوارد. گرووپێکی مۆسیقا، بە شێوەیەک، کە

نزیکە گوێمان کەڕ بکەن خەریکی خوێندنی سترانی پۆپن. خەڵکی بەدەور یەکتردا دانیشتوون و بێ ئەوەی هەست بە خەم و نیگەرانییەک بکەن خەریکی خواردن و خواردنەوەن. من لە سەعدوڵڵا دەپرسم ئاخۆ شتێک نییە لەو شۆڕشە ئەو پێی ناخۆش یان خراپ بێ؟

– بۆچی نا، بە بڕوای من پێشمەرگە وەک پێویست ڕێز و قەدریان ناگیرێ، ئەوان حازرن گیانی خۆیان بۆ ئەم شۆڕشە بدەن، خواردنیان لە بەرەی شەڕیش چا و نانی وشکە کەچی قەت گلە و گازندەیەکیان لێ نابیسرێ، بەڵام تاقمێک بورژوا هەن سەرەڕای ئەوە کارێکی بەنرخیش بۆ شۆڕش ناکەن دەرفەتی ماڵ و ئۆتۆمۆبێلی خۆشیان هەیە و هەموو ئەوەشیان لە موڵک و ماڵی شۆڕشەوە پێ گەیشتووە.

من خۆم مانگێک ۳۰ دینار لە شۆڕش وەردەگرم و لە ڕاستیدا ئەوە نیوەی ئەو پارەیە، کە من وەک "ڕێکتۆر" لە کەرکووک وەرم دەگرت. بەو حاڵەش مووچەی ئێستەی من سێ جاران لە هی پێشمەرگەیەک زۆرترە. دیارە ئەمە بە تەواوی خراپ و نادروستە. من کارێکی وا گرینگ بۆ شۆڕش ناکەم، لە ڕاستیدا ئەوە پێشمەرگەن بەردەوام خزمەتی شۆڕش دەکەن و باری هەرە گران لەسەر شانی ئەواندایە. من ئەوەم لا خراوە، کە بەم شێوەیە لەگەڵ پێشمەرگەدا دەجووڵێنەوە.

بەڵام سەرەڕای ئەوەش، کە تۆ دەزانی هێندێک کەس لە سامانی شۆڕش خۆیان دەوڵەمەند دەکەن، لە کاتێکدا هاووڵاتییەکانیان بە دژواری بەرەنگاری دوژمن دەبنەوە، بەو حاڵەش تۆ بە دڵ و گیان پشتیوانی لەم شۆڕشە دەکەیت؟

– ئەی چۆن؟ زۆر سروشتییە، کە من ئەم کارە دەکەم، ئەم جۆرە شتانە بە هاسانی لەناو ناچن، لانی کەم لەم بەشەی دنیا، جارێ نا، ئێمە پێویستمان بە هێندێک کاتە. تۆ دەزانی کە هەموو کوردیش فریشتە نین. ڕوونە منیش

پێم وایە ڕابەرایەتیی جەنەراڵ بارزانی و ئەوانی تر دەبوو کار بۆ نەهێشتنی ئەم دیاردەیە بکەن و هێندێک لەم کەسە بێ نرخانە لابەن بەڵام ڕاستی ئێمە ئێستە هەموو بایەخمان لەسەر شەڕە و کاتمان بۆ ئەم گرفتانە نییە.

تۆ قەت گومانت لەم شۆڕشە نەبووە؟

- نا، هیچ کات، شتی وا لەگەڵ من ناگونجێ.

لەوپەڕی ڕاستبێژی و دڵسۆزییەوە سەعدوڵڵا جۆرێک دوودڵیی پێوە دیارە و من لەبەر خۆمەوە دەڵێم بڵێی من تەنیا ڕواڵەتی ئەم شۆڕشەم بینیبێ و نەچووبێتمە ناو ناوەڕۆکیەوە، بۆ پێشتر نەکەوتمە بیری ئەوە لەم بارەشەوە هێندێک پرسیار بکەم؟

لە سەعدوڵڵا دەپرسم، ڕاستی، ئەو کەسانەش کە ئێوە بە جاش ناویان دەبەن، ئەوانیش کوردن وا نییە؟

- بەڵێ. بەشێکیان کوردن، زۆربەیان خەڵکی شارەکانن بەڵام سێ عەشیرەتیش لە بادینان هەن - هەرکی، سوورچی و زێباری - هەر لە سەرەتاوە دژی شۆڕش بوون. ئەم عەشیرەتانە لە ناوچەکانی مووسڵ، دهۆک و ئامێدی دەژین. تا ساڵی ١٩٦٧ تێکڕای ئەمانە لەگەڵ حکوومەتدا بوون بەڵام دواتر وازیان هێنا و هاتنەوە پاڵ شۆڕش و بارزانییش قبووڵی کردن. ئێستە تەنیا ژمارێکی کەمیان لە خزمەتی ڕژێمدان و ئەوانەش قازانجیان لەوەدایە چەک و تفاق بە قاچاخ بۆ ئێمە دابین بکەن.

کاتێک لە ڕەزائیەوە دەگەڕێمەوە بۆ تاران بە فڕۆکەی زێدە مۆدێرنی ئێران ئێر- دەڕۆم و شەماڵیشم لەگەڵدا دێ تا ئەرکی نوێ، واتا وەک نوێنەری شۆڕش لەو شارە دەست پێ بکات. من دوودڵیی خۆم بۆ ئەویش ئاشکرا دەکەم و دەپرسم، کە ڕاستی، ئێوە تەنیا شوێنی دیلە عەرەبەکانتان پێشانی من دا، ئەی جاش، شوێنی ئەوان نالەبار و هەڵسوکەوتتان لەگەڵیاندا خراپترە؟

- بەڵێ، لەگەڵ ئەوان خراپ مامەڵە دەکەین لە بەراورد لەگەڵ عێراقییەکاندا، بەڵام نە یەکجار زۆریش. ئەمە زیاتر پێوەندیی بەوەوە هەیە، کە خەڵک رکی لەوان زیاترە، ئەوان وەک خۆفرۆش و خایەن چاو لێ دەکرێن.

لەبارەی کێشەی نێوان عەشیرەتەکانەوە، ئەگەر شەڕ بەکۆتا بێت، ئەم کێشانە سەر هەڵدەدەنەوە؟

- نا، ئێستە هەموو شتێک گۆڕاوە، ناکۆکییەک لە نێوان هۆزەکاندا نەماوە، شۆڕش بووەتە هۆی یەکگرتنی کورد. بۆ نموونە پێشمەرگە، هەر کەسە و لە گۆشەیەکی ئەم وڵاتەوە هاتووە، سەر بە عەشیرەتی جیاواز و بە زاراوەی جیاواز قسە دەکەن. نا ئەمە کێشەیەکی وا نییە ئێمە ئەگەر لەم شەڕە سەرکەوین، لە ئاشتیشدا سەردەکەوین و من لەم بارەیەوە دڵنیات دەکەمەوە.

دیارە من لەم سەفەرەدا شتێکم لەدەست دا ئەویش بینینی ئەو کوردە بەکرێگیراوانەیە، کە دیلی لای شۆڕشن. دەبووا بە چاوی خۆم ببینم چۆن هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا دەکرێ. گومانێکم لە راستبێژیی شەماڵ نییە بەڵام دڵنیا نیم ئەو لەم بارەیەوە هەموو شتێک دەزانێ و تازە درەنگیشە بۆ گەڕانەوە و زانینی ئەم راستییە.

لەگەڵ شەماڵ لە فرۆکەخانەوە بە تاکسییەک خۆمان دەگەیەنینە تاران و نێزیک بە ساتێک لە دوای شوێنی حەوانەوەیەک دەگەڕێین و سەرەنجام دیوێکی دوو کەسیمان لە هۆتێل "میامی"دا دەست دەکەوێ. من تەلەفۆن بۆ باڵوێزگەی سوێد لە تاران دەکەم و دەپرسم داخوا ئەوان ڕاپۆرتێکیان لە کوردستانی عێراقەوە دەوێ؟ ئاخر دەزانم ئەو ناوچەیە شوێنێکی دوورەدەستە و باڵوێزی سوێد لە ئێران یان عێراق بە هاسانی ناتوانن دەستیان پێ رابگات و ئاگەداری لەبارەوە پەیدا بکەن.

باڵوێز زۆری پێ خۆشە گوێ لە من بگرێ و بزانێ چیم بۆ باسکردن هەیە،

بۆیە من ڕێ دەکەوم بۆ ئەوێ تا لە نێزیکەوە بۆی باس کەم. باس و خواسی ئێمە نێزیک بە سەعاتێک دەگرێ و لەم ماوەیەدا من بۆم دەردەکەوێ باڵوێز هەم بە وردی شارەزای دۆخی کوردە و هەمیش لە دڵەوە چاکەی ئەوانی دەوێ، بەڵام ئەو دەبێت ئەم شتە تەنیا وەک ڕوانگە و بۆچوونی خۆی ڕاگرێ و تێکەڵی کار و ئەرکی دیپلۆماتیکی نەکات.

بەڵام سوێد دەتوانێ چە شتێک لەم بارەیەوە بکات؟

– هیچ. هێندێک هاریکاریی مرۆیی، لەوە زیاتر نا.

ئەگەر وایە سوێد ناتوانێ ئەم کێشەیە لە یو ئێن بێنێتە گۆڕێ؟

نا، ئەمە بە تەواوی نامومکینە، کاری وا مانای بڕینی پێوەندی لەگەڵ عێراقە و ئێمە توانی شتی وامان نییە. هیچ هیوایەک بۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشەیە نابینرێ، مرۆڤ دەتوانێ سۆز و هاودەردی بۆ کورد نیشان بدات و ئەمەش هاسانە بەڵام پیاو دەبێت بزانێ کە هیوایەک بۆ خەباتی ئەوان نییە. کوردستانێکی خۆبەڕێوەبەر لە عێراق لەباری سیاسییەوە نەگونج و نەشیاوە.

من دەگەڕێمەوە بۆ شوێنی خۆم و باسی دیدارەکەی خۆم و باڵوێز بۆ شەماڵ دەگێڕمەوە. پێی دەڵێم، کە هەموو هەر واتان پێ دەڵێن:

"خەباتەکەتان ڕەوا و داخوازییەکانتان دادپەروەرانەن، بەڵام بەداخەوە ئێمە ناتوانین یارمەتییەک لەم بارەوە بکەین". ڕۆژێک دێت کورد لەسەر گۆی زەوی بسڕێنەوە و ئاسەوارێکیان نەمێنێ، هەر دەوڵەتیش لەبەر خۆیەوە ئەمەی پێ خراپ بێت بەڵام کەسێک نایەت پێشی ئەم کارە بگرێ.

شەماڵ بێدەنگە، کاردانەوەیەکی لێ نابینم. ناچار من تووڕە دەبم و دەڵێم:

ئاخر خۆ ئێوە ناتوانن تا هەتایە درێژە بەم شەڕە بدەن و بە گژ هەموو سوپای عێراق، سۆڤیەت، ڕەنگە تورکیا، سووریا و ئێرانیشدا بچنەوە. دەبێت پلان و بەرنامەیەکتان بۆ خەباتەکەتان هەبێت.

شەماڵ لەسەرەخۆ دەڵێ:

- کێوەکان.

من دەزانم کێوەکان هەن بەڵام لە پای ئەم کێوانەدا لە برسا دەمرن.

- ئێمە پلانێکمان هەیە، دامەزراندنی دەوڵەتێکی نوێ بۆ عێراق، نە دەوڵەتی کوردستان، دەوڵەتی عێراق. ئۆپۆزسیۆنی عێراقی هەن بە نهێنی لە لایەن میسر و سووریاوە پشتگیرییان لێ دەکرێ ئێمە ئەم ڕێگەیە وەک ڕێگەی دەربازبوون دەبینین. ئەگەر لەم بارەیەوە سەرکەوتوو بین و ئەم بەرەیە پێک بێت هەم کورد و هەم عەرەبیش پشتیوانیی ئەم کارە دەکەن.

لە ڕۆژنامەی ئینگلیزی زمانی "تێهران جورناڵ"دا وتارێکی سەرنج ڕاکێش دەبینم باسی فڕۆکەیەکی "ساس" دەکات ناچار کراوە لە بەغدا بنیشێتەوە.

لە درێژەی وتارەکەدا هاتووە:

"فڕۆکەیەکی کۆمپانیای سکاندیناڤیا ئایرلاینز کە لە یۆنانەوە بە نیازی تاران بەڕێوە بووە لە ئاسمانی عێراق ناچار کراوە بنیشێتەوە و چەندین سات ڕاگیراوە. گوایا ئەم فڕۆکەیە "بێ مۆڵەت چووەتە سەر ئاسمانی عێراق". وتەبێژی کۆمپانیای ناوبراو ئەم ڕووداوە پشتڕاست دەکاتەوە بەڵام دەڵێ ئەوان مۆڵەتی فڕینیان بۆ ئەم کارە هەبووە و لەم بارەیەوە نەیویست زیاتر بدوێ... دوکتۆر ئاغاخان سەعید یەکێک لە ڕێبوارانی فڕۆکەکە وتی کە سات لای نۆ فڕۆکەوان ئاگەداری کردین ئێمە لە ئاسمانی بەغداین و هیچی تر. دوای نیشتنەوە سەربازانی عێراق دەوری فڕۆکەکەیان دا، هێندێک قسەیان لەگەڵ فڕۆکەوانەکەدا کرد و دوایە بە وردی بەناو فڕۆکەکەدا گەڕان. دوایە ئەفسەرێکی عێراقی هات و داوای لێبووردنی لە ڕێبوارەکان کرد و گوتی فڕۆکەوانەکە بە هەڵە هاتبووە سەر ئاسمانی عێراق.

حەفتەیەک دووجار فڕۆکەیەک لە تارانەوە دەڕوات بۆ کۆپێنهاگن و ئەمەش کورتترین ڕێگەیە بۆ گەڕانەوەی من. بۆیە بلیتێکم کڕی تا لەم ڕێگەیەوە

بگەڕێمـەوە. بە پێی پلان دەبووا ئەم فـڕۆکـەیە بەسـەر تورکیـادا بڕوات بۆ ئەسینا، بەڵام دوای ئەوە ئێمە دەوروبەری ساتێک فڕین، فڕۆکەوان ئاگەداری کـردین، کـە ئێـمـە لـەسـەر شـاری بەغـداین. من بە پەلە چوومـە پێش و لە کەسایەتیی فڕۆکەکەم پرسی ئێوە بوون جارێکی تر ناچار کران بێنە خوار؟ تێکرا بە سەرسووڕمـانەوە دەپرسن تۆ چۆن ئەمەت زانیوە؟ لە درێژەدا دەڵێن ئێمە مۆڵەتی فڕینمان هەیە و جاری پێشووش هەمانبوو. راستی بەم شێوەیە هێنانە خـواری فڕۆکـەیەکی سیڤیل جگە لە چەتەکاری هیـچی تر نییـە. بەڵام ئەوان بە دوای یەکێک لە رێبەرانی کوردەوە بوون بۆیە دوای نیـشـتنەوەمـان هاتنە ناو فڕۆکەکە و چاویان لە پاسپۆرتی هەمووان کرد.

دیارە تاقە دێڕێکیش لەم بارەیەوە لە رۆژنامەکانی سوێددا نەنووسراوە.

من لە بـەرزاییـیـەوە رووناکـیی چراکـانی بەغـدا دەبینم و روو بـە دەریای ناوەڕاست درێژە بە فڕین دەدەین.

زسـتـان دەسـتـی پێ کـردووە، دوێنێ سـەرەتای باوبۆران دەسـتی پێ کـرد و ئەمـڕۆ یەکـەم بەفـری سـاڵ باری. بەر لـە سێ حـەفـتـە دوایین هـەواڵم لە کوردسـتـانەوە پێ گـەیشت و لەبەر خـۆمـەوە دەڵێم بڵـێی مـسـتـەفـا بارزانی سـەرکـە پیـوازی ئـەو گـولانـەی، کـە من بـە دیاری بۆیم بردبوو کـردبێـتـە ژێر خاکەوە؟

## دوا وته

شەڕەکە سەرانسەری زستان درێژەی دەبێت. لە نامەیەکدا کە ڕۆژی ١٧ی تشرینی دووەم نووسراوە، سەعدوڵڵا بۆم باس دەکات:

"لە پەلامارێکی شەوانەدا هێزەکانی پێشمەرگە، کێوی (سەرتیز) کە لە سەرووی گەرووی عومەر ئاغاوەیە لە دوژمن سەندەوە. لەم شەڕە سێ هێزی گەورەی ڕژێم بە دەستی پێشمەرگە تەفروتوونا کران. لەم ڕۆژانەدا هێرشی پێشمەرگە بە نیازی پاشەکشە بە دوژمن بۆ پێدەشتەکان دەستی پێ کردووە، من لەو باوەڕەدا نیم عێراقییەکان بتوانن لەم زستانە سەختە لە بەرانبەر پەلاماری ئێمەدا خۆیان ڕاگرن. لەوانەیە پێش ئەوە درەنگ بێت پاشەکشە بکەن و بڕۆنە خوار چونکە هێزی تۆپخانەی ئێمە ئێستە بە توانترە و ڕۆژانە زیانی کاری بەوان دەگەیێنێ. "

تۆزێک پێش لە کریسمەس نامەیەکی ترم پێ دەگا و تێیدا هاتووە:

"من نازانم تۆ منت لە بیر مابێ یان نا، بەڵام پێم وایە لە بیرت ماوە چونکە من یەکێک لە دۆستەکانی تۆم. ئێمە لە کوردستانی عێراق یەکمان بینی، لە بەرەی گەرووی عومەر ئاغا. ئەگەر گرووپی دژە تانکی پێشمەرگەکانت لە بیر مابێت دەبێت ناوی فازڵ جەلال، ئەو قوتابییەی لە بەغداوە هاتبوو و بەرپرسی ئەو تیمە بوو لە بیر بێت. من ئەو کەسم.

تۆ بەڵێنت دا کە گەڕایەوە لەسەر ئێمە، من و هەڤاڵەکانم بنووسی. نازانم گەرەکتە چۆن ئەم داستانە بنووسی بەڵام من دەتوانم لەم بارەیەوە یارمەتیت بدەم.

من ئێستە لە یەکێک لە نەخۆشخانەکانی کوردستانم. لە بیرمە کاتێک تۆ خەریکی ڕۆیشتن بووی ئێمە چاوەڕوانی هێرشی چوارەمی هێزەکانی عێراق بووین. دوای چەندین هێرشی تر کرانە سەرمان و من لە سێزدەمین هێرش، کە دژوارترینیان بوو بریندار بووم و ئێستە لێرەم. ڕێککەوتی ئەم هێرشە و برینداربوونی منیش ڕۆژی ٢٦ی تشرینی دووەم ١٩٧٤ بوو . شانی ڕاستەم بەرکەوت و بە دژواری بریندار بوو. ئێستە باڵی ڕاستم لە کار کەوتووە و دوکتۆر دەڵێن هیچ کات چاک نابێتەوە. من زۆر ناڕەحەتم چونکە ئیدی ناتوانم بگەڕێمەوە بەرەی شەڕ. "

هەروەها من نامەیەکم لە سەعید دزەییەوە پێ دەگات تێیدا دەنووسێ:

"پێم وایە من بۆ تۆم باس کرد کە ڕەنگە کورد بتوانن لەسەر سنووری ناوچەی کوردستان بسازێن بۆ ئەوەی ئاشتی بێتە دی، بەڵام ئەم شتە ئیدی بەو شێوەیە نییە. جەنەراڵ بارزانی وتوویە ئێمە هەرچییەک باجی زۆرتر بدەین ئەوان زیاتر داوا دەکەن و کورد هەموو ڕۆژێک خەریکن باج بەم ڕێژیمە دەدەن.

ئێستە عێراق مێگی ٢٣یشی لە سۆڤیەتەوە پێ گەیشتووە و ڕۆژانە دۆڵی چۆمانی پێ بۆمباران دەکا. لە تاکە پەلامارێکدا پێنج ژن و منداڵ، کە بۆ خۆشاردنەوە پەنایان بردبووە ژێر پردێک لە نزیک قەسرولسەلام – ئەو شوێنەی تۆی تێدا دەژیای – کوژران، هەمان ڕۆژ ١٥ کەس لە گەڵاڵە کوژران. فڕۆکەکان هەموو ڕۆژ، لە سات نۆی بەیانییەوە تا پێنجی ئێوارە بێ پسانەوە بۆمبارانیان کرد. من هەر جۆرێک بێ توانیومە سەری خۆم دەرکەم و جگە لە برینێکی سووک چی ترم بەسەر نەهاتووە بەڵام لەو بڕوایەدا نیم لەناو ئەم ئاگری بۆمبانەدا شانسێکی زۆرم بۆ ژیان و مانەوە هەبێت.

لە ناوەڕاستی کانوونی یەکەمدا ڕۆژنامەکانی سوێد باسیان کردبوو، کە ڕێژیمی بەغدا ئێران تۆمەتبار دەکات، کە فڕۆکەیەکی عێراقیی بەرداوەتەوە.

من لەبەر خۆمەوە دەڵێم سەرەنجام ئێران گەیشتووەتە گیانی و بێزار بووە لەوەی فڕۆکەی عێراق هەر ڕۆژە ئاسمانەکەی دەبەزێنن و بە مووشەکێک ئەم فڕۆکەیەی داخستووەتە خوار. یان نا، کورد خۆیان توانیویانە بە چەکی دژە هەوایی ئەم کارە بکەن. ڕۆژنامەکان لەم بارەیەوە هیچی تریان نەنووسیوە بەڵام سەعدوڵڵا بۆی نووسیوم کە چۆن بوو:

ڕۆژی ١١ی کانوونی یەکەم ڕۆژێکی مێژوویی بوو، سات پێنجی پاش نیوەڕۆ خەڵک دوای یەک مانگ بۆمبارانی بێ پسانەوە هەناسەیەکی رەحەتییان هەڵکێشا. فڕۆکەیەکی تۆپۆلۆفی ١٦ی عێراق بە شەش سوارەوە بەربووەوە و لە کێوێکی ژوورەوەی چۆماندا وە زەوی کەوت. چە دیمەنێکی خۆش و سەرنج ڕاکێش بوو. هەژدیهایەکی زەبەلاح و زەلام کە سیمبولی دڕندەیی و سەرکوتە بە پێش چاومانەوە کەوتە خوار و وردوخاش بوو، لە کاتێکدا سەدان کورد خەریکی شادی و چەپڵەڕێزان بوون. دوای ئەمە ئیدی هیچ فڕۆکەیەکی تۆپۆلۆف ئاسمانی چۆمانی ڕەش نەکردووە.

ڕۆژی دوایی فڕۆکەیەکی سوخۆی ٧ لە کێوی هەندرێن، کە لەژێر کۆنترۆڵی پێشمەرگەدایە کەوتە خوار و فڕۆکەوانەکەی توانی خۆی دەربازی بەرەی عێراق بکات. دوای ئەم ڕووداوە عێراق سەرجەمی هێرشەکانی وەستاندووە و تەنانەت خەریکە تۆپخانە گرانەکانیش دەبەنە دواوە. "

لایەنی کوردی بێلانیی شەڕی نێوان ١١ ئادار تا ١٥ی کانوونی یەکەمی ١٩٧٤ بەم شێوەیە باس دەکات:

زیانی هێزەکانی دەوڵەت:

- ٨٧١٧ کەس کوژراو (لەوانە ١٦٢٨ کەسیان لە لایەن پێشمەرگەوە نێژراون).
- بریندار ١٥٩٧٣ کەس .
- ٢٦٤ دیل.

- فڕۆکەی بەردرایەوە ٤٦ دانە
- ژمارەی هێرشی هەوایی دوژمن ٣٩٧٨.
- گوندی بۆمبارانکراو ٥٦٩ گوند.

زیانی لایەنی کوردی:
- ٨٧٦ پێشمەرگەی کوژراو.
- ٢٢٣٨ پێشمەرگەی بریندار.

زیانی خەڵکی سیڤیل:
- ١٧٥٤ کوژراو و بریندار.

لە ناوەڕاستی کانوونی دووەمدا ڕاپۆرتێکی ترم لە سەعیدەوە پێ دەگات:

"زستان بۆ ئاوارەکان مانای رەنج و ئازارێکی فرەوانە، زۆرێک لە بنەماڵە کوردەکانی بادینان سەرەڕای دژواری خۆڕاگرییان لە بەرانبەر دوژمندا کرد بەڵام سەرەنجام زۆری بەفر و سەرما چۆکی پێ دادان و ناچار بوون روو بکەنە سنووری ئێران. بینینی ئەو دیمەنانە گەلێک دڵتەزێنە، بەر لە مانگێک مرۆڤ دەیتوانی ببینێ منداڵ بەو سەرمایە لە نێزیک حاجی ئۆمەران بە دەوری ئاگرێکەوە شەو و رۆژ هەڵدەلەرزین و چاوەڕوان بوون تا ڕێگەیان بدرێ بڕۆن بۆ کامپەکان لە ئێران. لەو کەمپانەش وەک پێویست چادر دەست ناکەوێ و ئەگەریش هەبێ هێندە تەڕ و قوڕاوین ژیان لەناویاندا مەحاڵە. بەو حاڵەش هێشتا گەلێک خەڵکی ئاوارە هەن، کە هێشتا هیچ جێگەیەکیان نییە تێدا بژین و هێندێکیان لەناو ئەشکەوتاندا دەژین، کە بێ گومان ناتوانن زستان ببەنە سەر.

بۆ پێشمەرگەش دۆخەکە هەر وایە، بەشی هەرە زۆریان تەنیا پەتوویەکیان هەیە خۆیانی پێ لەم سەرما و زوقمە بپارێزن بەڵام خۆڕاگری و بەرخۆدانیان هەروا بەردەوامە. ڕێژیم زیانێکی زۆری بەرکەوتووە بەڵام

هێشتا له بەرەی رواندزدا پاشەکشەی نەکردووە.

گوتوبێژ لەگەڵ بەکر و سەدامدا تەواو بوون، ئەمانە دەبێت جارێک بۆ هەمیشە تێک بشکێن، بڕوا و متمانەی ئێمە زۆر بەرزە، دەزانین بێگومان هەر سەردەکەوین و ئەوەی ماوە تەنیا پەیوەندیی بە کاتەوە هەیە دەنا سەرکەوتن هی ئێمەیە."

سوپای عێراق کەم کەم دەستی بە کشانەوە کرد بەڵام هاوکاتیش خۆی بۆ هێرشی بەهاری ئامادە دەکرد. هەرکە هەوا باشتر بوو بۆمباران زیاتر بوونەوە و فڕۆکە سۆڤیەتییەکان جارێکی تر روویان لە ئاسمانی کوردستان کردەوە.

له بادینان برسییەتی زۆری بۆ خەڵک هێنا، سنووری تورکیا تەنانەت بۆ گەیاندنی یارمەتیی مرۆڤیش داخرابوو. تاقە رێگە بەرەو رۆژهەڵات - ئەو رێگەیەی بریفکانی و هەڤاڵانی بە هەزار زەحمەت سازیان کرد - لەبەر زۆریی بەفر داخرابوو، ئیمکانی هاتوچۆی نەمابوو. لەم دۆخەدا سوپای عێراق بۆمبارانی گوندەکانی بادینانیشی دەست پێ کردەوە.

رۆژی ٦ی ئادار سەرکۆماری جەزائیر رای گەیاند، کە لە میوانییەکی "چاخواردنەوە"دا توانیویە بواری رێککەوتنێک بۆ نەهێشتنی کێشەی سنوور لە نێوان ئێران و عێراقدا فەراهەم بکات و لە وێنەیەکدا دەبینرا شای ئێران و سەدام حوسێن یەکتریان لە ئامێز گرتووە.

رۆژی دوایی لە هەموو بەرەکانی شەڕدا هێرشی بەرینی سوپای عێراق دەستی پێ کرد. هەموو جۆرە هێزێک، تانک، فڕۆکە و تەنانەت لەشکری تازە دامەزراوی سوپای عێراق، کە بە "فەیلەقی حەوت" دەناسرا بەشداریی ئەم پەلامارەی کرد. بەو حاڵەش کورد ساز نەبوون رێگەی گوتوبێژ لەگەڵ دەوڵەتی عێراقدا بگرنە بەر بەڵام بۆشیان دژوار بوو لە بەرانبەر ئەم هێرشانەدا خۆیان ڕاگرن و گەرووی عومەر ئاغا کەوتە دەست دوژمن.

سەرەتا باسی ئەوە دەکرا ئێرانیش سنووری خۆی داخستووە، بە پێی هەواڵی ئاژانسەکان، تەقەمەنیی کورد رووی لە تەواوبوون کردووە و فڕۆکەکانی عێراق ئازاد و بێ ترس بەسەر هێز و ناوچەکانی ئەواندا دەسووڕێنەوە.

دوای چەند رۆژ شەڕی خوێناوی و گران، راپۆرت گەیشت کە کورد ناچاری تەقە وەستان بوون. چارەنووسی کورد لە پیلانێک لە تاراندا دیاری کرا.

تەواو ١٦ مارسی ١٩٧٥

لەم کتێبەدا:

من زۆرم پێ خۆشە چەند ڕۆژێکی لەگەڵدا بم بەڵام لام وایە کە داوایەکی لەو جۆرە زۆر ژیرانە نەبێت. ئێستە سات لە یەکی شەو تێ پەڕیوە و من کەمێک تێ گەیشتووم، ئەوە لە شەودایە ئەم شۆڕشەی کورد پلانی بۆ دادەنرێ و ڕێبەری دەکرێ. لەم کاتەدا بێدەنگی بەسەر گشت بەرەکانی شەڕدا زاڵە و چرای هەموو ماڵان و ئاگری گوندان کوژاوەتەوە و خەڵکی لە گەرمەی خەودان بەڵام ئەم پیرە جەنەراڵە هێشتا هۆشیارە و خەریکی ئەرکەکانیەتی.

– من زۆرم پێ خۆشە گوێم لێت بێت باسی ژیانی خۆتم بۆ بکەیت، بەڵام دەزانم ئێستە درەنگە و ئەم شتەش کاتی فرە دەگرێ. ڕەنگە من بتوانم جارێکی تر، دوای شەڕ تۆ ببینمەوە؟

– بەڵێ، تۆ هەر کات بخوازی بەخێر بێیت بۆ کوردستان.

لەبەر خۆمەوە دەڵێم بە ڕاستی گەورەپیاوانی دنیا لە بەرانبەر ئەم پیاوەدا چین؟ شای ئێران، کیسنجەر، پاڵمە، ویلسۆن لە بەراورد لەگەڵ مستەفا بارزانیدا چ شتێکن؟ ڕەنگە ئەو دوایین ڕێبەری خەڵک و هەروەها تاکە ڕێبەری لەو جۆرە بێت.

تورد ڤالستروٚم